خالد مەحمود کەریم

# دەوڵەتی عوسمانی
# و
# عەشیرەتە کوردەکان لە کوردستانی باشوور
# ١٨٦٩- ١٩١٤

ئەکادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی کادیران
سلێمانی – ٢٠١٢

.

**ئەكادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی كادیران**

دامەزراوەیەكی كەلتورییە، بەپێی بڕیاری كۆنگرەی سێی ساڵی ٢٠١٠ ی یەكێتیی نیشتمانیی كوردستان دامەزراوە، ئەركەكەی بریتییە لە دەستەبەركردنی پێداویستییەكانی هۆشیاركردنەوەی سیاسی، فراوان كردنی چوارچێوەكانی رۆشنبیریی گشتی، تۆكمەكردنی بەهاكانی دیموكراسیو مافی مرۆڤ و دادی كۆمەڵایەتی لەكۆمەڵدا، تاوتوێ كردنی مەسەلەكانی بیری هاوچەرخو دابین كردنی كەرەستەی پێویست بۆ پێگەیاندنی كادیران لە بوارە هەمەجۆرەكاندا.


**دەوڵەتی عوسمانیو عەشیرەتە كوردەكان لە كوردستانی باشوور (١٨٦٩-١٩١٤)**

**ئامادەكردنی: خالد مەحمود كەریم**

**ژمارەی سپاردنی بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان (١٤٧٦ ) ساڵی ٢٠١٢**

**تایپ: خالد مەحمود كەریم**

**دیزاینو بەرگ: ئاراز نوری**

**تیراژ: (٢٠٠٠) دانە**

**ژ. زنجیرە: (٤٦٠)**

**بڵاوكراوەكانی ئەكادیمیای هۆشیاری و پێگەیاندنی كادیران**

**سلێمانی ـ ٢٠١٢**

**سەرپەرشتیاری زنجیرەی كتێب**

**عوسمان حەمەڕەشید گورون**

www.pukhoshiari.com
info@pukhoshiari.com

## تێبینی

ئـەم کتێبـە، لـە بنـچینەدا ماسـتەرنامەیەو لـەژێر ناونیـشانی (سیاسـەتی دەوڵـەتی عوسمـانی بەرامبـەر عەشیرەتە کوردەکـان لـە باشـووری کوردسـتان ١٨٦٩-١٩١٤)، بەسەرپەرشـتی بـەڕێز (پ. د. خـەلیل عـەلی مـوراد) ئـەنجام دراوە، وەك بەشـێك لـە پێداویـستیەکانی بەدەسـتهێنانی پلـەی (ماسـتەر) لـە مێژووی نویێ، لە ساڵی ٢٠١٠دا، پێشکەشی بەشی مێژوو- کۆلێژی زانـستە مرۆڤایەتیەکان- لە زانکۆی سلێمانی کراوە.

بە

- خێزانی ئازیزم

-کاردۆ و دیاکۆ

-هاوڕێ دڵسۆزو خۆشەویستەکانم...

پێشکەشە

# پێڕست

## پێشەکی

توێژینەوە لە لایەنە جیاوازەکانی مێژووی کورد بە گشتی لە ڕۆژگارو سەردەمی عوسمانیدا لە سەرەتاکانی سەدەی شانزەهەمەوە، کە قۆناغی دەرکەوتنیانە لەم ناوچانە، تا داڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی، جێی بایەخ و گرنگیپێدانی لێکۆڵەرانی مێژووی کوردستانە، هۆکاری ئەمەش گرنگی ڕووداوەکانی ئەو قۆناغەو پەرەگرتنەکانێتی لە ڕووی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕووەکانی ترەوە، هەروەها شوێنەوارو ئاکامە بەجێماوەکانێتی لەسەر کوردستان، کە زۆرێك لە ڕواڵەتەکانی لە ئەمڕۆدا دیارەو هەڵبەتە ڕەگ و ڕیشەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕۆژگارو سەردەمە، کە لە ئێستادا تێگەیشتنیان پێویستیی بە بایەخ و توێژینەوەی زیاترە لە لایەن لێکۆڵەرانەوە، ئەگەرچی لەم ساڵانەی دواییدا لەم ڕووەوە گەلێك هەنگاوی باش نراون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەراورد بە بایەخ و قووڵیی مێژووی کورد، هێشتا زۆر کەم کراوە.

پرسی عەشیرەتەکان و چۆنێتی مامەڵەکردن لە گەڵیانداو ملپێکەچکردنیان بۆ دەسەڵاتی ناوەندی، یەکێك بوو لەو کێشە سەرەکییانەی لە ناوەڕاستی سەدەی شانزەهەمی زایینییەوە تا کۆتایی حوکمڕانی عوسمانی لە ناوچەکە لە ساڵی ١٩١٨، ڕووبەڕووی کارگێڕی عوسمانی بووەوە. لەگەڵ ئەوەی زۆرێك لە مێژوونووسان و توێژەران بایەخیان بە توێژینەوەی ئەم بابەتە داوە، بەڵام زیاتر گرنگییان بە عەشیرەتە عەرەبییەکانی عێراق و پەیوەندییان لەگەڵ دەسەڵاتدارانی عوسمانیدا داوە، هەڵبژاردنمان بۆ ئەم بابەتە لەم سۆنگەیەوە سەرچاوە دەگرێ، بۆ ڕووناکی خستنە سەر سروشتی پەیوەندییەکانی دەوڵەتی عوسمانی و هەڵوێست و سیاسەتیان بەرامبەر عەشیرەتە کوردەکان لە باشووری کوردستان لە نێوان

سالآنی ١٨٦٩-١٩١٤، واتا له دامەزراندنی مەدحەت پاشاوه وەك والییەك له سەر ویلایەتی بەغداد له ساڵی ١٨٦٩ تا هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی یەکەم له ساڵی ١٩١٤.

تۆژینەوەکە بەسەر چوار بەشدا دابەشکراوه، بەشی یەکەم بەشێکی دەستپێکەو دابەشکراوەته سەر دوو باس، باسی یەکەم تەرخانکراوه بۆ قسەکردن لەسەر سنووری جوگرافی باشووری کوردستان و ئەو چوارچێوه جوگرافییەی دەیگرێتەوەو دەستنیشانکردنی سنوورەکەی وەك له سەرچاوه جۆراوجۆرەکاندا هاتووه، باسی دووەمیش بۆ قسەکردنه سەبارەت بە کارگێڕی عوسمانی له ناوچەکه بەگشتی، هەر له سەرەتای دەرکەوتنیانەوه تا ڕوخانی دەوڵەتەکەیان له ساڵی ١٩١٨.

بەشی دووەمی تۆژینەوەکە، بریتییە له دوو باس، باسی یەکەم تایبەتکراوه بۆ قسەکردن لەسەر ڕێکخراوەی عەشیرەتی کوردی و زاراوەو تایبەتمەندییەکانی، تیایدا جەختمان لەوه کردۆتەوه کە ئەگەرچی ئەم ڕێکخراوه کۆمەڵایەتییه له بناغەدا له تەواوی کوردستاندا هاوشێوەن، بەڵام ئەو زاراوانەی دابەشبوونی عەشیرەتی نیشاندەدەن، چوون یەك نین، لەم چوارچێوەشدا وێڕای پیشاندانی چەند نموونەیەك، ڕاوبۆچوونی ئەو ئەنترۆپۆلۆژیستانەمان خستۆتەڕوو، کە لەم ڕووەوه ڕاوبۆچوونیان هەیە. له کۆتایشدا هێمامان بۆ هەندێ له تایبەتمەندییەکانی عەشیرەتی کوردی و پرسی سەرۆکایەتیکردن و فۆرمه جیاوازەکانی کردووه.

باسی دووەمی تۆژینەوەکە تایبەتکراوه بۆ دەرخستنی نەخشەی عەشیرەت له باشووری کوردستاندا، لەم چوارچێوەدا تەنها جەخت لەو عەشیرەتانه کراونەتەوه، کە له بازنەی ڕووداوەکاندا لەگەڵ دەوڵەتی

عوسمانی، یا سیاسەتی دەوڵەتی نێوبراو لە بەرامبەریاندا، ئامادەگیی و ڕۆڵی بەرچاوو دیاریان هەیە (هەڵبەتە لەو قۆناغە مێژووییەی کە بۆ توێژینەوەکە دیاریکراوە). هەرچی عەشیرەتەکانی ترە، هەندێکیان ئاماژەمان بۆ باڕستو شوێنی جوگرافییان کردووە، ئەوانی تریش تەنها بۆ ناوەکانیان .

بەشی سێیەمی توێژینەوەکەش بریتییە لە سێ باس، باسی یەکەم تەرخانە بۆ قسەکردن لەسەر سیاسەتو هەڵوێستی دەوڵەتی عوسمانی بەرامبەر عەشیرەتەکان لە ماوەی ساڵانی ١٨٦٩-١٨٨٠ دا، تیایدا قسەمان لەو سیاسەتە نوێیە کردووە کە (مەدحەت پاشا)ی والی بەغداد لە ئاست عەشیرەتەکاندا لە ناوچەکە پەیڕەوی کردووە. دواتر قسەمان لە بەشدارییپێکردنی عەشیرەتە کوردەکان لە جەنگی رووسی-عوسمانی ساڵانی ١٨٧٧-١٨٧٨ز کردووە، لە کۆتایشدا ئاستی بەشداریکردنی عەشیرەتو ناوچەکانی باشووری کوردستان لە شۆڕشەکەی شێخ عوبێدوڵلا ئاماژە پێکردووە کە وەك پەرچەکردارێك دژ بە سیاسەتی ستەمکارانەی عوسمانی لە دوای جەنگی نێوبراو بەرپاکرا.

باسی دووەمیش تایبەتکراوە بۆ قسەکردن لەسەر سیاسەتی پان-ئیسلامیزمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمو ڕەنگدانەوەی ئەم سیاسەتە لەسەر عەشیرەتەکانی کورد لە باشووری کوردستان، لەم باسەدا وێڕای روونکرنەوەی چەمکی پان-ئیسلامیزم، ئاماژەمان کردووە بۆ هۆکاری پەیڕەوکردنی ئەم سیاسەتەو کاریگەریی لەسەر عەشیرەتەکانی ناوچەکە لە چەند روویەکەوە خراوەتەڕوو لەوانە:

١- بنەماڵــەی شــێخانی تەریقــەت: لــەم باســەدا ئاســتو شــێوازی خۆنزیکردنـەوەی سـوڵتان عەبدولحەمیـد لـە شـێخانی تەریقـەت بەگـشتیو بنەماڵەی شێخانی بەرزنجە بەتایبەت خراوەتەڕوو.

٢- ســوارەی نــانیزامی حەمیــدیو عەشــیرەتەکان: لــەم باســەدا دوای هێمـاکردن بـۆ ئامـانج لـە دامەزرانـدنی سـوارەکانی حەمیـدی، باڕسـتی بەشــداربوون یــا پــشتلێکردنی عەشــیرەتەکانی ناوچــەکە لــەم پێکهاتەیــە خراوەتەڕوو.

٣- سیاسـەتی عوسمـانی بەرامبـەر کۆمەڵـە عەشیرەتەکانی ئێزیـدی: لـەم باســەدا سیاســەتی پــڕ لــە ســتەمی عوسمانییــەکان بەرامبــەر بــە کۆمەڵــە عەشیرەتەکانی ئێزیدیو ناچارکردنیان بۆ دەستهەڵگرتن لە ئایینی خۆیـانو بوون بە موسڵمانو ئەنجامدانی ڕاژەی سەربازی دەرخستووە.

هەرچــی باســی ســێیەمە، تایبــەتکراوە بــۆ قــسەکردن لــە سیاســەتی عوسمانییـەکان لـە ئاسـت ناکۆکییـە عەشیرەتیەکاندا، لـەم باسـەدا لـە میـانی پیشاندانی چەند وێنەیەکی ناکۆکی عەشیرەتیەوە لە ناوچەکە، هەڵوێستو سیاسەتی عوسمانییەکان لە بەرامبەریاندا پیشانداوە.

بەشـی چـوارەم کـە دوا بەشـی توێژینەوەکەیـە، لـە سـێ بـاس پێکهـاتووە، باسی یەکەم تایبەتە بۆ کودەتای ساڵی ١٩٠٨ی کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقیو وەرچەرخانی سیاسەتی عوسمانی بەرامبەر بە عەشیرەتەکان، تیایـدا وێـڕای پێــشەکییەك ســەبارەت بــە ســەرهەڵدانی کۆمەڵەکــەو ئامــاژەکردن بــۆ بەشداریکردنی کەسایەتییە کوردەکان تیایـدا، ئاماژەمـان بۆ هەڵخلیـسکانی کۆمەڵەکە بۆ کۆمەڵەیەکی پان تورکیزمو دەسـەڵات گرتنەدەسـتیان کـردووەو

بەچەند وێنەیەك هەڵوێستو بۆچوونی بارگاویان بە (هێز) لە ئاست عەشیرەتەکان لە ناوچەکەدا پیشانداوە.

باسی دووەم تایبەتکراوە بۆ قسەکردن لەسەر رووداوەکەی ساڵی ١٩٠٩ شێخ سەعیدی بەرزنجە، هەڵبەتە لە ڕووی کاریگەرییەوە لەسەر پەیوەندی نێوان عوسمانییەکانو عەشیرەتە کوردەکانی ناوچەکەو تیایدا چۆنیەتی دوورخستنەوەی شێخ سەعیدو کوڕو خزمانی بۆ موسڵو کوشتنیان لە رووداوێکی گوماناویدا ئاماژەپێکردووە، هەروەها ئاماژەمان بۆ ئاکامەکانی ڕووداوەکە کردووە، کە خۆی لە هاتنە کایەی کەشێکی نائارامدا بینییەوە لەنێو عەشیرەتەکانی ناوچەکەدا، بەتایبەتیش لە نێو عەشیرەتی هەمەوەنددا، کە چەندین ساڵ بەردەوام بوو.

باسی سێیەم تەرخانکراوە بۆ بزاڤەکەی شێخ عەبدولسەلامی دووەمی بارزانیو هەڵوێستی ئیتحادییەکان، لەم باسەدا سەرەتا ئاماژەمان بۆ هەنگاوە چارەسەرسازییەکانی شێخی نێوبراو لە نێو عەشیرەتەکانی ناوچەکەدا کردووە، دواتر هەوڵمان داوە پلە بە پلە قوڵبوونەوەی کێشەکانی نێوان شێخی بارزانو دەسەڵاتدارانی عوسمانی بخەینەڕوو، تا دەرکەوتنی شێخ وەك داکۆکیکارێك لە مافە سیاسیو کولتوورییەکانی کورد لە ناوچەکەدا، پاش ئەوەی بە پاڵپشتی شێخ نور محەمەدو سەرۆك عەشیرەتەکانی ناوچەکە یاداشتنامەیەك بۆ دەسەڵاتدارانی عوسمانی بەرزدەکەنەوەو تیایدا داوای ڕیفۆرمکردن دەکەن، دوای ئەوەش ناکۆکی درێژخایەنی ئیتحادییەکانو پەلامارە یەك لە دوای یەکەکانیان بەهاوکاری عەشیرەتەکانی ناوچەکە بۆ سەر شێخی بارزانو لایەنگرانیو ئاوارەبوونو

دەستبەسەرکردنی و گێڕانەوەی بۆ موسڵ و لە سێدارەدانی، ناوەڕۆکی ئەم باسە پێکدێنێت.

بۆ نووسینی ئەم توێژینەوە پشت بە سەرچاوەی جۆراوجۆر بەستراوە، کە بە زمانەکانی (کوردی، عەرەبی، فارسی، تورکی، ئینگلیزی) نووسراون، بە ڕادەیەکی زۆریش هەوڵماندراوە سەرچاوە ڕەسەنەکان بکەینە سەرچاوەی باسەکان، ئەوانەی لەو رۆژگاری یا نزیک بەو ڕۆژگارە نووسراون کە چوارچێوەی ساتەکانی توێژینەوەکە پێکدێنن. لەم میانەدا بەڵگەنامە بلاوکراوەکانی عوسمانی، قاجاری، ئینگلیزی یا فەرەنسی سەرچاوەی زۆرێک لەو زانیاریانە پێکدێنن، کە لە شوێنی جیاجیای توێژینەوەکەدا دەبینرێن، بەڵگەنامەکان بەگشتی نوسراوی فەرمی کاربەدەستانی حکوومین و زانیاری وردیان لە بارەی ڕووداوو و عەشیرەتە جیاجیاکانی ناوچەکەوە تێدایە. لەوانە: کۆمەڵێك بەڵگەنامەی گرنگی ڕۆژگاری عوسمانییە کە (پ. د.خەلیل عەلی مراد) لە ژێر ناونیشانی (مختارات من کتاب الموصل و کرکوك فی الوثائق العثمانیة)دا وەریگێڕاوەو بلاوی کردۆتەوە. هەروەها ئەو بەڵگەنامانەی (مستەفا نەریمان) لە تورکییەوە کردوونی بە کوردی و لە گۆڤاری کارواندا بلاوکراونەتەوە. هەر لەم چوارچێوەدا سوودی زۆر لەو بەڵگەنامانە وەرگیراوە کە (د. عثمان علي) لە کتێبی (الکرد فی الوثائق البریطانیة)دا وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و بلاوی کردوونەتەوە، یا ئەوانەی (د. نەجاتی عەبدوڵلا) لە کتێبی (شۆڕشی شێخ عوبێدوڵلا لە بەڵگەنامەکانی فەرەنسیدا (١٨٧٩-١٨٨٢) دوای پێشەکی و پەراوێز بۆ نوسین وەریگێڕاون و بلاوی کردوونەتەوە. ئەمە بێجگە لە چەندین بەڵگەنامە کە (محەمەد حەمە باقی) لە زمانی (فارسی)یەوە

وەریگێـڕاون و لـە کتێبـی (شۆرشـی شـێخ عوبێـدوڵلای نـەهری١٨٨٠ لـە بەڵگەنامەکانی قاجاری دا) بڵاوی کردوونەتەوە.

نووسراوو ڕاپۆرتی فەرمی عوسمانی یا بریتانی سەرچاوەگەلێکی تری دەوڵەمەنـدن بـۆ نووسـین سـەبارەت بـە عەشـیرەتەکانی کـورد، توێـژەر بـۆ نووسـینی زۆر لـە بڕگـەکانی ئـەم توێژینـەوە پـشتی پێبەسـتوون، لەوانـە: سـاڵنامەکانی عوسمـانی، هـەروەها (تقریـر درویـش باشـا لتحدیـد الحـدود الایرانیة-العثمانیة سنة ١٨٥٣) کە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندەو لە بەندی دووی توێژینەوەکـەدا بـەپێی پێویـست گەڕاوینەتـەوە سـەری. هــەروەها نوسـەرو کتێبـی تـورکی: (Mehemed Hurşid Paşa, Seyãhatnãme-i Hudûd)

ئەم کتێبەی (محەمەد خورشید پاشا) لە ساڵی (١٩٩٧) کراوەتە تورکی نویّو لەگەڵ دەقە عوسمانلییە ئەسڵییەکەدا لە ئەستەنبوڵ بڵاوکراوەتەوە، نووسـەر بۆخـۆی یـاوەری (دەرویـش پاشـا)ی نێـوبراو بـووە، نووسـینەکەی سەرچاوەیەکی هـەرە ڕەسـەنە بـۆ زانیـاری لەسـەر زۆرێـك لـە عەشیرەتەکانی ناوچەکە. هـەروەها (تقریـر دائـرة الحـاکم المـدني البریطـاني في العـراق (سـنة ١٩١٩): ملاحظات عن عشائر کردستان الجنوبیة "بین الزاب الکبیر و دیـالی" سـاڵی (١٩١٩)، کـە (د. فوئـاد حەمـە خورشـید) وەریگێڕاوەتـە سـەر زمـانی عەرەبی، سەرچاوەیەکی هەرە دەوڵەمەندە بۆ زانیاری سەبارەت بە زۆرێك لە عەشیرەتەکان و لق و قەبارەو هێزیان لە ناوچەکەدا.

هـەروەها لـەم توێژینـەوەدا بەڕادەیـەکی زۆر سـوود لـە چـەند کتێبێکـی توێژینەوەیی بەڵگەنامەیی وەرگیراوە، کە بە زمانـەکانی عـەرەبی و ئینگلیـزی

نووسراون، لەوانە کتێبەکانی توێژەر (فاضل بيات) بە دياريکراوی هەردوو کتێبی (الدولة العثمانية فی المجال العربي) و(دراسات فی تاريخ العرب فی العهد العثماني)، کە لەبەر ڕۆشنايی بەڵگەنامەکانی عوسمانيدا نووسراون و زانيارييەکانی بۆ بەندی يەکەمی توێژينەوەکە بە تايبەت بۆ سەرەتاکانی دەرکەوتنی عوسمانی لە باشووری کوردستان و فۆرمی کارگێڕی پەيڕەوکراو بەرامبەر ميرايەتی و عەشيرەتەکانی کورد لە ناوچەکەدا دانسقەيە. هەروەها کتێبە بەڵگەنامەييەکەی (د.عماد عبدالسلام رؤوف) (دراسات وثائقية فی تاريخ الکرد الحديث وحضارتهم) سەرچاوەی زانيارييەکانی چەندين بڕگەی توێژينەوەکەن، بە هەمان شێوە کتێبی (دراسات فی الحرکة الکردية المعاصرة ١٨٣٣-١٩٤٦، دراسة تاريخية وثائقية)ی د. عثمان علی. هەروەها لە پرسی ناکۆکييە عەشيرەتيەکانداو لە چەندين شوێنی تری توێژينەوەکە سوودی زۆر لە نوسەرو کتێبی بەڵگەنامەيی:

Gökhan Çetinsaya, Ottoman Administration of Iraq1890-1908) وەرگيراوە.

نووسينی ئەفسەرانی سياسی بيانی و ڕۆژهەڵاتناسان و گەڕۆکەکان بەگشتی، کە زۆرينەيان بۆ مەبەستی سياسی يا مەبەستی تر هاتوونەتە ناوچەکەو زانياری ورديان لە بارەی کوردو عەشيرەتەکانی تۆمارکردووە، ئەمڕۆ ئەو زانيارييانە لەگەڵ تەواوی کەم و کوڕييەکانياندا بۆ ئێمە سەرچاوەگەلێکی دانسقەن، بە تايبەت بۆ نووسين لەبارەی عەشيرەتەکان، لەوانە بەتايبەت نووسەرو کتێبەکەی:

Claudius James Rich: Narrative of Residence in koordistan and on the site of Ancient Nineveh.

هـەروەها کتێبەکـەی مـارك سـایکس (العـشائر الكرديـة فـی الدولـة العثمانية)، و نووسینەکانی (مێجەر ئی. بی. سۆن) لەوانە کتێبەکانی (چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو)، (سلێمانی ناوچەیەك لـە کوردسـتان). هـەروەها کتێبـەکانی: ( کـرد وتـرك و عـرب)ی سی.جی.ئەدموندزو (فصول من تاريخ العراق القريب)ی مس بيلّ، (اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث)ی ستيڤن هيمسلی لۆنگریكو هـەروەها نووسینەکانی: بازيل نيكيتين لەوانە (الكرد دراسة سوسيولوجية تاريخية)و (بازيـل نيكيـتينو كوردناسـی)، ڤلاديمـير مینۆرسـکی لەوانـە (بنـچینەکانی کـوردو چـەند وتـارێکی کوردناسـی)و (الاكـراد ملاحظـات و انطباعـات)، دبليو.أی. ويگرام، ادگار.تی.ای.ويگرام (مهد البشرية او الحياة فی شرق كردستان)، ژاك ڕیتۆڕیْ (گەشتنامەی مسیۆنێرێك بۆ ناوچەکانی کەرکوكو سلێمانی١٨٧٨)و چەندین گەڕۆکی تر.

هـەروەها تویـژەر بـۆ نووسـینی تێزەکـەی پـشتی بـە کۆمـەڵێك زۆر کتێبـی عـەرەبی یـا وەرگێـڕدراو بـۆ عـەرەبیو کتێبـی کـوردی یـا وەرگێـڕدراو بـۆ کوردیو هـەروەها کتێبی فارسی بەستووە، کە بە زۆری سەرچاوەگەلێکی متمانـەپێکراو و پـڕ زانیـارین. لـە کتێبـە عەرەبییـەکان: کتێبـەکانی (عبـاس العزاوی) لەوانە (عشائر العراق الكردية)، چەند بەرگێکی ( تاريخ العراق بين احتلالين)، نووسینەکانی (شاكر خصباك) بەتایبەت کتێبی (الاكراد: دراسة جغرافيـة اثنوغرافيـة)، کتێبـی (الـضحايا الـثلاث)ی عبـدالمنعم الغلامـي، نووسـینەکانی صـديق الـدملوجي لەوانـە (امـارة بهـدينان الكرديـة او امـارة العماديـة)و کتێبـی (اليزيديـة) سەرچـاوەی بڕێکـی بـاش لـە زانیارییـەکان پێکـدێنن. لـە کتێبـە کوردییـەکانیش، کتێبـەکانی (محەمـەد ئـەمین زەکـی) لەوانـە (خولاصـەیەکی تـاریخی کـوردو کوردسـتانو (تـاریخی سـلێمانی وە

ولآتی)، میهرداد ئیزەدی (چەردە باسێك لە بارەی کوردانەوە. لە کتێبە فارسیەکانیشدا کتێبی (تأریخ مردوخ)ی محمد مردوخی کردستانی سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوبوو بەتایبەت بۆ خەملاندنی ژمارەو شوێنی جوگرافی هەندێ لە عەشیرەتەکانی ناوچەکە.

تێزو نامە زانکۆییەکان بەتایبەت ئەوانەی بلآوکراونەتەوە، سەرچاوەیەکی ترن کە توێژەر پشتی پێبەستوون، بەتایبەت ئەوانەی پەیوەندییان بەو قۆناغە مێژووییەوە هەیە، کە بۆ نامەکە دەستنیشانکراوە، لە تێزەکانی دکتۆرا کە بلآوکراونەتەوە: (بهدینان فی اواخر العهد العثماني)ی (کامران عبدالصمد احمد الدوسکي)، (کوردستان لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا)ی د. عەبدوڵلا عەلیاوەیی، (کوردستان و الجنوبیة فی القرنین السابع عشر و الثامن عشر)ی (د.سعدی عثمان حسین)، و (سۆفیزم و کاریگەریی لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورد ١٨٨٠-١٩٢٥)ی (د.جەعفەر عەلی رەسوڵ)، و (تاریخ العراق الحدیث)ی (عبدالعزیز سلیمان نوار)، (جولآنەوەی نەتەوەیی کورد بنەماو پەرەسەندنی)ی (وەدیع جوەیدە). لە ماستەرنامە بلآونەکراوەکانیش: جاسم محمد حسن، (العراق فی العهد الحمیدی ١٨٧٦-١٩٠٩)، محمد عبدالرحمن یونس العبیدي، (السلطان عبدالحمید الثاني الجامعة الاسلامیة ١٨٧٦-١٩٠٩) و نسیبە عبدالعزیز عبدالله الحاج علاوي (الادارة العثمانیة فی الموصل ١٨٧٩-١٩٠٨).

هاوکات لەگەڵ ئەو سەرچاوانەدا بواری لێکۆڵینەوەو وتار لایەنێکی تری گرنگی زانیارییەکانی ئەم توێژینەوەیە پێکدێنن، بەتایبەت ئەوانەی لە

گۆڤارەکاندا بڵاوبوونەتەوەو ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە ناوەڕۆکی باسەکەی ئێمەوە هەیە.

هەڵبەتە هەر بوارێکی نووسین و توێژینەوە بێ ئاستەنگ و گرفت نییە، ڕەنگە دیارترین ئەو گرفتانەی کە لەم توێژینەوەدا ڕووبەڕووی توێژەر بووبێتەوە، دەگمەنی ئەو سەرچاوەو ئەو بەڵگەنامانە بن کە تایبەتن بە پرسی عەشیرەتەکانی کورد لە ناوچەکە. بەتایبەتیش زانیارییەکان ئەوە ئاشکرادەکەن کە بەڵگەنامەگەلێکی زۆر سەبارەت بە عەشیرەتەکانی کورد بە گشتی لە ئەرشیفەکانی تورکیادا هەیەو هێشتا دەستی توێژەرانی کوردی پێڕاناگات. هەروەها یەکێکی تر لە گرفتەکان ئەوەیە ئێمە خاوەن بەڵگەنامەو ئەرشیفی نەتەوەیی تایبەت بەخۆمان نین، کە ئەوەش لە ڕوویەکەوە پەیوەندی بە هەژاری مێژوونووسیی خودی کورد خۆیەوە هەیە، بۆیە وەك هەر توێژەرێکی ئەم بوارە بۆ دەستنیشانکردنی سەرەداوی ڕووداوەکان ناچاربووم بگەڕێمەوە سەر سەرچاوە مێژووییەکانی گەلانی دراوسێ و بیانییەکان، کە ئەمە بۆ خۆی وەك نەجاتی عەبدوڵا ئاماژەی پێداوە، توێژەر ڕووبەڕووی گرفتێکی میتۆدۆلۆژی دەکاتەوە، ئەویش: ئایا "ئەوان" چۆن "ئەوی دی" کوردیان بینیوە؟ ئایا ئەم سەرچاوانە بەرەو میتۆدێکی "نازانستی"مان نابەن؟

ماوەتەوە سەر ئەوەی بڵێم ئەم هەوڵە وەك توێژینەوەی هەر توێژەرێکی سەرەتایی، لە کەم و کورتی و هەڵە بەدەرنییە، بەتایبەت کە یەکەم جارە باسێکی تایبەت بە عەشیرەتە کوردییەکان لە پەیوەندییاندا لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیی دەنووسرێت، بۆیە سوپاس و پێزانینم بۆ ماندوبونی بەڕێزان ئەندامانی لیژنەی گفتوگۆ لە خوێندنەوەی لێکۆڵینەوەکەدا، هەڵبەتە دڵنیام

تێبینیـە زانـستیە بەنرخـەکانیان لێکۆڵینەوەکـە لـە کـەمو کـورتیو هەڵـەکان پاکدەکاتەوەو دەوڵەمەندی دەکات.

## بەشی یەکەم:

## باشووری کوردستان، سنووری جوگرافیو کارگێڕی عوسمانی

### باسی یەکەم:

### سنووری جوگرافی باشووری کوردستان

### باسی دووەم:

### کارگێڕی عوسمانی لە باشووری کوردستاندا

## باسی یەکەم:
## سنووری جوگرافی باشووری کوردستان

بارودۆخی داگیرکاریو دابەشبوون، کە رۆژگارو سەردەمێکی درێژ کوردستانی پێدا تێپەڕیوە، زاراوەی کوردستانی بەگشتی کردۆتە زاراوەیەکی نامۆو نزیکە دەگمەن لە بەکارهێناندا، لە بەرامبەر ئەم دۆخەشدا، بەکارهێنانی بەشو هەرێمەکانی تری بەگوێرەی رۆژگارو قۆناغی جیاوازو لەسۆنگەو گۆشەنیگای جیاوازەوە[1] لای توێژەرانی کوردو نەتەوەکانی دیکە کورد کردۆتە شتێکی تاڕادەیەك باو.

بەکارهێنانی زاراوەی (باشووری کوردستان) لە سونگەیەکی سیاسی/زاراوەییەوە، نەك جوگرافی، سەرچاوەدەگرێ، ئەم زاراوە ئاماژەیە بۆ بارودۆخی دابەشکراوی کوردستانو دانپێدانانە بە بوونی پارچەی تری کوردستان، لە دەرەوەی ئەو سنوورەی کە بابەتی ئەم لێکۆڵینەوەیە، لە هەمان کاتدا ناوهێنانی ئەم پارچەیە بە باشوور، ئەوە نیشاندەدات کە ئەم پارچەیە بە بەراورد لەگەڵ پارچەکانی تری کوردستاندا، دیوی باشووری پارچەکانی تری کوردستانی گرتووە، نەك بۆخۆی تەواوی باشووری کوردستان بگرێتەوە[2]. لێرەوە مەبەستمان لە باشووری کوردستان ئەو بەشەی کوردستانی گەورەیە کە تا جەنگی جیهانی یەکەم لەژێردەستی

[1] بڕوانە: سعدي عثمان حسين: كردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر، اربيل، ٢٠٠٦، ص٣٧.

[2] خەبات عەبدوڵڵا: بنەما تیۆرییەکانی جوگرافیای عەسکەری کوردستانی باشوور، چ٢، سلیمانی، ٢٠٠٥، ل١٠١.

دەوڵەتی عوسمانیدا بوو، دواتریش وەك ئاکامەکانی جەنگ بە دەوڵەتی تازە دروستکراوی (عیراق)ەوە لکێنرا [1].

وەك ئاشکرایە لە ئێستادا ناوەڕۆکی ئەم زاراوەو مەبەستەکەی دیارە، ئەو ناوچە کوردییانە دەگرێتەوە کە کەوتونەتە باکوورو باکووری رۆژهەڵاتی عیراق‌و بە (باشووری کوردستان) ناودەبرێت، بۆ جیاکردنەوەی لە (باکووری کوردستان) لە رۆژهەڵات‌و باشووری رۆژهەڵاتی تورکیاو (ڕۆژهەڵاتی کوردستان) لە باکووری رۆژئاواو رۆژئاوای ئێران، و(ڕۆژئاوای کوردستان)، واتا ئەو هێڵەی باکوری سوریا، کە هاوشان‌و دراوسێی خاکی تورکیایە[2].

پێدەچێت یەکەم کەس ئەم زاراوەی بەکارهێنابێت (کلودیوس جەیمس ریچ) بێت، کە موقیمی بریتانی بووە لە بەغداد، لە ماوەی ساڵانی (١٨٠٨-١٨٢١ز)دا ، نێوبراو لە گەشتەکەیدا بۆ کوردستان‌و نەینەوا لە ساڵی (١٨٢٠-١٨٢١ز)دا، لە هێماکردنیدا بۆ ئەم ناوچەیە، تێرمی (خوارووی کوردستان-Lower Koordistan)ی بەکارهێناوە[3]. ئیدی پاش ئەوە (باشووری کوردستان) وەك زاراوەیەك لە نوسینی زۆرێك لەو ئینگلیزانەی لە ماوەی سییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا سەردانی ناوچەکەیان کردووە، دەردەکەوێت. لەوانە (ولییەم ئینسۆرث) کە بەشیك لە کتێبەکەی کە لە ساڵی

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەوە بڕوانە: عمر محمد کریم: القضیة الکردیة فی الصراع البریطاني العراقي ١٩١٨-١٩٣٢، سلیمانی ٢٠٠٨، ص ص٢٧٢-٢٩٥.

[2] سعد بشیر اسکندر: من التخطیط الی التجزئة، سیاسة بریطانیا العظمی تجاه مستقبل کردستان ١٩١٥- ١٩٢٣ ، السلیمانیة- مطبعة شفان، ٢٠٠٧، ص٢٧.

[3] Claudius James Rich: Narrative of Residence in koordistan and on the site of Ancient ineveh (London-1836), vol.1, p.279.

(١٨٣٨ز)دا بلاْوبۆتەوە، ناو ناوە ( جیۆلۆجیای باشووری کوردستان)[١]، هەروەها "ئۆستن هنری لایارد"ی دۆزەرەوەی شوێنەوار، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا ئەم زاراوەی بەکارهێناوە [٢].

ئەوەی تێبینی دەکرێ، مەبەستی بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە (واتە باشووری کوردستان) لە ئاماژەکردندا بۆ سنووری ناوچەکە، لەگەڵ مەبەستەکانی بەکارهێنانیدا لە سالآنی جەنگی یەکەمی جیهانی زۆر جودایە، بۆ وێنە، کاتێك (ئینسۆرث) باس لە جیۆلۆجیای ناوچەکە دەکات، ئەوا باسەکانی تەنها ئەو ناوچانە دەگرێتەوە کە کەوتونەتە نێوان زنجیرە تەپۆڵکەکانی حەمرینو ڕووباری زێی بچووك، واتە ناوچەکانی باکووری تەپۆڵکەکانی حەمرینو باشووری زێی بچووكو زنجیرە شاخەکانی زاگرۆس بەدیوی ڕۆژهەلآتدا[٣]. هەر لەسەر بنەمای هەمان وێناکردن، یەکێك لەو ئینسکلۆپیدییانەی ساڵی (١٨٥١ز) لە بریتانیا بلاْوکراوەتەوە، هێمای بۆ ئەوەکردووە کە بەشی باشوور لە کوردستان دەکەوێتە نێوان هەردوو هێڵی ٣٤و ٣٦ بە ڕووی باکووردا، لەو چوارچێوەشدا ئاماژەی بۆ سێ زنجیرە تەپۆڵکە کردووە، کە دەکەونە نێوان ڕووباری دیجلە بە دیوی ڕۆژئاواو سنوری ئێران لە رووی رۆژهەلآتو بریتین لە تەپۆڵکەکانی حەمرین لەوپەڕی باشووری رۆژئاوا، عەلی داغ لە ناوەڕاستو قەرەداغ لە رووی باکووری ڕۆژهەلآت. هەمان ئینسکلۆپیدیا، وەك (پایتەختی باشووری کوردستان)

---

William Ainsworth: Researches in Assyria, Babylonia and
(١) Chaldea, (London-1838), p.237.

(2)Austin Henry Layard: Discoveries in the Ruins of Nineveh and Babylon (London-1853) p.27.

(٣) Ainsworth: op. cit, p.237-255.

ئامارژەی بۆ شاری سلێمانی کردووە[١]. وەك ئاشکرایە مەبەستی ئەوانە لە (کوردستانی باشوور) تارادەیەکی زۆر سنووری (میرایەتی بابان) دەگرێتەوە.

سنووری باشووری کوردستان بە دیوی رۆژهەلاتو باکوورو باکووری رۆژئاوایدا دەستنیشانکراوەو تارادەیەك جێی مشتوومڕ نییە، چونکە سنووری ئامارژەبۆکراو لە پرۆسەیەکی مێژووی درێژخایەنداو دوای ئەنجامدانی چەندین دانووستانی جیاواز، لە کاتو شوێنی جیاوازو لە لایەن چەندین هێزی جیاوازەوە، بە کۆمەڵێ ڕێککەوتننامە دیاریکراوە[٢].

---

(4) The Supplement to the Penny Cyclopaedia of the Society for the Diffusion of Useful Knowledge, vol.2 (London-1853), p.153.

(٢) یەکەمین ڕێککەوتننامە کە تێیدا هێڵی سنوور کەوتە نێو خاکی کوردستان، ڕێککەوتننامەی ( ئەماسییە) بوو، کە لە نێوان دەوڵەتی سەفەوی‌و دەوڵەتی عوسمانی دا لە ٢٩ مایسی ساڵی ١٥٥٥ز، بەسترا، لەم ڕێکەوتننامەدا کە دەقەکەی نووسراو نەبوو، بەڵکو نامە گۆڕینەوە بوو لە نێوان هەردوو لای ناکۆکدا، لە کوردستانی باشوور (شارەزوورو شارباژێڕو قەرەداغ) کەوتۆتە سنووری عوسمانی. لە ڕێککەوتنە ناودارەکانی تری عوسمانی–سەفەوی، ڕێککەوتننامەی ساڵی (١٥٩٠ز) بوو، تێیدا سەفەوییەکان دەستیان لە بەشێك لە لوڕستان بۆ دەوڵەتی عوسمانی هەڵگرت ، هەروەها ڕێککەوتنامەی ساڵی (١٦١٨ز) کە تێیدا عوسمانییەکان دەستیان لە (درنەو دەرتەنگ) بۆ سەفەوییەکان هەڵگرت. پاش ئەمەش ڕێککەوتننامەی (زەهاو– زەهاب) بوو لە ساڵی (١٦٣٩ز)دا کە پێچەوانەی ڕێککەوتننامەکانی تر، هەردوو دەوڵەتی نێوبراو زۆر بەوردی هێڵی سنووری نێوانیان لە باکوورەوە تا باشوور دەستنیشانکرد. دواتریش بەندەکانی بوونە بناغە بۆ ڕێککەوتنەکانی تر. لە ڕێککەوتننامە بەنێوبانگەکانی تری سەردەمی قاجاری– عوسمانی ڕێکەوتنی ئەرزەڕومی یەکەمی ساڵی (١٨٢٣)و ئەڕزەرومی دووەمی ساڵی (١٨٤٧) بوو، ئەمەی دواییان بە سەرپەرشتی هەردوو وڵاتی روسیاو بەریتانیا مۆرکرا، تێیدا قاجارەکان بەرامبەر وەرگرتنی عەرەبستانی ئێران بە شاری موحەممەرەو

دواتریش لە چارەکی یەکەمی سەدەی بیستەمەوە سنووری نێودەوڵەتی (عیراق) لەگەڵ ئێران ( ئەگەرچی کێشەی سنوور لە نێوان ئەم دوو دەوڵەتە نەبڕاوەتەوە)، توركياو سوريا پێكدێنێتو بووە بە سنوورێکی تارادەیەك جێگیرو یەكلایی. هەرچی سنووری باشوورو باشووری ڕۆژئاوای

---

چەندین دوورگە لە شەتولعەرەب دەستیان لە ناوچەی سلێمانی هەڵگرت بۆ عوسمانییەکان. دوای پرۆتۆکۆڵەکانی تاران لە ساڵی (١٩١١)و ئەستانە (١٩١٣)و لیژنەی دیاریکردنی سنوور لە یەکەمین هەفتەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤- ١٩١٨) دەستی بەکارەکانی کردەوە، بەلاّم بەهۆی بەرپابوونی جەنگەوە کۆتایی بەکارەکانی هێنا. لە قۆناغی دواتردا سنووری نێوان دەوڵەتی قاجاری-عوسمانی، بەم فۆرمەی ئێستاوە، بووە سنووری نێودەوڵەتی ئێران-عێراقو ئێران-تورکیا. هەرچی سنووری عیراق- تورکیایە، ئەوا پێش ساڵی (١٩٢٤) بوونی نەبوو، چونکە عیراق بەدرێژای چوار سەدە بەشێك بووە لە دەوڵەتی عوسمانیو سنوورێکی سیاسی جێگیر لە دەوڵەتی تورکیایی جیانەدەکردەوە، دوای دروستبوونی هەردوو دەوڵەتی نوێی تورکیو عێراق کێشەی سنووری نێوانیان لە (١ تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٤) خرایە بەردەم (کۆمەڵەی گەلان) ئەویش (هێڵی برۆکسل)ی وەك سنووری جیاکەرەوە لە نیوان هەردوو دەوڵەتدا دیاریکرد. سنووری عێراق-سوریاش بەم فۆرمەی ئێستای لە(٥ ئابی ١٩٢٣) یەکلایی کرایەوە، بێگومان لەلایەن بەریتانیاو فەرەنساوە کە براوەی جەنگو داگیرکەری ناوچەکە بوون.

بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەو ڕێککەوتنو پەیماننامانەی نێوبراون، بڕوانە :عبدالعزيز سليمان نوار: العلاقات العراقية الايرانية"دراسة في دبلوماسية المؤتمرات، مؤتمر ارضروم (١٨٤٣-١٨٤٤)، دار الفكر العربي، القاهرة ١٩٧٤، ص ص١١-٣٠؛٧٧-١٠٣; منوچهر پاراسادوست: ریشەی تاریخی اختلافات ایرانو عراق(١٥١٤-١٩٨٠)، چ٤، چاپخانەی حەیدەری، تهران، ١٣٦٩، ل ل٢٧-١٤٩; علی شاكر علی: تاريخ العراق فی العهد العثماني ١٦٣٨-١٧٥٠دراسة فی أحواله السياسية، ط١، نينوى، ١٩٨٥، ص ص٧٣-٨٢; نەجاتی عەبدوڵلا: کوردستانو کێشەی سنووری عوسمانی-فارسی ١٦٣٩-١٨٤٧، چ١، دەزگای چاپو بلاّوکردنەوەی موکریانی، هەولیر ٢٠٠١، ل ل٣٣-١٢١.

کوردستانی باشووره، ئەوا ڕوون نییەو دیاریکردنی دەمێکە جێی گفتوگۆو قسە لەسەرکردنە. لەگەڵ ئەوەشدا چ ڕۆژهەلاتناسانو چ لێکۆڵیارانی بیانیو کورد لە سۆنگەی جیاوازەوە بۆچوونی خۆیان سەبارەت بە دیاریکردنی ئاشکراکردووە.

وتەکەی (دەبلیو. ئار.هەی-W.R.Hay) کە بە گشتی لە بارەی سنووری کوردستانەوە گوزارشتیکردووە، پڕاوپڕ بەسەر ناڕوونی ناوچە سنوورییەکانی کورد دەگونجێت کە لەگەل گەلانی دراوسێ ناوچەی بەیەکگەیشتنی ئیتینی (الالتقاء الاثني) پێکدێنن، ئەم سیاسییە بریتانییە، کاتێك باس لە سنووری کوردستان دەکات، دەڵێت:

**"نێوی کوردستان کە مانای ولاتی کوردان دەبەخشێتو دەبینین بە پیتی گەورە لەسەر نەخشەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست نووسراوەتەوە، لە کاتێکدا مرۆڤێك مەبەستیبوو سنوورەکەی دەستنیشانبکات، ئەوا هەرگیز نایدۆزێتەوە!"[1]**، بەدڵنیاییەوە ئەو سنوورەی ئەم وتەیەی بەسەردا جێبەجێدەبێت، سنووری باشوورو باشووری ڕۆژئاوای کوردستانی باشووره. چونکە ئەم سنووره ناوچەی بەریەککەوتنو کۆنتاکتی نەتەوەییو ڕەگەزی[2] کوردە لەگەڵ عەرەبو بەتایبەت (بەلایەن کەمەوە بەدرێژایی مێژوویێ نویێ) هەمیشە ڕووبەڕووی گۆڕانکاریی ئیتنۆگرافیو ڕەگەزی بۆتەوە[3].

---

[1] مذكرات دبليو.ار.هي: حاكم اربيل السياسي في كردستان ايام الاحتلال البريطاني١٩١٨-١٩٢٠، ت. فؤاد جميل، ب،م، بيروت، ٢٠٠٨، ص٥٠.

[2] بڕوانە: سنووری خوارووی کوردستانی باشوور، چ١، دهوك، ٢٠٠٧، ل١٣.

[3] خليل اسماعيل محمد: دهوك-نينوى، دراسات في الخصائص الديموغرافية للسكان، السليمانية، ٢٠٠٥، ص ص٩-١١.

لەم ڕووەوە (فردریك میلینگن–F.Melingen) ساڵی (١٨٧٠) سنووری کوردستانی باشووری بەزنجیرە چیای حەمرینو ڕووباری دیجلە بەدیوی ڕۆژئاوادا دەستنیشانکردووە، ئەوەشی پیشانداوە کە کورد لەم بەشەدا لەگەڵ ڕەگەزی تورك‌و عەرەب تێکەڵن‌و عەشیرەتە کۆچەرەکانی کورد بە تەنیشت کەنارەکانی بەرامبەر ڕووباری دیجلەو باکووری چیای حەمریندا بوونیان هەیە، هەروەها میلینگن بڕوای وایە دیاریکردنی سنوور بەم چەشنە ڕەنگبێ مایەی سەرسامیی جوگرافیناسەکان بێت‌و بەدڵی وەزیرو سوڵتانەکانیش نەبێت، ئەو ئەگەرەشی داناوە جێی ناڕەزایی ئەو کەسانە بێت کە لەم سنوورەدا بە بوونی کورد خۆشحاڵ نین، لە کۆتایشدا میلینگن جەختدەکاتەوەو دەڵێ: بەڵی سنووری کوردستان زنجیرە چیای حەمرینە، کە هاوسێی دەشتی بەغدادو دیجلەیە [١].

(دەبلیو. ئار. هەی) پێیوایە، تێکڕا زەوییەکانی دیجلەو باکووری هێڵی نێوان مەندەلی‌و ڕێژگەی زێی بچووك نیشتمانی کورد پێکدەهێنن، لەم ڕووەوە گرنگترین دوو مەڵبەندی خوارووی زێی بچووك کەرکوك‌و سلێمانییە[٢]. هەرچی (سی.جی.ئەدمۆندز–C.J.Edmonds)ە، ئەوا درێژی دامێنی چیاکان کە بۆ کەنارەکانی ڕووباری دیجلە شۆڕبۆتەوە،

---

[١] Major. F. Melingen: Wild Live Among the Koords, London, 1870, p 148-151.

لە: جزا توفیق طالب: المقومات الجیوبولیتیکیة للامن القومي في اقلیم کردستان، السلیمانیة،٢٠٠٥، ص١٤.

[٢] دبلیو.ار.هي، المصدر السابق، ص٥٥.

لەویشەوە بۆ چیای حەمرین تا سنووری عێراق- ئێران نزیك بە شارۆچكەی مەندەلی وەك سنوور هێما پێكردووە[1].

ڕاپۆرتە فەرمییەكەی كۆمەڵەی گەلانیش كە لە ساڵی (١٩٢٥)دا، بۆ چارەسەركردنی كێشەی موسڵ و دیاریكردنی سنووری نێوان توركیا و عێراق تەرخانكراوە، زنجیرە چیای حەمرین بەسنووری سرووشتی نێوان كوردستان و هەرێمە عەرەبنشینەكان دادەنێت[2].

جێی خۆیەتی لێرەدا ئەو دەرەنجامگیرییە بخەینەڕوو، كە توێژەر (سەعدی عوسمان هەرووتی) لە تۆژینەوەیكیدا بۆ "دەستنیشانكردنی سنووری خوارووی كوردستانی باشوور لە سەدەی نۆزدەهەمدا" پێیگەیشتووە، بە تایبەت نێوبراو باسەكەی بە كۆمەڵێ بەڵگەنامەو سەرچاوەی ڕەسەن و زانیاری مێژوویی هاوچەرخ سەلماندووە. لە ئەنجامیشدا لە بارەی دەستنیشانكردنی ئەم سنوورەوە دەڵێت:

هێڵێك كە بە باشووری شەنگاردا تا دەگاتە باشووری تەلەعفەر، كە هەردوو ڕەگەزی كوردو توركمان تێكەڵاودەبن، لەویشەوە هێڵەكە بۆ ڕووباری دیجلە لە سەرووی موسڵ شۆڕدەبێتەوە، كە ژمارەیەك گوندی كوردان لەخۆدەگرێ (ئەگەرچی سێیەكی دانیشتوانی موسڵ كورد بوون)،

---

[1] سي.جي.ادموندز: كرد وترك و عرب، سياسة ورحلات و بحوث عن الشمال الشرقي من العراق ١٩١٩-١٩٢٥، ت جرجيس فتح الله ، د.ت، د.م ص٧.

[2] عبدالرزاق محمود القيسي (مراجعة وتحقيق): ولاية الموصل، تقرير لجنة عصبة الامم الخاصة بحل النزاع التركي البريطاني حول ولاية الموصل (١٩٢٤-١٩٢٥)، مركز كوردۆلۆجی، السليمانية، ٢٠٠٩، ص٥٩; جرجيس فتح الله، يقظة الكرد تاريخ سياسي ١٩٠٠-١٩٢٥، اربيل ٢٠٠٢، ص٥١١.

هێڵەکـە لـە شـێوەی کەوانەیـەکی دەرەکـی لـە بـاکوورو ڕۆژهـەلاّتی موسـلْ بادەداتـەوە تـا دەگاتـە ڕێژگـەی زێـی بادینـان لەسـەر دیجلـە، بەتێپـەڕین بـە تـەلکێف و بەعـشیقەدا بـۆ ئـەوەی ناوچـەکانی ئـەلقوش و شـێخان و چـیای مـەقلوب و عەشـایەر سـەبعە لـەخۆبگرێت، لەوێـشەوە بـەڕێڕەوی دیجلـەدا دەچێتە فەتحە، ئیدی لـەوێوە زنجیرە چیای حـەمرین وەکو ڕووبـاری دیجلـە دەبێتـە سـنوورێکی سروشـتی و ئیتینـی ناوچـە کوردنـشینەکان، تـا دەگاتـە باشـووری قزلْڕەبـات. لـە کلکـەی خـوارووی (حـەمرین)یـشەوە تـا جەسـسان بەتەواوکەری بەشی باشووری کوردستان دادەنرێت، کە خـودی جەسسان و (مەندەلی و خانەقین)یش لەخۆدەگرن[1].

کوردسـتانی باشـوور لـە ڕووی جوگرافییـەوە، سروشـتێکی تایبـەت و دەوڵەمەندی هەیە، کە بایەخی ئابووری و ستراتیژی زیاتریان پێبەخشیوە، لەوانە خاوەن خاکی بەپیت و پێدەشتی زۆرو بەرفراوانە، کە بۆ بەرهـەمی کـشتوکاڵی و سـامانی ئاژەڵـداری بناغـەی سـەرەکین، دەشـتاییە زۆرەکـانی بەشێوەیەکی تایبەت بۆ چاندنی دانەوێڵەو بەروبوومە کشتوکاڵییەکانی تر گونجاون، لەوانـە دەشـتەکانی شـارەزوور، ڕانیـە، هـەریر، سـندی ، هـەولێر، مـــەخمورو ســـلیڤانی. لـــە کاتێکـــدا هێڵـــی بـــارانی(٢٠٠) ملیمـــەتری بەســـنوورەکانی باشـــوورییەوە گوزەردەکـــات، چـــەندیش بـــەرەو بـــاکوورو ڕۆژهـەلاّت هەڵکـشێی بـاران زۆرتـر دەبـیّ و لـە هەنـدیّ ناوچـەی لـە (١٠٠٠) ملیمەتر زیاترە، سەرباری ئەمە لەڕووی سەرچاوەی ئاوەوە زۆر دەوڵەمەندە، بێجگـە لـەو چـەم و ڕووبارانـەی لـە دەرەوەی سـنوورەوە هەڵـدەقوڵێن و بـە خاکەکەیدا تێدەپەڕن و دواتر دەڕژێنە دیجلە وەك (خابوور، زێی گەورە، زێـی

[1] سەعدی عوسمان هەروتی: سنووری خوارووی کوردستانی باشوور، ل ل٥١-٥٢.

بچووك، عوزێم و سیروان) ، بڕێكی زۆر ئاوی ژێرزەمین و چەندین تاڤگەی هەیە[1].

لە هەندێ قۆناغدا ئەو تایبەتمەندییانەی سەرەوە، لە گەشەپێدانی پرۆسەی كشتوكاڵیدا ڕۆڵی بەرچاویان بینیوە، بەچەشنێك سەرنجی زۆر لەو گەڕۆكانەیان ڕاكێشاوە، كە هاتوونەتە كوردستانی باشوور، لەوانە گەڕۆكی ئەڵمانی (نیبور–C.Niebuhr)كە دەڵێت: "كوردستان هەرێمێكی زۆر بەپیت و دەوڵەمەندو پڕ بەروبوومە"[2]. گەڕۆكی فەرەنسی (ئۆلیڤیە–G.A.Oliver)ش هەمان مەسەلەی دووپاتكردۆتەوە كاتێك دەڵێت: "خاكەكەی بەپیت و بەروبوومەكەشی بە بڕشتە"[3] ، لەڕوویەكی تریشەوە لەوەرگەكانی پێدەشت و شاخ و دۆڵەكان سنووری بەخێوكردنی مەڕومالاتی لە هەرێمەكە فروانترو دەوڵەمەندتر كردووە[4]. بە دیوێكی تردا هەڵقوولانی نەوتی خاو لە كوردستانی باشوور بەگشتی و كەركوك بەتایبەتی، لە هەردوو سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەمدا، سەرنجی زۆرێك لە گەڕۆكە ئەوروپی و ناوچەییەكانی بەلای خۆیدا ڕاكێشاوە، لە نامەی تایبەتی و ڕۆژانەو

---

[1]كۆمەڵێك لە مامۆستایانی زانكۆ: جیوگرافیای هەرێمی كوردستان، چ١، هەولێر، ١٩٩٨، ل ل١٤–٩٦.

[2]كارستن نیبور: رحلة نیبور الی العراق في القرن الثامن عشر، ت.محمود حسین الامین، بغداد، ١٩٦٥، ص ٧٤.

[3] رحلة اولیفیة الی العراق ١٧٩٤–١٧٩٦، ت. یوسف حبی، مطبعة المجمع العلمي العراقي، بغداد، ١٩٨٨، ص٤٦.

[4] جەلیلی جەلیل: كوردەكانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، و.كاوس قەفتان، بغداد، ١٩٨٧، ل٧٩.

**یاداشتەکانی خۆیاندا هێمایان بۆ ئەم سامانە گرنگە کردووە و لە کۆتاییشدا ناساندوویانە بە جیهان[1].**

**سەرباری ئەو تایبەتمەندییانەی سەرەوە، کوردستان سروشتێکی پڕ لەندو شاخاوی سەختی هەیە، تا ئەو ڕادەیەی لە ڕووی پێکهاتەی جیۆفیزیاییەوە بە شاخاویەتییەکەی جیادەکرێتەوە، چیاکان تاقە نیشانەی سرووشتی گرنگی وڵاتەکەن و بوونەتە دروستکەری مێژوو و پێکهاتەی نەتەوەیی و داب و نەریت و فەرهەنگی گەلەکەی. یەکێ لە هەرە لوتکە بەرزەکانی چیاکانی باشووری کوردستان چیای(هەڵگورد)ە کە بەرزییەکەی دەگاتە (١٢٢٤٩) پێ[2].**

**پێگە جوگرافییەکەی باشووری کوردستان، بۆخۆی ڕۆڵێکی دوو جەمسەرەی داوەتێ، بە دیوێکدا کەوتبووە نێوان دوو زلهێزی گەورە کە خۆی لە هەردوو ئیمپراتۆریای ئێرانی و عوسمانیدا دەبینییەوەو بەدرێژای مێژووی نوێ خاکەکەی گۆڕەپانی بەریەککەوتنی ئەو هێزانە بووەو هەمیشە بە نەمانی ئارامی و لەبەرڕۆیشتنی سامانی مادی و مرۆیی باجەکەی داوە[3]. بە دیوێکی تریشدا ئەم دۆخە شاخاوییە، بەربەستێکی تۆکمەو سروشتی**

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر لەمبارەوە بڕوانە: عبدالحمید العلوجي: خضیر عباس اللامي، الاصول التاریخیة للنفط العراقي، ج١، دار الحریة للطباعة، بغداد، ١٩٧٣، ص ص٦٣-٦٦.

[2]میهردادی ئێزەدی: چەردە باسێك لەبارەی کوردانەوە، و. ئەمین شوان، چ١، سلیمانی، ٢٠٠٧، ل ل٤١-٤٢.

[3]فازل کەریم احمد: هۆی دروستنەبوونی دەوڵەتێکی سەرانسەری لە کوردستاندا، گۆڤاری ڕووناکبیری، ژ. ٢، ستوکهولم ١٩٩٢، ل٢١.

بـووه لەئاسـت دەوڵەتـه زلهێزەکـانی دراوسـێ، بـه لـه بەرچـاوگرتنی ئـەو ڕاستییەی کە زۆربەی هەرێمەکه له سایەی سەرکردە نێوخۆییەکانیدا، جگه لـه هەنـدێ دابـڕان نـەبێت، تـا ناوەڕاسـتی سـەدەی نۆزدەهـەم، لـه دۆخـی سەربەخۆیی یا نیمچە سەربەخۆیدابوون [1].

ئەگەرچی پاشماوەی بەپاوەی هەندێ شوێنەوار له باشووری کوردستان، بـاس لـه یەکـەم هەڵسوکەوتی مـرۆڤ دەکـەن لەگـەل شارستانییـشینیدا، لـەم ڕووەوە کـۆنترین مەڵبەنـد کـه دەکـرێ بـه شـار نـاو بـبرێ، نـەك گونـد، لـه کوردستاندا دۆزراوەتەوە، لەوانە گوندی (چەرمو) [2]،ئەم هەرێمه ئەگەرچی سـەدان سـاڵه مەڵبەنـدی ئـاوەدانی گـەلێ شـاری نـاودارە لەوانـە: هـەولێر، کـەرکوك و (پاشـتر لـه کۆتاییـەکانی سـەدەی هەژدەهـەم سـلیمانی)، لەگـەڵ ئەوەشدا لە ماوەی مێژووی نوێدا شارەکانی کوردستان، بەراورد بە شارو مەڵبەنـدە دراوسـێکانی لـەڕووی ڕێـژەی دانیـشتوان و ئاوەدانییـەوە، پـەرەی نەسەندووەو هەمیشه ڕوو له کزیو پاشەکشێ بووە.

بۆ وێنە ڕێژەی دانیشتوانی هیچ یەك لـه شـارو شارۆچکەکانی باشووری کوردسـتان، بـەگوێرەی خەمڵانـدنی لایەنـه جیاوازەکـان، تـا سـەرەتاکانی چـارەکی کۆتـایی سـەدەی نـۆزدەش (٢٠) هـەزار کەسـی تێنەپەڕانـدووە، لـه کاتێکدا ڕێژەی دانیشتووانی شارێکی وەك موسڵ لەو ماوەیەدا، گەیشتۆتە

---

[1] سعد بشير اسكندر: قيام النظام الاماراتي فى كردستان وسقوطه، ط٢، السليمانية، ٢٠٠٨، ص٤٥.

[2] میهردادی ئێزەدی: سەرچاوەی پیشوو، ل٢٨٤.

(٥٠) هەزار کەس و دانیشتووانی بەغدادیش نزیکەی (١٠٠) هەزار کەس بووە[1].

بۆ وێنە شاری هەولێر کە لەڕووی ئاوەدانی و عومرانییەوە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، یەکێك بووە لە شارە گرنگەکانی ناوچەکە، کەچی لە چەرخی نوێدا بایەخی ئەم شارە پاشەکشێی کردووە[2]، گەڕۆکە بیانییەکان کە سەردانی شارەکەیان کردووە، ئەم راستییەیان سەلماندووە. لەوانە (ئیفز- Ives) لە ناوەڕاستەکانی سەدەی هەژدەهەمدا خانووەکانی خوارەوەی قەلاّی شارەکەی بە (گوندێکی پیس و پۆخڵ) وەسفکردووە، بەپێی زانیارییەکانی (ئولیڤیە- G.A.Oliver )ی گەڕۆکی فەرەنسیش کە لە کۆتایی سەدەی ئاماژەبۆکراودا شارەکەی بینیوە، لەو رۆژگارەدا ژمارەی دانیشتوانەکەی بەوە خەملاّندووە کە (٢٠٠٠) کەس تێنا پەرێنێت و بەگوێرەی قسەی ئەویش نزیکەی هەموویان کلدان و کوردبوون، بڕواشی وابووە پێکهاتەی شارەکە لە رابوردوودا پانتاییەکی لەوە گەورەتری داگیرکردووە، کە بەرەو دەشتاییەکان شۆڕبۆتەوە[3]. (کلۆدیوس جیمس ریچ) کە لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا هاتۆتە هەولێر، بە کێشانی وێنەیەك ئەو هەڵسەنگاندنانەی سەرەوەی بۆ شارەکە سەلماندووە،

---

[1] سعدي عثمان حسين: كردستان الجنوبية فى القرنين السابع عشر والثامن عشر، ص٥١

[2] عماد عبدالسلام رؤوف: الحياة الاجتماعية فى العراق ابان عهد المماليك ١٧٤٩-١٨٣١، اطروحة دكتوراه، كلية الاداب جامعة القاهرة/١٩٧٦، ص٢٥.

[3] رحلة اوليفية، المصدر السابق، ص٦٥.

کـە خـۆی لــە تــەنیا قەڵایــەك لــە ناوەڕاســتی دەشــتێکی چــۆڵ و هۆڵــدا دەبینێتەوە[1].

بە گوێرەی ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ بۆ ساڵی ١٣١٠ك (١٨٩٢-١٨٩٣) ژمارەی دانیشتوانی هەولێر بە نزیکەی (٣٧٦٣) نێرینە خەمڵێنراوە.[2]

شـــاری (ســـلێمانی)ش هـــەمان دۆخـــی هـــەبووە، کاتێـــك (جـــیّ. کامپـانیلا-G.Campanella) کە نێردراوێکی ئاینیی ئیتالی بووە و چەند ساڵێك لـە باشـووری کوردسـتان ماوەتـەوە، لـە دەیـەی یەکـەمی سـەدەی نۆزدەهەمـدا ژمـارەی دانیـشتوانەکەی بـە (١٥) هـەزار کـەس خەمڵانـدووە[3]. کەچی دوای ئەو (جیمس بیلی فرەیزەر-J.B.Fraser)[4] کە لە رۆژی (١ی تــشرینی دووەمــی ســاڵ (١٨٣٤) شــارەکەی دیــوە، لــە نامەیەکـدا بــۆ هاوسـەرەکەی بـە (وێـران و کەسـاس و نەگبـەت) ئامـاژەی کـردووەو ژمـارەی

---

[1] Claudius James Rich, op.cit, p.311.

[2] عبـدالجبار قـادر غفـور :"أربيـل فـی الـسالنامات العثمانيـة"، گۆڤـاری کـاروان (القسم العربي)، ژ.٩١ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٩٠، ل١٢٢.

[3] وەرگـیراوە لـە: هلكـوت مـلا حكـيم، ابعـاد ظهـور الطريقـة النقـشبندية في كردسـتان في اوائـل القـرن التاسـع عـشر، مجلـة دراسـات كرديـة، العـدد( ٢) بـاريس، كـانوون الثـانی، ١٩٨٥، ص٣٢.

[4]جیمس بیللی فرەیزەر(١٧٨٣-١٨٥٦): گەڕیدەو نوسەرو شارەزا لە بواری تۆبۆگرافیا خـاوەن کتێبـی (گەشـتێك بـە کوردسـتاندا)، دوای دەرچـوون لـە تـەورێز بـە تێپـەڕین بـە سـەلماس و ئورمیـەو شـنۆدا، لـە یـەکی تـشرینی دووەم دێتـە شـاری سـلێمانی.بڕوانـە: سي.جي.ادموندز، المصدر السابق، ص٢٧.

دانیــشتوانەکەشی بــە (٥) هــەزار کــەس مەزەنــدە کــردووە[1]. ئــەم دابەزینــە بێگومــان دۆخــی نائــارام و ناســەقامگیری شــارەکەو ناوچــەکەش دەســەلمێنن، بەتایبــەت نێــوبراو لــە کاتێکــدا هاتۆتــە ناوچــەکە، نــاکۆکی میرەکــانی بابــان لەسەر دەسەلاَت و قووڵکردنەوەی ئەو ناکۆکییانە لە لایەن هەردوو دەوڵەتی ئێــران و عوسمانییــەوە لــە لوتکــەدابوو. بــە گــوێرەی هەڵــسەنگاندنی (ژاك ڕیتــۆریَ)ش کــە لــە تــەمووزی (١٨٧٨)دا هاتۆتــە شــارەکە، ســەرجەمی دانیشتوانەکەی بە (١٥) هەزار کەس مەزەندەکردووە[2].

هەرچــی شــاری (کــەرکوك)یــشە، کاتێــك گەڕیــدەی ئینگلیــزی (جــیمس بیکنغهام-j.Buckingham) لە ساڵی (١٨٦١ن)دا سەردانیکردووە، پێیان وتووە ژمارەی دانیشتوانی قەلاَکە لە نێوان (٥٠٠٠تا٦٠٠٠) کەسە، بەلاَم نێــوبراو ئەمــەی بــە زیــادەڕۆیی زانیــوە، هەرچــی دانیــشتووی دەشــتایی دەوروبــەر قەلاَکەیــە، بــە بــازاڕو خانەقاکانیــشەوە بــە (١٠٠٠٠) کــەس خەملاَندووە، لە کاتێکدا ئاماژەی بۆ بەشی سێیەمی دانیشتووانی شارەکە کردووە (کە پێدەچێت مەبەستی تەنیشت قۆریە بێت، لە رۆژئاوای ڕووباری خاسەسۆ) بەوەی ژمارەی دانیشتوانەکەی لە (١٠٠٠) کەسێك تێناپەڕێت، بــەم چەشــنە کــۆی گــشتی دانیــشتووانی شــارەکە دەگاتــە نزیکــەی (١٥٠٠٠)کەســێك[3]. ئــەم خەملاَندنــەش لــەوەی (چــیرنیك)ی ئەنــدازیاری

---

[1] جیمس بیللی فرەیزەر: گەشتەکەی فرەیزەر بۆ کوردستان و میزۆپۆتامیا ١٨٣٤، و. ئومید ئاشنا، چ١، سلێمانی، ١٩٩٨، ل ٤٢-٤٣.

[2] ژاك ڕیتــۆریَ: گەشــتنامەی مــسیۆنێرێك بــۆ ناوچــەکانی کــەرکوك و ســلێمانی ســاڵی ١٨٧٨، و. نەجاتی عەبدوڵلاَ، چ١، بنکەی ژین، سلیمانی، ٢٠٠٨، ل٤٠.

[3] جــیمس بکنغهــام: رحلــتي الی العــراق ســنة١٨١٦،ت. ســلیم طــه التکــریتي، ج١، ص ص١٤٢-١٤٣

**ڕووسییەوە نزیکە، کە ساڵانی (١٨٧٢-١٨٧٣) هاتۆتە شارەکە، ژمارەی دانیشتوانەکەی لە نێوان (١٢-١٥) هەزار کەسێك داناوە، جەختی لەوەش کردۆتەوە کە زۆرینەی هەرە زۆریان کوردبوون[1]. بە گوێرەی ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ بۆ ساڵی (١٢٩٤ك/١٨٧٧)، ژمارەی دانیشتوانی شارەکە (١٠٨٨٦) کەس بووە[2]. هەرچی گەڕیدەی ئەڵمانی (باڕۆن ئیدوارد نۆڵدەکە) یە کە لە (١٨ی مایسی ساڵی ١٨٩٢) دا چۆتە کەرکوك وێڕای ئەوەی شارەکەی بە گرنگ و بایەخدار وەسفکردووە، دەڵێت "بە گوێرەی ئەو ڕاپۆرتانەی لە تورکیا بەرچاوم کەوتوون، ژمارەی دانیشتوانەکەی (١٧,٥٠٠) کەسە"[3]. هەڵبەتە وێڕای ئەوەی ناتوانین بەشێوەیەکی ڕەها پشت بەو خەملاندنانە ببەستین، بەلام بڕێکی زۆر ڕاستیان تێدایە، تا ڕادەیەك نزیکی خەملاندنەکان لەیەکەوە، وێڕای مەودای نێوان ساڵەکان، ڕادەی هێشتا چەقبەستن و گەشەنەکردنی شارەکە دەسەلمێنن.**

**دۆخی خراپی ئاوەدانی و کەمی ڕێژەی دانیشتوان لە باشووری کوردستان، جێی سەرنج و تێبینییە و هۆکاریان زۆرە، لەوانە پێش هەموو شتێك نەبوونی ئارامی و ئاسایش لە ناوچە کوردییەکاندا، کە کەوتبوونە نێوان دوو دەسەلاتی لە خۆی بەهێزترەوە و بەو هۆیەوە ناوچەکەیان ببووە گۆڕەپانی ململانێ و ناوچە لەمپەری ئەو دوو هێزە ناکۆکە (وەك پێشتر**

---

**[1] مجموعة من الباحثين: كركوك مدينة القوميات المتآخية، ط١، محفوظة لمركز كربلاء للبحوث و الدراسات، لندن، ٢٠٠٢، ص٢٥٩.**

**[2] وەرگیراوە لە: عبدالفتاح علي البوتاني: دراسات ومباحث في تاريخ الكورد المعاصر، مطبعة حجي هاشم، اربيل، ص١٠٨.**

**[3] باڕۆن ئیدوارد نۆڵدە: گەشتێك بە عەرەبستان و کوردستان و ئەرمەنستاندا، و. حەمید عەزیز،چ١، هەولێر، ٢٠٠٤، ل٢٨.**

ئامارژەمانپێدا)، ئەم دوو هێزە چاویان لەسەر کوردستان بوو، دەستیان تێوەرئەداو تەراتێنیان تێدا دەکردو داهاتی ئابوورییان دوچاری لەبەرڕۆیشتن دەکرد، لە ئەنجامدا ئاسایشی تایبەتو ژیانو سامانی هاوولاتی، ئاسایشی گشتی ولاتو سامانی نیشتمانی تێکچوون، کە لە مەرجە پێویستو سەرەکییەکانی گەشەکردنی ئابووریو ئاوەدانکردنەوەیە[1] .

سەرباری ئەو ڕەوشە سیاسییەی کە لە سەرەوە ئامارژەمانپێدا، شێوازی بەرهەمهێنان لەم هەرێمەدا، کە خۆی لە کشتوکاڵو ئاژەڵداریدا دەبینیەوە، تەواو لە سروشتەوە سەرچاوەیان گرتبوو، کە زۆربەی کات بەرهەمهێنان لە ناوچە لاتەریكو دوور لەیەکەکانیدا زۆر سەختبووە، لەناو فەزایەکی وا داخراودا، بوار بۆ جووڵەی بازرگانیو ئاڵوگۆڕ بەگشتی یەکجار کەمە[2]، بە تایبەت ئەگەر هاتو زانیمان ناکۆکی عەشیرەتەکانو پەلامارداناین بۆ کاروانە بازرگانییەکانو بۆ ئەو گوندانەی کشتوکاڵیان تێدا دەهاتە بەرهەم، پیشەیەکی بەردەوامو باوبووە. بە دیوێکی تردا بڵاوبوونەوەی پەتاکان لەوانە پەتای کۆلێراو تاعون لە زۆر قۆناغدا کاریگەری قورسیان لەسەر کەمکردنەوەی ڕێژەی دانیشتووانی لە هەندێ لە هەرێمە ئاوەدانەکان هەبووە. هەڵبەتە لە دۆخو هەلو مەرجی لەم چەشنەدا، ناوچەکە لە چاوگەی ئاوەدانیو سەرهەڵدانی شاری گەورە دووردەبێت.

---

[1] نەوشیروان موستەفا ئەمین: میرایەتی بابان لەنێوان بەرداشی ڕۆم وعەجەمدا، چ٢، سلیمانی، ١٩٩٨، ل١٨٥.

[2] بڕوانە پێشەکی کتێبی: مێجەر ئی. بی. سۆن، چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خوارو، و.نەجاتی عەبدوڵلا، چاپخانەی ژین، سلیمانی، ٢٠٠٧، ل١٠.

له واقعدا دۆخی خراپی ئاوەدانیو کەمی ڕێژەی دانیشتوان لە باشووری کوردستاندا، بە تایبەت لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەو سەرەتاکانی سەدەی بیستەم بەو چەشنە نامێنیٚو ڕوو لە باشیو گەشەکردن دەکات، بۆ وێنە ژمارەی دانیشتوانی شاری سلێمانی وەك لە بەڵگەنامەیەکدا هاتووە لە ساڵی ١٩٠٥دا بە (٢٠) هەزار کەس خەمڵێندراوە[١]، (مێجەر سۆن)یش کە بۆخۆی دوو ساڵێك دوای ئەو مێژووە هاتۆتە سلێمانیو سێ ساڵێك لە شارەکەو دەوروبەریدا ژیاوە، ژمارەی دانیشتووانەکەی بە نزیکەی (٢٤) هەزار کەس داناوە[٢] ، بە پێی سەرچاوەیەکی تریش لە ساڵانی پێش جەنگی یەکەمی جیهانیدا دانیشتوانی شارەکە بۆ نزیکەی (٤٠٠٠٠) هەزار کەس بەرزبۆتەوە [٣] ڕێژەی دانیشتووانی شاری هەولێریش بە گوێرەی دوا ساڵنامەی موسڵ لە ساڵی (١٣٣٠ك/ ١٩١٢) دا، نزیکەی (١٤١٨١) نێرینە بووە[٤]. یەکەم ئینسکلۆپیدیای (تورکی)ش لە مێژوودا، لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا دانیشتوانی شاری کەرکوکی بە (٣٠) هەزار کەس هەڵسەنگاندووە[٥]، بەگوێرەی ساڵنامەی ویلایەتی (موسڵ)یش بۆ ساڵی

---

[١] بڕوانە: مستەفا نەریمان :"چەند بەڵگەیەکی مێژوویی"، گۆڤاری رامان، ژ.(٦٧)ی ٥ی کانونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٢، ل٢٢٧.

[٢] سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان: ل٢٦.

[٣] Mason, Kenneth,(central Kurdistan) Geog. Jurnal. vol, liv,1919, No;6. P.345

لە: فؤاد حمه خورشید: (مدينة السليمانية دراسة فی جغرافيتها التاريخية)، گۆڤاری کاروان، ژ.٥٤، نیسانی ١٩٨٧، ساڵی ٥، ل١٥٨.

[٤] عبدالجبار قادر غفور: "أربيل فی السالنامات العثمانية"، ل١٢٢.

[٥]ئەحمەد تاقانە (وەرگێڕان): کوردو کوردستان لەیەکەم ئەنسکلۆپیدیای تورکی لەمێژوودا، قاموسولئەعلامی شەمسەدین سامی، چ١، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٢٥٨.

(١٣٣٠ك/١٩١٢)، سەرجەمی دانیشتوانی شارەکە بۆ (٤١١٣٧) کەس بەرزبۆتەوە [١].

جگە لەو شارانەی باشووری کوردستان کە لە سەرەوە ئاماژمانپێدان، چەندین شارۆچکەو مەڵبەندی ئاوەدانی تر هەبوون، کە هەندێکیان ریشەیەکی مێژوویی دێرینیان هەیە، لەوانە: ئامێدی، زاخۆ، شەنگال، ئاکرێ، رەواندوز، قەلاَچوَلان، کۆیە، هەریر، خانەقین، مەندەلی، کفری، توزخورماتوو.....هتد [٢] .

[2]Gengiz Eroğla, Murat BabuÇoğlu,Orhan özdil, Osmanli Vilayet Salnamelerinde Mosul, Ikinci Baski, Ankara-2008, S.217

پشکۆ حەمە تاهیر ئاغجەلەری: شاری کەرکوك، ١٩١٧-١٩٢٦، مەکتەبی بیرو هوشیاری، چ١،سلێمانی، ٢٠٠٧، ل٧٨.

[٢] بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی مێژوو پێکهاتەی هەندێ لەم شارۆچکەو مەڵبەندانە بڕوانە: ا.م.مینتیشاشڤیلی، کورد، کورتەی پەیوەندی کۆمەڵایەتی ئابووری رۆشنبیریو گوزەران، و.عیزەدین مستەفا رەسووڵ، چ٢، هەولێر ٢٠٠٨، ل ل٣٨-٤١ ;جمیل بندی الروژبیاني، مدن کردیة قدیمة، تاریخها، جغرافیتها، رجالها، علماؤها، ادباؤها، السلیمانیة ١٩٩٩، ص ص٨٦-٢٨٢.

**باسی دووەم:**

## کارگێڕی عوسمانی لە باشووری کوردستاندا
## (١٥١٤-١٩١٨)

سەرەتای سەدەی شازدە لە ڕۆژهەڵاتدا سەردەمێکی نویّ دەستیپێکرد، پاش (٩) سەدە (٦٣٩–١٥٠١) پاشەکشێ‌و پاشاگەردانی، وڵاتی فارس بەسەرکردایەتی ئیسماعیلی سەفەوی سەرلەنویّ سەریهەڵدایەوەو لە پایتەختی یەکەمی لە (تەورێز)و دووەمی لە (قەزوین) دواتریش لە (ئەسفەهان)دا، توانی دەسەڵاتی یەکگرتوی خۆی بونیاد بنێتەوە، بە دیوی ڕۆژئاواشیدا ئیمپراتۆریای عوسمانی لە قستەنتینیەو لە هەرێمەکانی بەلقاندا، توانیبوی پێگەی خۆی سەقامگیربکاتو لەوێشەوە چاو بپڕێتە زەویو زارە پانو بەرینەکانی کوردستانو ئەرمەنستانو جۆرجیاو عەرەب[1].

پەیدابوونی هەردوو ئیمپراتۆریای نێوبراو، دۆخێکی نوێی بۆ کورد خوڵقاند، جەمسەری تێوەگلانی ئەو دوو ئیمپراتۆریەتە لە کوردستاندا دەگەیشتەوە یەکتر، میرو سەرۆك هۆزەکانی کورد لە نێوان ئەو دوو ئیمبراتۆریەتەدا وەکو هێزی سێهەم قووتبوبوونەوە، قورسایی دەسەڵاتدارانی لۆکاڵی کورد لە کێشەکانی نێوانیاندا یەکجار گرنگ‌و چارەنووسسازبوو، هیچ لایەکیان پێیاننەدەکرا بەسەر کورددا بازدەن، دەبوو

---

[1] ارشاك سافراستيان: الكرد وكردستان، ترجمة، الدكتور احمد محمود الخليل، ط٢، السليمانية، ٢٠٠٨، ص٧٩

لەگـەڵ مـیرو سـەرۆکەکانیدا پێکبـێن یـا بـە شـەڕ ملکەچـیان بکـەن[1]، ئـەم مەسەلەیەش لە دۆخێکدا هاتەکایەوە، کە سوڵتان سـەلیمی یەکـەم ( ١٥١٢ – ١٥٢٠) هاتـە سـەر تـەختی دەسـەڵاتی دەوڵـەتی عوسمـانی. سـەردەمی ئـەم حوکمڕانە سەرەتای وەرچەرخان بوو لـە سیاسـەتی عوسمانیـدا، ئەو کاتـەی بڕیاریـدا ڕوو لـە ڕۆژهـەڵات بکـات، لـەم کاتـەدابوو هێـزو لەشـکری شـا ئیسماعیلی سەفەوی بەرەو ڕۆژئاواو ئاسیای بچووك (ئەنادۆڵ) لـە گەرمـەی پەلامارەکانیدا بوو، لە کۆتاییدا لـە (٢٣ی ئابی ١٥١٤) لـە دۆڵـی چاڵدێران[2] شـەڕ لـە نێوانیانـدا هەڵگیرسـا، لـە ئەنجامـدا قزڵباشـەکان تێکـشکانو شـا ئیسماعیل بە برینداری هەڵهاتو (تەورێز)ی پایتەختی جێهێشت[3].

سەرکەوتنی عوسمانییـەکان لـە چاڵدیراندا خاڵی وەرچـەرخانێکی کرنگـە لـە مێـژووی نـوێی میرایـەتیو عەشـیرەتەکانی کـورددا[4]، چونکە ڕاسـتەوخۆ پـاش ئـەم شـەڕە، سـوڵتان سەلیـمی یەکـەم وەك بڵێـی هەسـتی بـە گرنگـیو قورسـایی هێـزی عەشـیرەتەکانی کـورد کردبـوو، هەڵسا زانـاو مێژوونووسـی ناسـراوی کـورد (ئیدریـسی بەدلیـسی) ڕاسـپارد، بـۆ ئـەوەی مـیرو سـەرۆك

---

[1] حسین مەدەنی: کوردستانو ستراتیژی دەوڵەتان، ب١، هەولێر، ٢٠٠٩، ل٩٣

[2] چاڵدیران: نێوی ئەو دۆڵەیە کە شەڕەکەی تیا بەرپابوو، دەکەوێتە باکوری ڕۆژهـەڵاتی تەورێز. شایەنی ئاماژە بۆ کردنە جەنگاوەرانی کورد ڕۆڵی جەوهـەرییان لەسـەرکەوتنی عوسمانی لەم شەرەدا گێڕا، بڕێکی زۆریان وەك تۆڵەیەك بۆ زوڵـمو ستەمی قزڵباشـەکان، ریزەکانی سوپای سەفەویان چۆڵکردو چوونە نێو سوپای عوسمانی. بڕوانە د. حسن کریم الجاف: الوجیز في تاریخ ایران دراسة في التاریخ السیاسي من ظهور الدولة الصفویة الی نهایة الدولة القاجاریة، ج٣، ط١، اربیل٢٠٠٨، ص٢٢.

[3] ن.لازاریف: میژووی کوردستان، و.وشیار عەبدوڵڵا سـەنگاوی، چاپخانەی ڕۆژهـەلات، هەولێر، ٢٠٠٨، ل١٣٢.

[4] ارشاك سافراستیان: المصدر السابق، ص ٨٠.

عەشـیرەتەکانی کوردسـتان بـەلای دەسـەڵاتی عوسمانیـدا رابکێـشێت. بەدلیـسی پێـشتر لـە بارەگـای دەوڵـەتی ئـاق قۆینلـۆدا پـێش ئـەوەی سـەفەوییەکان بیخەنـە ژێـر رکێفی خۆیـان، وەك نووسـەرێك کـاری کـردووە، پـاش شـەڕی چـاڵدێرانیش لـە چوارچـێوەی دەوڵـەتی عوسمانیـدا ڕاژەی کردووە. لە کۆی هەوڵەکانیدا بەدلیسی توانی (٢٥) لە میرەکانی کورد لەوانە میرەکانی جەزیرەی ئیبنو عومەر (بۆتان)و حەسەنکیف و سعرد و بەتلیس و خێزان، بەلای دەوڵەتی عوسمانیدا ڕابکێشێت و بیانکاتە دۆست و لایەنگری عوسمانی، دواتریش توانی بۆ ئەو مەبەستە حاکمی سۆران (میر سەیدی کوڕی شاعەلی) ببینێت، لـە کۆتاییـدا ئەویـشی کـردە لایـەنگری سـوڵتان و دەسـتبەجێ رزگـارکردنی هـەرێمی ئـەربیل (هـەولێر)ی پێـسپارد. هـەروەها توانی (میر سەیفەدینی) حاکمی ئامێدی و کورەکەی (میر سوڵتان حوسێن) بکاتـە لایـەنگری عوسمانیـەکان[1]، ئەمـە پـاش ئـەوەی بەدلیـسی چـەند دانووسـتانێکی لەگـەڵ میرەکـانی موکریـان، برادۆسـت، بابـان، سـۆران و ئەوانـەی کـە دەبـوو هاوکـاری هێزەکـانی عوسمـانی لـە ناوچـەی ئورومییـە بکەن، هەروەها سەردانی (ئامێدی، جەزیرە و بەدلیس)ی کرد[2]، دواتریش لەسـەر چـەند بنەمایـەك لـە گـەڵیان رێککـەوت، کـە پێکهـاتبوو لـە: پاراستنی سەربەخۆیی و ئازادی میرایەتییەکانی کورد، لە چوارچێوەی میرایەتییـەکانی خۆیانـدا بـەپێی داب و نـەریتی دێرینیـان لـە حوکمڕانیکردن بـەردەوامبن، بـۆ ئـەو مەبەسـتەش فرمـانی سـوڵتانی دەربـچێت، لـە سـەرجەم شـەڕەکانی عوسمانیـدا کـورد بەشـدار بێـت، ساڵانە بـاج و خـەراج بـدەن بـە گەنجینـەی

---

[1] فاضل بيات: دراسات في تاريخ العرب في العهد العثماني، رؤية جديدة في ضوء الوثائق و المصادر العثمانية، دار المدار الاسلامي، بيروت، ٢٠٠٣، ص ص١٩- ٢٠

[2] ن.لازاريف: سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٥.

دەوڵەت، لە ئاست ئەم هەموو هەڵوێستو ئەرکەشدا، عوسمانییەکان کورد لە هەڕەشە دەرەکییەکان بپارێزن[1].

میرو سەرۆکەکانی کورد تەنها بە لایەنگریکردنی عوسمانییەکان نەوەستان، بەڵکو بۆ نەهێشتنی حوکمڕانی سەفەوی لە هەرێمەکەیاندا، چالاکانە کەوتنە جموجۆڵ، بۆ وێنە حاکمی بۆختی (بۆتان) توانی جەزیرەو موسڵ لەژێردەستی سەفەوییەکان دەربهێنێ، هەروەها (سەید بەگی) حاکمی سۆران خاکی هەولێرو کەرکوکی لە سەفەوییەکان سەندەوەو بەناوی سوڵتانەوە خوتبەکانی دەوتەوە[2]، بە کورتی ڕکابەری عوسمانی سەفەوی لەسەر داگیرکردنی کوردستان بەهاوکاریو چاکەی بەدلیسی لە کۆتایدا بە سەرکەوتنی عوسمانییەکان شکایەوەو کۆتایی هات، بەم بۆنەیەوە سوڵتان لە ڕێگەی خودی (بەدلیسی)یەوە خەلاتو ئالای بۆ میرەکانی کورد هەنارد، هەرچی (بەدلیسی)ش بوو، کارو چالاکییەکانی لای دەسەلاتدارانی عوسمانی جێگەی ستایشو خەلاتکردن بوون[3].

ئەگەرچی لەم قۆناغەدا ئاماژە بۆ چەند میرایەتیو مەڵبەندێکی باشووری کوردستان دەکرێت، گوایە کەوتوونەتە بازنەی دەسەلاتو هەژموونی عوسمانی لەوانە میرایەتی (سۆران، بادینان، شاری هەولێر، کەرکوکو شەنگال). بەلام لە میانەی توێژینەوە بەڵگەنامەییەکانەوە (وثائقي) ئەوە

---

[1] محەمەد ئەمین زەکی: خولاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان، ب١-٢، چ٢ ، سلیمانی، ٢٠٠٤، ل١٢٢.

[2] فاضل بيات: دراسات فى تاريخ العرب فى العهد العثماني، ص٢٠.

[3] شەمسی محەمەد ئیسکەندەر: مێژووی کورد لە سەدەی ١٦ هەمدا، و. شوکور مستەفا ،چ١، هەولیر، ١٩٩٨، ل٧٥.

دەردەکەوێت، کە دەسەلاتی عوسمانیو دابەشکردنە کارگێڕییەکانی لەدوای کۆتایی شەڕی چالدێران زیاتر ناوچەکانی کوردستانی باکووری گرتۆتەوە. بۆ وێنە: لە دەفتەر تەحریری[1] ژمارە (٦٤)ی ساڵی (١٥١٨)و ژمارە (٩٩٨)ی ساڵی (١٥٣٠)دا، لە شارو شارۆچکەکانی باشووری کوردستان، لە چوارچێوەی ئەو دوانزدە سەنجەق- لیوای، ویلایەتی کوردستان- دیاربەکری لێپێکهێنرابوو، بە تەنها ناوی شەنگال هەیە[2].

عوسمانییەکان لە قۆناغی یەکەمی هاتنیاندا، گۆڕانێك کە شایستەی ئاماژەپێکردن بێت، لە دۆخی کارگێڕی هەرێمەکەدا ئەنجامیاننەداوە، بەتایبەت ئەوانەی لە لایەن سەرکردە لۆکاڵییەکانەوە بەڕێوەدەبران[3]. لەراستیدا مانەوەی ئەو ناوچانە لەژێر هەژموونی دەوڵەتی عوسمانیدا بەندبوو بە گەیشتنی سوپای دەوڵەتی نێوبراو بۆ ناوچەکە، ئەمەش کارێك بوو کە لە سەردەمی سوڵتان سەلیمی یەکەمدا ڕوویندا، چونکە دوای کشانەوەی سوپای عوسمانی لە (تەورێز)، سەفەوییەکان سەرلەنوێ ناوچەکانی باکوری ڕۆژهەلاتی عێراق (باشووری کوردستان)یان گرتەوە[4].

---

[1] دەفتەر تەحریر: دەفتەری کێومالکردنو سەرژمێری دانیشتوانە، بە مەبەستی سەپاندنی باج بەسەریاندا، ئەم پرۆسەیە زۆرجار لەمیانی خەملاندنەوە ئەنجام دەدرا. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەم دەفتەرانەو جۆرەکانو ڕێکخستنی ئەنجامی ئەو زانیارییانەی لە پرۆسەی کێومالکردنی زەویو دانیشتوانەکەی بەدەستدەهات، بڕوانە: خليل علي مراد: "دفاتر الطابو مصدرا لتاريخ البصرة الاقتصادي في مطلع العهد العثماني"، المؤرخ العربي، العدد ٣٩، السنة الخامسة عشر، ١٩٨٩، ص ص ٦٥-٧٥.

[2] فاضل بيات: دراسات في تاريخ العرب في العهد العثماني، ص ص٢٨-٢٩.

[3] المصدر نفسه، ص٢٩.

[4] المصدر نفسه، ص٢٨.

لـە قۆنـاغی دووەمـی هـاتنی عوسمانیـدا، واتـە پـاش دەسـتپێکردنی هەڵمەتەکەی[1] سولّتان سولەیمان قانونی (١٥٢٠-١٥٦٦) بۆ داگیرکردنی تەورێزو بەغداد لەساڵی ١٥٣٤زدا، ئیدی هەژموونو دەسەلاّتی عوسمانی بەسەر باشووری کوردستاندا، پێدەنێتە قۆناغێکی نوێ. سەرچاوەو بەڵگەنامەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە سولّتان سولەیمان پێش دەرچوونی لە بەغداد لە (١٧ی شەعبان ٩٤١ك-٢١ی شوباتی ١٥٣٥) لیوای تاوق-کەرکوك ( داقوق-کەرکوك)ی بە (حسێن بەگ) سپاردووە و شارۆچکەی شارەبانو گوندەکانی دەوروبەریشی سپاردۆتە (غازی خان) ناوێك[2]. دوای چوار مانگ مانەوەو رێکخستنی دۆخی کارگێری، سولّتان سولەیمان لە (٢ی نیسانی ١٥٣٥)دا (بەغداد)ی جێهێشتو بە تێپەرین بە ولاّتی کورداندا گەڕایەوە (تەورێز)[3].

---

[1] ئەم هەڵمەتەی سولّتان سولەیمان بەگەورەترینو درێژخایەنترین پرۆسەی سەربازی عوسمانییەکان دادەنرێت، کە لە رۆژهەلاّتی ئەم دەوڵەتەدا ئەنجام درابێت، ناوی "سفری عیراقین " لێنراوە، کە مەبەست لێی (عیراقی عەرەبیو عیراقی عەجەم)یە، هەرچی عیراقی عەجەمییە بریتییە: لە باکوورەوە ئازربایجان، (کوردستانو خوزستان)یش لە رۆژئاواوە، هەرێمی فارس لە باشوورو (بیابانو گەیلان)یش لە رۆژهەلاّتەوە، لە گرنگترین شارەکانی (ئەسفەهان، قەزوین، سولّتانیە...هتد). بڕوانە، هەمان سەرچاوە، ص٣٠.

[2] فاضل بيات: دراسات فی تاريخ العرب فی العهد العثماني، ص٤٣.

[3] محمد فريد بك المحامي: تاريخ الدولة العلية العثمانية، تحقيق: احسان حقي، دار النفائس، ط١٠، بيروت، ٢٠٠٦، ص٢٢٣ .

به گوێرەی گێڕانەوەکانی مەتراقچی نەسووح.[1] سوڵتانی نێوبراو دوای ئەوەی گۆپتەپە (هەڵبەتە مەبەستی گۆپتەپەی نزیك ئاغجەلەرە) کردۆتە بارەگای سەربازی خۆی، لەوێوە قەڵا بەرزو سەختەکانی باشووری کوردستان لەوانە: حەران (هیران یا هۆرین)، شەمێران، سرووچك، زەڵم... هتد، کە سەر بە میرایەتی ئەردەڵان بوون، هەروەها پاش کوشتنی (میر عیزەدین)ی میری سۆران بە (فێڵ و تەڵەکەبازی) سەرجەمی ئەو قەڵایانەی لەژێر دەسەڵاتی ئەودابوون لەوانە: ئالتون کۆپری، ئەرویل (هەولێر)، شەقلان (شەقڵاوە) خستۆتەژێر هەژموونو دەسەڵاتی عوسمانی[2]. هەر لەو ماوەیەشدا هەندێ (میر)و سەرۆك عەشیرەتە نێودارەکانی ناوچەکە لایەنگری خۆیان بۆ دەوڵەتی عوسمانی دووپاتکردەوە[3]، لەوانە میری میرنشینی ئەردەڵان بیگە بەگ کوڕی مەئموون بەگ[4]، بۆ چاودێریکردنی ئاپۆڕەی

---

[1] نەسووح کوڕی عەبدوڵلا قەرەگوونز، ناسراو بە مەتراقچی زادە، مێژوونووسو گەشتەوار، بە بنەچە بۆسنەیی بووو هاوڕێی سەرجەم هەڵمەتە سەربازییە زۆرو زەوەندەکانی سولەیمان قانوونی بووە، ئەم پیاوە لەکتێبێکدا بەوێنەوە، وەسفێکی وردی سەرجەم ئەو شوێنانەی کردووە کە سولەیمانو لەشکرەکەی لە هەڵمەتەکەی ساڵی(١٥٣٤-١٥٣٥) پیا تێپەریون، لەم چوارچێوەشدا وەسفێکی وردی رێگەو شاخو شارۆچکەو شەڕەکانی سولەیمان کەلە ناوچەکانی کوردستاندا ئەنجامی داوە، کردووەو هەڵوێستی میرەکانی کوردی لە هەڵمەتەکەی سوڵتان خستۆتەڕوو.بڕوانە: عماد عبدالسلام رؤوف، دراسات وثائقية في تاريخ الكرد الحديث و حضارتهم، ط١، اربيل، ٢٠٠٨، ص ص٢٥-٣٤.

[2] المصدر نفسه، ص ص٢٨-٣١; عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين، ج٤، ص ص٤٠-٤١.

[3] فاضل بيات: دراسات في تاريخ العرب في العهد العثماني، ص٤٤.

[4]مذكرات مامون بك بن بيكة بك: ت. محمد جميل الروژبياني و شكور مصطفى، مطبعة المجمع العلمي العراقي، بغداد، ١٩٨٠، ص٢٥.

لەشکری ئێرانیش لە ناوچەکە، سوڵتان سولەیمان پشتی بەستووە بە هێزی (بەهرام بەگ)ی کوڕی (میر حوسێن)ی ئامێدی [1]، ئەو میرەی بە گوێرەی شەرەفنامە هیچ یەك لە کاربەدەستانی کورد هێندەی ئەو ڕێزو پێزانییان لە لایەن سوڵتانی عوسمانییەوە لێنەگیراوە[2]. بێگومان ئەمە ئەوە دەسەلمێنێت کە هەر لە سەرەتاوە میرایەتی ئامێدی پاڵپشتو دڵسۆزی عوسمانییەکان بوون.

لە سەرچاوەیەکدا کە دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژگاری سوڵتان (سولەیمان قانونی)، ئەویش لیستەکەی (موستەفای کوڕی جەلال تەوقیعی)یە، ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە کە زۆرینەی ناوچەکانی باشووری کوردستان، لە چوارچێوەی (ویلایەتی لوڕستان)دا بووە، لەوانە: موسڵ، ئەربیل (هەولێر)، زەنگی ئاباد، کەرکوك، جەسسان، حەریر (هەریر)و دوین، درتەنگ، درنە، سندی سلێمانی (زاخۆ)، بابان، رومی، خفتی، زنجیرە، کرند، قەڵای سووریچك، بەرید، شاە رخ، جەنگیزخان، کلاس. هەرچی "ئامێدیو سنجار" بوو خرابوونە چوارچێوەی ئەیالەتی کوردستان -دیاربەکر[3].

هەرچی "فاضل بیات" کە بە پشتبەستن بە بەڵگەنامەکانی عوسمانی لەم مەسەلەیەی کۆڵیوەتەوە، ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە لە ساڵی (١٥٥١)دا، دوای ئەوەی تەواوی ناوچەکە ملکەچی دەسەڵاتی عوسمانییەکان بوون،

---

[1] عماد عبدالسلام رؤوف: دراسات وثائقية في تاريخ الكرد الحديث و حضارتهم، ص٣٢.

[2] شەرەفخانی بەدلیسی: شەرەفنامەو مێژووی ماڵە میرانی کوردستان،و. هەژار، چ٣، هەولێر٢٠٠٦، ل١٦٤.

[3] خليل ساحلي اوغلي: من تاريخ الاقطار العربية في العهد العثماني: بحوث و وثائق وقوانين، اسطنبول، ٢٠٠٠، ص٥٠٦.

ویلایـەتی لوڕسـتان پێکهێنـراوە، یەکـەمین هێماکـان بـۆ ئـەم ویلایەتـە لـە (دەفتەری ژمارە ١٤٥٢)[1] دەبینرێت، بەگوێرەی زانیارییەکانی ئەم دەفتـەرە، پێدەچێ کاروبارەکانی ئەم ویلایەتە بە میری میرانی بەغداد سپێردرابێت، هەرچی ویلایەتەکەیە لەم "سنجق-لیوا"یانەی لای خوارەوە پیکهاتووە: هاروونیة، بیرە وکرند، حوریدە، زەنگنە، شەهرەزول (شارەزوور)، چنکۆلە، باجوانلو، خورماتوو (بە خورماتووش هاتووە)، شەهر عەنبەر، عەشیرەت حاجی شێخ.[2]

بێگومان وەك دەبینین، لە ناوهێنانی لیواکانی ویلایەتەکەدا جیاوازییەکی زۆر لـە نێـوان لیـستەکەی (موسـتەفای کـوری جـەلال تـەوقیعی)و ئـەو بەڵگەنامەدا هەیە کە (فاضل بیات)ی هێمای بۆ کردووە، لە نێوان ئەم دوو بۆچوونە جیاوازەدا، بە بڕوای من پێویستە پشت بە (فاضل بیات)ی ببەستین، چونکە نێوبراو توێژینەوەکەی بەڵگەنامەییەو بۆ دەستنیشانکردنی پێکهاتەی کارگێڕی ناوچەکە لە سەردەمی عوسمانیدا گەڕاوەتەوە بۆ دەفتەر دامەزراندنو بەڵگەنامەکانی ئەو ڕۆژگارە.

بەڵام وەك دەردەکەوێت زۆرنابات ویلایەتی لوڕستان هەڵدەوشێتەوەو ویلایەتێکی نوێ بە ناوی (شەهرەزول-شارەزوور) جێگەی گرتۆتەوە، کە

---

[1] مەبەست دەفتەر دامەزراندنەکانە، ئەوانەی زانیاری لەبارەی ویلایەتەکانی عوسمانیەوە تێدایە، بەتایبەت لیستی دامەزراندنەکان و فۆرمی ئیدارەو هەندێ زانیاری جوگرافی و... هتد.

[2] الدولة العثمانية في المجال العربي، دراسة تاريخية في الاوضاع الادارية في ضوء الوثائق والمصادر العثمانية حصرا(مطلع العهد العثماني-اواسط القرن التاسع عشر)، ط١، بيروت-مركز دراسات الوحدة العربية، ٢٠٠٧، ص ص ٣٦٠-٣٦١.

عوسمانیەکان (بەربەر موراد بەگی ئەرنائوود)یان وەك یەکەم لێپرسراوی دەوڵەت لەسەر داناوە[1]، ساڵی پێکهێنانی ئەم ویلایەتەش تائێستا بەدیاریکراوی نەزانراوە، ئەوەی دیارە ئەم ویلایەتە لە نێوان تشرینی دووەمی ساڵی (١٥٦٠) بۆ ئەیلولی ساڵی (١٥٦٤) پێکهێنراوە، لە نووسراوێکدا کە لە (٢ی تشرینی دووەمی (١٥٦٠) ئاراستەی بەگلەربەگی[2] بەغداد کراوە، ئەوە ڕووندەبێتەوە کە لیوای (پاوە و باسکە) سەر بە ویلایەتی بەغدایە، کەچی دواتر ئەم دوو لیوایە لە چوارچێوەی ویلایەتی شارەزوردا ناویان هاتووە، لە (دەفتەر دامەزراندنی (٢٢ی نیسانی ١٥٦٠)دا وەك سەنجەقێك سەر بە ویلایەتی بەغداد ئاماژە بۆ شارەزوور کراوە، بەڵام لە (١٣ی ئەیلولی ١٥٦٣)دا فەرمانێك ئاراستەی میری میرانی شارەزوور کراوە، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت لەو ماوەیەدا شارەزوور ئەیالەت بووە[3] یەکەمین دەفتەر زانیاری کە باس لە دابەشکردنە ئیدارییەکانی ئەم ویلایەتە دەکات، دەفتەر فرمانی دارایی ژمارە (٥٦٣)ی ساڵانی (١٥٦٨-١٥٧٤)، بەپێی زانیارییەکانی ئەم دەفتەرە ویلایەتی شارەزوور، لەم سەنجەق-لیوانەی لای خوارەوە پێکهاتبوو:

(شەهرەزول= شارەزوور)، سروچك، زەنگنە، هاوار، ئۆلکای بابان (واتە ئوجاقلقی بابان)[4]، کەشاف، کلاش والانی، چنار دویسر، باجوانلو، هەزار مێرد، دولخۆران (دولقران)، مزکاوە، تیل وطاری، کلاس، سبهرانجین،

---

[1] المصدر نفسه، ص٤٩ ; مذكرات مامون بك بن بيكه بك، ص٨٠.

[2] میری میران.

[3] فاضل بيات: الدولة العثمانية فى المجال العربي، ص٣٦٠.

[4] لە لاپەرەکانی دواتردا ئەم چەمکە ڕوون دەکەینەوە.

ئـەبروما"هـەورامان"، باسـكە، داوران"داودان"، هـورون"هـۆرین" ئەحمـەد بەگ، برند، قەڵای غازی، جغان كدوكو"كدودكی"، كوی، ئوشنی"شنۆ")[1]

شایەنی ئاماژەپێدانە، لـە سـەرووبەندی هـاتنی عوسمانیەكانـدا ناوچـەی شارەزوور، چەندین بنەماڵەی خانەدانی لۆكاڵی تێدابوو، كە بەسـەر ناوچـە پـانو بەرینەكەیدا بڵاوببوونـەوە، سـەرباری ملكەچبوونی ئـەم بنەماڵانـە بـۆ دەوڵەتی عوسمانیو بە فـەرمی ناسـاندنی هـەژموونو باڵادەستی دەوڵـەتی نێـوبراو بـۆ سـەر "شـارەزوورو قـەرەداغو شـاربازێڕ" لـە رێككەوتنامـەی "ئەماسـیە"ی سـاڵی (١٥٥٥) [2] بـەڵام ئـەم بنەماڵـە خانەدانـە لۆكاڵییانـە، بەردەوام لـەژێر كـارتێكردنی ئاكامی پەیوەندییە ئاڵۆزەكـانی نێـوان هـەردوو دەوڵـەتی عوسمـانیو سـەفەویدا بـوون، هەنـدێ لـە میرو خانەدانـەكانیان بـە تایبـەت ئەوانـەی كەوتبوونـە سـنوری نێـوان هـەردوو دەوڵـەت، زۆرجـار ناچـاردەبوون بـۆ چەسـپاندنی دەسـەڵاتو بـۆ دابینكردنـی بەرژەوەندییـەكانیان، دڵـسۆزی خۆیـان بـۆ لایـەنێكی باڵادەسـت بەسـەر ناوچەكەدا رابگەیەنن.

لە چوارچێوەی ئەو هەلو مەرجەدا، میرایـەتی بابـان لـە تـەواوی سـەدەی شانزدەو (سەدەكانی دواتریشدا)، لەم دەربارەوە بۆ ئەو دەربـار هاتووچۆی

---

[1] فاضل بيات: الدولة العثمانية فى المجال العربي، ص ص٣٦٢-٣٦٣.

[2] نەوشیروان موستەفا ئەمین: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٩.

بوو.[1] بەهەمان شێوە میرایەتی ئەردەڵانیش، کەوتبووە نێو هەمان دۆخی جێگۆڕکێ و دەربارگۆڕینەوەوە[2].

لە ئاست ئەم دۆخەدا دەوڵەتی عوسمانی ناچاردەبوو، ماوەیەك جارێ لە ڕووی بەڕێوەبردنەوە چاو بەرێکخستنەوەی ناوچەکەدا بگێڕێتەوە، لەو چوارچێوەشدا هەوڵیانداوە لە هەندی لە ناوچەو لیواکانی شارەزوور ویلایەتێکی نوێ بەنێوی (پڵنگان) پێکبهێنن، بۆ ئەو مەبەستە لە (٢٣ی رەجەبی ٩٩١-٢ی ئابی ١٥٨٣) فرمانێکی سوڵتانی دەرچووە، تێیدا هاتووە: ناوچەی پڵنگان ناوچەیەکی سنوورییەو لە هەموو ڕووەکانەوە گونجاوە بکرێتە بەگلەربەگییەکی (ویلایەتێکی) سەربەخۆ، بۆ سەرخستنی پرۆژەکەش کۆمەڵێك ڕێوشوێنیان گرتۆتەبەر لەوانە دەستنیشانکردنی ئەو ناوچانەی دەبوو بخرێنە بازنەی ویلایەتی نوێ، کە ئەوانیش بریتیبوون لە: (باسکە، پاوە، کمرەکورەکوز، کلاس، قەڵای قزلچە، اورامان (هەورامان)، داودان، مهروان، جغان، بانە). بەڵام دواتر لە دەفتەر دامەزراندنەکاندا هیچ زانیارییەك سەبارەت بەم ویلایەتە پێشنیارکراوە نابینین، بۆیە پێدەچێت هەڵوەشێندرابێتەوەو سەرلەنوێ لیواکانی لکێندرابن بە ویلایەتی شارەزورەوە، چونکە پاشتر ناوەکانیان لە چوارچێوەی ئەم ویلایەتەدا دەبینین[3].

---

[1] ی.ئی. ڤاسیلییڤا: شەرەفخانی بەدلیسی سەردەم، ژیان، نەمری، و. د.ئارام عەلی، چ١، سلیمانی ٢٠٠٨، ل٤١.

[2] بروانە: میر شەرەفخانی بەدلیسی: سەرچاوەی پێشوو، ل ل١٤١-١٤٢. مەستورەی کوردستانی، مێژووی ئەردەڵان، و. هەژاری موکریانی، چ١، هەولیر٢٠٠٢، ل ل٤٧-٧٨.

[3] فاضل بيات: الدولة العثمانية في المجال العربي، ص ص٣٦٧-٣٦٨.

عوسمانییەکان، بەهۆی ئاڵۆزی ناوچەکە لەڕووی جوگرافییەوەو بۆ ئەوەی بەلای سەفەوییەکاندا نەڕۆن و هەمیشە سوود لە توانا جەنگییەکانیان وەربگرێت و بۆ بەکارهێنانیان لە سەپاندنی ئارامی ویلایەتە نزیکەکانی تری عوسمانیدا، زۆر جار کاریان بۆ رازیکردن و ڕاکێشانی عەشیرەتەکانی کورد دەکرد، لەو چوارچێوەشدا دەوڵەتی عوسمانی لە سیستمی کارگێڕی خۆیدا بە گشتی (وەك لە خوارەوە ڕوونیدەکەینەوە)، شێوازی حوکمڕانیکردنی ناوەندیی ڕەهای جێبەجێنەدەکرد، بە پێچەوانەوە هەر عەشیرەتەو بە گوێرەی سەنگ و قورسایی لە ناوچەکەی خۆیدا ڕۆڵی پێدەبەخشین، سەبارەت بە عەشیرەتە گەورەکانیش تێکڕایان لە چوارچێوەی (سەنجق-لیوا)دا ڕێکخران و سەرۆکەکانیشیان وەك میر سنجەق ناساند، هەرچی عەشیرەتە بچووکەکانە پلەیەکی خوارتر لە (سەنجق)ی پێدەدان، بەم چەشنە ناوچەو عەشیرەتەکانیان کەوتە دەرەوەی دابەشکردنی کارگێڕیی ویلایەتی شارەزوور کە لە ناوچەکەدا پێکهێنرا [1].

لێرەوە فۆرمی حوکمڕانی ناڕاستەوخۆی عوسمانی لە کوردستاندا لەم (سێ) فۆرمەی خوارەوەدا دەرکەوتن :

ا- حکومەتە کوردییە خاوەن ئۆتۆنۆمیەکان (کورد حکومەتی)، کە لە لایەن بنەماڵەیەکی خانەدانەوە بە میراتگەری بەڕێوەدەبران، لەم شێوازە حوکمڕانییەدا سەرجەم داهاتی ناوچەکە دەڕژایە گەنجینەی بنەماڵەی حوکمڕانەوە، تەنها ئەوە نەبێ میرەکە ساڵانە ڕێژەیەك پارەی ڕەوانەی ئەستەنبوڵ دەکرد، لە کاتی جەنگەکانی عوسمانیشدا هاوکاری سەربازی پێشکەش بە دەوڵەت دەکرد. لە راستیدا ئەم حکومەتانە خاوەن ئەوپەڕی

---

[1] المصدر السابق، ص ص٣٥٩-٣٦٠.

ئۆتۆنـۆمی بـوون[1] بـۆ وێنــه میرایــەتی (عەمادیــە- ئامێـدی)، لــه دەفتــەر تەحریری ژماره (٩٩٨)ی ساڵی (١٥٣٠)دا ناوی نەهاتووه، چونکه له دۆخی حکومەتـدا بـووه و پرۆسـەی کێومـاڵکردن‌و سـەرژمێری بـۆ وەرگرتنـی بـاج نەیگرتۆتـەوه،[2] لـەو ماوەیـەدا ئـەم حکومەتـە لـە چوارچـێوەی ئەیالـەتی کوردستان (دیاربەکر)دا بووه، پاشتریش له دەفتەری دامەزراندنەکانی ژماره (٢٢٦و ٦٠٩٥) نێوان ساڵانی (١٦٣١-١٦٤٢)، ژماره (١٥٥١) نێوان ساڵانی (١٦٨٧-١٧٠٢) هەروەها نێوان ساڵانی (١٧٠٠-١٧٤٠)دا، له چوارچێوەی ویلایەتی بەغدا، لەگەڵ حکومەتی سەهران (سۆران) ناوی هاتووه[3]، هەرچی (میرایـەتی بابـان)ه لـه دەفتـەری ژمـاره (١٤٥٢)ی سـاڵی (١٥٤٩-١٥٥١)دا لـه چوارچـێوەی ویلایـەتی بەغـدادا وەك (ولأتـی بابـان) ئامـاژەی بـۆ كـراوه [4]، دواتریش ئەگەرچی بابـان لـه دەفتـەر دامەزراندنەکانـدا وەك حکومـەت نـاوی نـەهاتووه، بـەلأم وەك ئاشـكرایه ئـەم میرایەتییـە وەك دیفاکتۆیـەك ئـەمری (واقیع)، تا هەڵوەشاندنەوەی میرایەتیەکه بەدەستی عوسمانییەکان له ساڵی (١٨٥١)دا له دۆخی حکومەتدابووه.

ب- سەنجەقەکان/لیـوا، ئەوانـەی بـه شـێوازی (ئۆجاقلق)[5]بـەڕێوەدەبران، ئەم جۆره سەنجەقانه به میراتگەری‌و پشتاوپشت دەدرایه میرێکی لۆکاڵی یا

---

[1] Hakan Ozoglu, Kurdish Notables and Ottoman State, Albany-Sunny Press-2004, p.57

[2] فاضل بيات: دراسات في تاريخ العرب في العهد العثماني، ص٢٩.

[3] فاضل بيات: الدولة العثمانية في المجال العربي، ص ص٢٩٦-٣١٣.

[4] المصدر نفسه، ص٢٩٩.

[5]سنجق ئوجاقلق یـا یوردلـق ئوجاقلق، ئەکراد بەگلیگی"یـشیان پێدەگوت، کـه مانـای (موڵکی خانەدان) دەگەیەنێت. بڕوانه: مـارتن ڤـان برونـسەن: ئاغـا و شـێخ و دەوڵـەت، و. کوردۆ عەلی ، ب٢، سلیمانی،٢٠٠٣، ل٢٤

بنەماڵەیەکی خانەدان، جیاوازی لەگەڵ حکومەتەکاندا ئەوەبوو، ئەمان ئەرکی سەربازیو دارایی زیاتریان دەکەوتە ئەستۆ، وەك تێکرای سەنجەق/لیواکانی تری سەر بە ئەیالەتە ئاساییەکان وەك هێمایەك بۆ میرایەتییەکە، دەهۆڵو ئالایان هەبووە، تا لەژێرباری دڵسۆزی سوڵتانو دەوڵەتدا بوونایە، ناچار بە لابردن نەدەکران، لە دۆخێکدا ئەگەر ئەرکەکانیان بە دڵسۆزی جێبەجێنەکردایە یا گرفتێکیان بۆ دەوڵەت درووستبکردایە، یان بەهۆی مردنەوە، ئەوجا دەوڵەت یەکێك لە کوڕەکانی یا خزمێکی لە شوێنەکەی دادەنا[1].

بۆ وێنە، لە چوارچێوەی (ویلایەتی بەغداد)دا، لیوای (درنە) وەك لە دەفتەر دامەزراندنی ژمارە (٢٦٢)ی نێوان سالآنی (١٥٧٣-١٥٨٦)دا هاتووە، هەروەها (لیوای باجەلآن) وەك لە هەردوو دەفتەر دامەزراندنی ژمارە (٢٦٦و ٦٠٩٥)دا، بۆ نێوان سالآنی (١٦٣١-١٦٤٢) هاتووە، بە هەمان شێوە لیوای جەسسان-بەدرە لە نێوان سالآنی (١٧١٧-١٧٣٠)دا، تێکڕا بە شێوازی ئوجاقلق بەڕێوەدەبران[2]. لە چوارچێوەی (ویلایەتی شارەزوور)یشدا، وەك لە دەفتەری ژمارە (٢٦٢)دا هاتووە، لە نێوان سالآنی (١٥٧٤-١٥٨٨)دا گەلێ لیوا بەم شێوازە بەڕێوەدەبران، لەوانە: لیواکانی (پاوە، بابان، حەریرو دوین، زنجیر، قەلآی سوریچك، قەلآی غازی، قەلآی قزڵچە، ئەورامان (هەورامان، بانە)[3].

---

[1] فاضل بيات: دراسات في تاريخ العرب في العهد العثماني ، ص ص١٤٢-١٤٣ ; Ozoglu, op,cit, p.56

[2] بڕوانە: فاضل بيات، الدولة العثمانية في المجال العربي، ص ص٢٩٦-٣٠٨

[3] المصدر نفسه، ص٣٦٣-٣٦٨.

ج- میرانـــی عەشـــیرەت (مـــیر عـــشیرتلك) ئـــەو عەشـــیرەت و ســـەرۆك عەشیرەتانەی لە چوارچێوەی ئەم فۆرمە ئیدارییە عەشیرەتییەدا رێکخران، دەوڵـــەت دانـــی بـــە ســـەرۆکایەتیاندانا و لەســـەر عەشـــیرەتەکانی خۆیـــان هێـشتنیەوە. وەك لـە قانوننامەیەکـدا هـاتووە کـە لـە سـەردەمی سـولەیمان قانونیدا دەرچووە: ئەم میرانە عەشیرەت و فیوداڵەکانی خۆیان بەڕێوەدەبەن، لە کێشەو کاروباری نێو عەشیرەتەکانیشیاندا سەروەرو دادوەرن، بەڵام وەك میر سەنجەقەکانی تر (ئالاو دەهۆڵ)یان نییە، بەڵکو پلەی (زەعامەت)[1] یان هەیە، واتە لەڕووی پلەوە، لە دۆخی خوار میر سەنجەقەکاندان و لە هەڵمەتە سوڵتانییەکاندا لە سنووری سەنجەق-لیواکانی خۆیاندا بەشداردەبن، دوای مـردنیش، سـەروەری و پلـەو پایـەیان بـە کوڕانیـان دەبڕدرێـت، تـەنها لـە دۆخێکدا میرەکە وەچاخ کوێر بوایە، ئەوجا کەسێکیتر لە جێگەی دادەنرا، هەندێ جار ئەم عەشیرەتانە لـە چوارچێوەی سـەنجەقدا رێکدەخران، لەو دۆخەدا میر عەشیرەت دەبووە میری سەنجەقەکە[2]، (ئەولیا چەلەبی) گەڕۆکی عوسمانی کە لە ناوەراستەکانی سەدەی حەڤدەهەمدا سەردانی کوردستانی باشـووری کـردووە، هێمـای بـۆ ئـەوە کـردووە تـەنها لـە "ویلایـەتی

[1] لـە قانوننامـەدا، دوو، یـا سـێ، جـۆر موڵکانـەی دەستنیـشاندەکرد، (تیمـار) کـە دەسـتکەوتی سـالانەی لـە (٢٠) هـەزار ئاقـچە کـەمتر بـوو، (زەعامـەت) کـە دەسـتکەوتی سالانەی (٢٠هەزار تا ٩٩,٩٩٩) ئاقچە دەبوو، جۆرێکی جیاواز لەوانەش هەبوو(خاص)ی پێدەگوترا، ئەمە ئەو موڵکانە بوون کە دەدرانە کاربەدەستانی هێجگارگەورەی دەوڵەت (لەوانـە سـوڵتانەکان ومیری میران ومیر سـەنجەقەکان) داهـاتی سـالانەی لـە(١٠٠)هـەزار ئاقچە زیاتر بوو. بروانە: خلیل اینالچك، تاریخ الدولة العثمانیة من النشوء الی الانحدار، ت. محمد.م. الارناؤوط، دار المدار الاسلامي، ط٢، بیروت، ٢٠٠٢، ص ص٣٣٨-٣٤٣-٣٤٤.

[2] فاضل بیات: دراسات فی تاریخ العرب فی العهد العثماني ،ص١٥٠.

شارەزوور"دا، (١٠٠) لەم شێوازە میر عەشیرەتییانە هەبووە[1]. بۆ وێنە وەك لە دەفتەری دامەزراندنی ژمارە (٢٦٢٩)ی ساڵەكانی (١٥٧٤-١٥٨٨)دا، كە زانیاری وردی لە بارەی لیواكانی شارەزوورو شێوازە كارگێڕییەكەی تێدایە، ناوی ئەم لیوایانەی لای خوارەوە هەیە كە بە شێوەی میر عەشیرەتی بەڕێوەدەبران:

(كستانە، زەنگەنە، باسكە، ئۆشنی زرزا، حەریرودوین، برید، لاجان زرزا، كمرەكورە كوز، كلاس، مكری، داودان، دڵخوران، تیل وطاری، كوی‌و سنجاقلو، هوركت)[2] لیوای (میر عەشیرەتی باجەلان)یش وەك لە دەفتەری ژمارە (١٥٥١)دا هاتووە، لە نێوان ساڵانی(١٦٨٧-١٧٠٢) دا، لە چوارچێوەی ویلایەتی بەغدادا میر عەشیرەت بووە، بەڵام بە شێوازی (ئوجاقلق) بەڕێوەدەبرا، دواتر لە ساڵانی(١٧١٧-١٧٣٠)دا، تەنها لە شێوەی میر عەشیرەتیدا ناوی هاتووە[3].

وەك لە توێژینەوە بەڵگەنامەییەكاندا دەردەكەوێت، دەوڵەتی عوسمانی لە چەندین بۆنەدا، چ لە جەنگە زۆرو زەوەندەكانی لەگەڵ ئێران، چ بۆ جێگیركردنی ئاسایش‌و ئارامی لە ویلایەتەكانی (بەغداد، بەسرە، یا وڵاتی شام‌و ئەنادۆڵدا، وەك لە خوارەوە بە چەند نموونەیەك ئاماژەی بۆ دەكەین، بۆ سەركوتكردنی بزاڤە یاخیبووەكانی دژ بە دەوڵەت، كەڵكی لە تواناكانی حكومەت‌و میرانی عەشیرەتەكان بینیوە، لە چوارچێوەی هەوڵەكانی عوسمانیدا بۆ گێڕانەوەی ئارامی‌و سەقامگیری بۆ ناوچەكانی عیراقی ئەمڕۆ،

---

[1] محمد ظلي بن درويش اوليا جلبي: سياحتنامة، ج١، (اسطنبول-١٣١٤)، ص١٨٨.

[2] فاضل بيات: الدولة العثمانية فى المجال العربى، ص ص٣٦٣-٣٧٦.

[3] المصدر نفسه، ص ص٣١٠-٣١١.

هێزەکانی (ئامیدی، ویلایەتی شارەزوورو (دیاربەکر)، بە هاوکاری ڕۆڵەی عەشیرەتەکان، ڕۆڵی گرنگیان گێڕاوە. لە بەڵگەنامەیەکدا کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە ساڵی (٩٧٢ك-١٥٦٤) بە فەرمانێکی سوڵتانی داوا لە (سوڵتان حسێن)ی حاکمی ئامێدی، میری میرانی شارەزوورو دیاربەکر کراوە، بۆ بەرپەرچدانەوەی پەلاماری عەرەبە یاخیبووەکانی (**بەنو لام، قەشعەم، مونتەفیق و کەعب**) کە (ئیبن عەلیان) سەرکردایەتی دەکردن بە باشترین هێزو تەقەمەنی، هەرچی زووترە هاریکاریو پاڵپشتی ویلایەتی (بەسرە) بکەن[1]. شایەنی هێمابۆکردنە، بزاڤەکەی (ئیبن عەلیان) کە لە دەوروبەری (بەسرە) سەریهەڵدا، بە تایبەت لە ناوچەی ئەهوار، لە سەرکوتکردنیدا عوسمانییەکانی تووشی گەلێك دەردەسەری کرد.

پێدەچێت یاخیبوونەکەی (ئیبن عەلیان) درێژەی کێشابێت، وەك بەڵگەنامەکان ئاماژەی بۆ دەکەن، ساڵی ١٥٧٦ عوسمانییەکان بۆ سەرکوتکردنی یەکجارەکی بزاڤەکە سەرلەنوێ بە فەرمانێك داوا لە هێزەکانی ئامیدیو شارەزوورو دیاربەکرو تێکڕای میرەکانی کورد دەکەنەوە بەشداری لەو هەڵمەتەدا بکەن، کە بڕیاربوو لەو ماوەیەدا بکرێتە سەر یاخیبووەکان. پاشتریش، وەك بەڵگەنامەکان ئاشکرای دەکەن، دەسەڵاتدارانی عوسمانی بە هۆی ڕۆڵو زیرەکیی لە سەرکووتکردنەکەدا (میر حوسێن)ی میری ئامێدی خەڵات کردووە [2].

---

[1] وەرگیراوە لە:عماد عبدالسلام رؤوف: دراسات وثائقية في تاريخ الكرد الحديث و حضارتهم، ص١٧٧.

[2] وەرگیراوە لە: عماد عبدالسلام: دراسات وثائقية فی تاريخ الكرد الحديث و حضارتهم، ص ص١٩٢-١٩٦.

وەك لـە بەڵگەنامەكانـدا ديـارە عوسمانييـەكان بـۆ سـەركوتكردنی هـەر بزاڤێكـی دژە دەوڵـەت، هەميـشە پـەنايان بردۆتـە بـەر مـيرو عەشـيرەتەكانی كورد، ئەوەتانێ لە فەرمانێكی تـری سوڵتانيدا كە ساڵی (١١٠٧ك-١٦٩٥) دەرچووە، داوا لـە ميرميرانـی شـارەزورو مير (بەبە سلێمان)ی ليـوای بابـان و مـيری موسـڵ كـراوە، بـۆ لـە نـاودانی ياخيبوونەكـەی (شـێخ مـانيعی) مـيری مونتـەفيق كـە لـە دەورووبـەری بەسـرە سـەريهەڵداوە، هاوكـاری و ياريـدەی ويلايـەتی بەغداد بكـەن[1]. لـە ڕاستيدا دۆخـی حكومـەت و مـيرو سـەردارانی عەشيرەتەكانی كورد بەم چەشنە تا سەدەی نۆزدەهەم هـاتووە، لـەو نێوانـەدا عوسمانييەكان بۆ شەڕەكانيان بەتايبەت لەگەڵ ئێرانـدا، سـوودی زۆريـان لـە هاوكاری كورد ( ميرايەتی و عەشيرەتەكان) بينيووە.

بەسـتنی پەيماننامـەی زەهـاو لـە سـاڵی (١٦٣٩)دا، لـە نێـوان دەوڵـەتی عوسمانی و سـەفەويدا، ئارامی لـە پەيوەندييـەكانی نێوان هـەردوو دەوڵـەتی نێـوبراودا تـا سـاڵی (١٧٢٣) درووسـتكرد، لێـرەوە دەوڵـەتی عوسمـانی هەميشە لە ميانەی ويلايەتی بەغدادو هەندێ جاريش (ويلايـەتی موسـڵ)وە تێدەكۆشا دەسـەڵاتی خـۆی لـە ناوچەكەدا دووپاتبكاتـەوە. بـۆ وێنـە كـاتێ (حەسـەن پاشـا) كـە سـاڵ (١٧٠٤) بـووە والی بەغـداد، بـۆ چەسـپاندنی دەسـەڵاتی عوسمـانی لـە ناوچـەكە بەرنامەيـەكی نـوێی داڕشـت، بـۆ ئـەو مەبەسـتە پرۆژەيـەك كـە هـەڵگری گۆشـەنيگايەكی نـوێ بـوو بەرامبـەر پرسـە سياسـی و كارگێڕييـەكان لـە كوردسـتانی باشـوور، خـستە بـەردەم دەسـەڵاتدارانی عوسمـانی لـە ئەسـتەنبوڵ، تێيـدا جەختيكردۆتـەوە لـەوەی پێويستە ميرايەتييـە سـەربەخۆكانی باشـووری كوردسـتان بكرێنـە پاشـكۆی

[1] المصدر نفسه، ص ص١٩٧-١٩٨.

ئەیالـەتی بەغـداد[1]. عوسمانییـەکان بـەم پێـشنیارە قـایلبوون، لـە کۆتایـدا لەســەر ئــەوە ڕێککــەوتن سەرپەرشــتیکردنی میرایــەتیو عەشــیرەتەکانی باشووری کوردستان بدەنە دەست ویلایـەتی بەغداد، ئەمـەش مـافی (لادانو دانانی) میرەکانیانی لە ناوچەکە پێبەخشین، کـە بـە ڕێگەپێدانێکی فـەرمیی (بیورلْدی) لە پایتەختەوە ڕەوانەدەکرا[2]

بـەم چەشـنە بالأدەسـتیو هـەژموونی کـارگێڕیی ئەیالـەتی بەغداد بەسـەر تــەواوی میرایــەتی عەشــیرەتەکانی کــوردو ئــەو ناوچانەشــی راســتەوخۆ پابەنـدبوون بـە ویلایـەتی بەغدادەوە (دواتـر هـەردوو ویلایـەتی شـارەزوورو موسـڵ)یـش جێبـەجێبوو[3] هـەر بۆیـە بـە تایبـەت ویلایـەتی بەغـداد، بـۆ دەستەبەرکردنی دڵسۆزیو لایەندۆستی میرایەتییـەکانی کـورد لـە باشـووری کوردستان بۆ سوڵتانی عوسمـانی، دەبـوو هەمیشە سـازو ئامادەبێـت، بـەلأم لەگـەڵ ئەوەشـدا هـیچ یـەك لـە والییـەکانی بەغـداد نـەیانتوانی دەسـەلأتی ڕاسـتەوخۆ بەسـەر میرایـەتیو عەشـیرەتەکانی کـورددا بـسەپێننو هێـشتا لەســەر ئـەو بناغەیـەی سـولەیمانی قـانوونی داینـابوو کاروبارەکانیـان لـە ئەستۆی گەورەکانی خۆیاندابوو[4].

---

[1] جەلیلی جەلیل: سەرچاوەی پێشوو، ل٨٥.

[2] سـعدی عثمـان حسین: كوردسـتان الجنوبيـة في القـرنين الـسابع عـشر والثـامن عـشر، ص١٠٩.

[3] لە بارەی بالأدەستی ویلایەتی بەغدا بەسەر کوردستانی باشوورو هەردوو ویلایـەتی شـارەزوور و موسـڵ دا، بڕوانـە: سـعدی عثمـان حسین: كوردسـتان الجنوبيـة في القـرنين السابع عشر والثامن عشر، ص ص١٠٨-١٢٣.

[4] عبدالعزيز سليمان نوار: تاريخ العراق الحديث من نهاية حكم داود باشا الى نهاية حكم مدحت باشا، القاهرة، ١٩٦٨، ص ص٩-١٠.

له ساڵانی دواتریشدا، دەوڵەتی عوسمانی لە سۆنگەی بڕوابوونیەوە کە ویلایەتەکانی عێراقی ئەمڕۆ لەگەڵ ئێراندا هاوسنوورن‌و شوێن‌و پێگەیەکی هەستیاریان هەیەو ناکرێ گوشاری زۆر بخرێتە سەر والییەکانی[1]، دووری ئەو ویلایەتانە لە ئەستانەو مەترسی لە پچڕانی پەیوەندییەکانی نێوانیان[2]، هەروەها بەهۆی لاوازیی خودی دەوڵەت‌و پێداویستی بۆ هێزێك بتوانێت لایەندۆستی هەرێمە جیاجیاکانی سەڵتەنەتی بۆ دەستەبەربکات، ناچاربوون چاو لە مۆنۆپۆلکردنی مەمالیك بۆ دەسەلآت لە هەردوو ویلایەتی بەغدادو بەسرە بپۆشن، کە بێگومان ئەمە سەرەتایەك بوو بۆ دەستپێکی قۆناغێکی سیاسی نوێ نەك بەتەنها لەو دوو ویلایەتەدا، بەڵکو لە کوردستانی باشووریشدا[3].

مەمالیکەکان بە پەلامارو هێرشەکانیان[4] بۆ سەر میرایەتی‌وعەشیرەتەکانی باشووری کوردستان لای سوڵتانەکانی عوسمانی پێگەیەکی بەرزیان پەیداکرد، چونکە پێیانوابوو ئەوان باشترین کەسانێکن

---

[1] عبدالرزاق الحسني: تاريخ العراق السياسي الحديث، ج١، ط٧، بيروت، ٢٠٠٨، ص٤٠.

[2] جعفر الخياط: صور من تاريخ العراق في العصور المظلمة، ج١، ط١، بغداد، ١٩٧١، ص٢١.

[3] سعيد بشير اسكندر: قيام النظام الاماراتي فى كردستان و سقوطه، ص١١٣.

[4] بۆ زانینی وردەکارییەکانی ئەو هێرش و پەلامارانە بگەڕێرەوە بۆ: رسول حاوي الكركوكلي: دوحة الوزراء فى تاريخ وقائع بغداد الزوراء، ت. موسى كاظم نورس: منشورات الشريف الرضي، قم، ١٣١٣هـ، ص ص١١٦-٢٩٢ ; عباس العزاوي: تاريخ العراق بين احتلالين، ج٦، الدار العربية للموسوعات، د.ت، ص٣٥-٣٣٢ ; علاء موسى كاظم نورس: حكم المماليك في العراق ١٧٥٠-١٨٣١م، بغداد، دار الحرية للطباعة، ١٩٧٥، ص ص٣٠-١٠٦.

کـە بتــوانن مــیرە ســەربەخۆکانی کــورد ســزابدەنو ملکەچــی دەســەڵاتی حکومەتی عوسمانییان بکەن، لەڕاستیدا هێرشو پەلامارەکانی مەمالیك بە درێـژای زیـاد لـە (٨٠) هەشـتا سـاڵ حـوکمڕانی، کاریگـەریی کۆمەڵایـەتیو ئابووری نەرێی بۆ سەر باشووری کوردستان هەبوو، گـەڵ جوتیاری کوردی ناچارکرد کێڵگـەو مـەزراکانی خۆیـان جێبهـێڵن، دوای ئـەوەی وێراندەکرانو دەسووتێنران، لـە ترسـی هێرشـەکانی مـەمالیك گـەڵ عەشیرەت شـوێنەکانی خۆیان چۆڵکردو پـەنایان بۆ شـوێنە دوورەدەستەکان دەبرد[1]. بە دیـوێکی تــردا مەمالیکــەکان توانایــان نــەبوو کوردســتان کۆنترۆڵبکــەن، بۆیــە بــۆ ملکەچــکردنو مــسۆگەرکردنی لایەندۆســتی میرەکــانی کــورد (بەتایبــەت میرەکانی بابان)، ڕێبازێکی تەقلیدیان گرتەبەر، ئـەویش لێدانی میرێك بوو بەمیرێکی تر[2] هەروەها زوو زوو لادانو گۆڕینیان[3] ئەوەندەی پەیوەندی بە میرایـەتی بابانـەوە هەیـە، هەڵبـەت کـە هەڵوێـست گـۆڕینی خێـرا خێـرای حکومەتی عوسمانیو والییەکانی بەغداد، پەیوەندی بەو ململانێو شـەڕی دەسەڵاتەوە هەبوو، کە هەردوو دەوڵـەتی قاجاریو عوسمـانی بۆ هێنانـەدی بەرژەوەنـدیو ئامانجـەکانیان لەناوچـەکەدا پیادەیـان دەکـرد، لـەو میانـەدا دەسـتیان لــــە کاروبـاری ناوچـەکانی یـەکتر وەردەدا، بەتایبـەتی ناوچـە سنوورییەکانی نێوانیان[4].

---

[1] سعيد بشير اسكندر: قيام النظام الاماراتي في كردستان و سقوطه، ص ص١١٥–١١٦.

[2] عبدالعزيز سليمان نوار: تاريخ العراق الحديث، ص٢٦ .

[3] بڕوانە، نەوشیروان مستەفا ئەمین: سەرچاوەی پێشوو، ل ل٨٣–١٣١.

[4] محەمـەد حەمـە بـاقی، ئـەردەڵان– بابـان – سـۆران لەبەڵگەنامـەی قاجـاری دا ١٧٩٩–١٨٤٧، چ١، هەولێر، ٢٠٠٢، ل٧٨.

لـه دەسـتپێکی سـەدەی هەژدەیـەمو سـەرەتاکانی سـەدەی نۆزدەیەمـدا میرایەتیـەکانی باشـووری کوردسـتان بەشێوەیەکـــی پراکتیکیو دوور لـە دەسـەڵاتی عوسمـانی لـە سنووریکدا سـەربەخۆبوون، چونکە دووربیـان لـە دەسـەڵاتی ناوەنـد ئـەو دەرفەتـەی بۆ رەخسـاندن لـەو بارودۆخـە ناجێگیرەی (ناوخۆیی و دەرەکیی) کە دەوڵەتی عوسمانی پیادەرۆیشت، بە شێوەیەکـی نیمچە سەربەخۆ کاروبارەکانیان بەرێوەبەرن، بە چەشنێك کە میرو سەرۆك عەشیرەتەکانی کـورد لـە سنووری دەسەڵاتـی خۆیانـدا تاڕادەیـەك چییان بویـستایە ئـەنجامیان دەدا[1]، پەیوەندییـەکان لەگـەڵ ویلایـەتی بەغـداد دا تـەنها بـەناوبوو، تـەنها لـە کـاتی هەلمـەتو پـەلامارە سـەربازییەکانیاندا، تیپێکی سەربازیان پێشکەش بە والی دەکرد، لە بۆنەکانیشدا هەندێ دیاری گرانبـەهایان دەدانـێ، بەرامبـەر بـەوە میرەکـانی کـورد لـە بـاجو خـەراج بەخشرابوون[2] لە گرنگترین ئەو میرایەتیانەی لە باشووری کوردستان تا ئەو سەردەمە توانیبوویان بە ڕادەیەکی زۆر سەربەخۆیی خۆیان بپارێزن، ئەکرێ ئاماژە بۆ میرایەتییەکانی ( سۆران، بابـــانو بادینـــان) بکەین[3] .

دۆخـی نیمـچە سـەربەخۆبوونی میرایەتییـەکانی نێـو دەوڵـەتی عوسمـانی درێژەی نەبوو، ئەو گۆڕانکارییە گەورانەی دەوڵەتـەکانی ئـەوروپای گرتـەوە، دواتــر هەنــدێ لــە ســوڵتانە ڕیفۆرمخوازەکــانی عوسمــانی هێنایــە ســەر بیرکردنـــەوە لـــە ڕیفـــۆرمکردن، بەتایبـــەت دوای پێزانینـــی هەنـــدێکیان

---

[1] ن. لازاريف: المسألة الكردية ١٨٩١-١٩١٧، ت. اكبر احمد، ط١، السليمانية،٢٠٠١، ل ٤٦ ; ن.لازاريف، مێژووی کوردستان، ل ل١٧٤-١٧٥.

[2] جليل جليل وآخرون: الحركة الكردية في العصر الحديث، ت. عبدي حاجي، دار الرازي، ط١، لبنان، ١٩٩٢، ص١١.

[3] جەلیلی جەلیل، سەرچاوەی پیشوو، ل٨٣.

**بەحەقیقـەتی پاشەکـشیّو لاوازی دەوڵەتەکـەیان بـە بـەراورد لەگـەڵ ئـەو دەوڵەتانەدا، ئیدی لەوێوە ویستی سوودوەرگرتن لـەو دەزگایانـەی کە بوون بـــە بناغـــەی پێـــشکەوتن لای وڵاتـــانو گـــەلانی ئـــەوروپا، لای ســـوڵتانە ڕیفۆرمخوازەکان تا دەهات بەهێزو بەهێزتردەبوو[1]، لێرەوە هەنگاو هەڵگرتن بۆ ریفۆرم لای سوڵتان مەحموودی دووەم (١٨٠٨-١٨٣٩) چووە قۆناغێکی دیکەوە، کاتێك تەقەللای کرد دەسەلاّتی ناوەندی سەقامگیربکاتەوە[2]. یەك لـە خاڵـەکانی لـەم چوارچـێوەدا بریتـی بـوو لـە "هەڵوەشـاندنەوەی ئـەو میرنشینە دەرەبەگایەتییە میرایەتییە بەهێزانەی (سەردارانی دۆڵـەکان) کە نیشانەکانیان وەك رەعیەتێکی متمانە پێنەکراوی مەترسیدار تا دەهات زێتر دەبوو"[3].**

**لەراستیدا نەهێشتنی مەمالیكو لەنێوبردنیان لە بەغداد، بەدەستی عەلی رەزا پاشا ساڵی (١٨٣١)، لە هەمان کاتدا دەستپێکی نەهێشتنو لەنێودانی میرایەتییە کوردەکانی باشووری کوردستان بوو[4]، دواتر سوڵتان مەحموود وەك بەشـێك لـە ریفۆرمـەکانی ئیمپراتـۆری ڕوو لـە نـەمانی عوسمـانی، دەستیکرد بە سەپاندنو بەرینکردنی دەسەلاّتو حوکمی ناوەندیی بەسەر کوردستاندا[5]، بۆ ئەم مەبەسـتە ژەنـــەراڵ (محەممەد رەشید پاشا) کە**

---

[1] کارل بروکلمان: تاریخ الشعوب الاسلامیة، ت، نبیە امین فارس و منیر البعلبکي، ط١٤، دار العلم للملایین، ٢٠٠٠، ص٥٣٨.

[2] مارتن ڤان برونسەن: سەرچاوەی پێشوو، ب١، ل٦١

[3] وەدیـع جویـدە: جوڵانـەوەی نەتـەوەیی کـورد بنـەماو پەرەسـەندنی، و. یاسـین سەردەشتیی، چ١، سلیمانی، ٢٠٠٨، ل١٢٤.

[4] احمد عزت عبدالکریم وآخرون: تاریخ العالم العربی فی العصر الحدیث، القاهرة، د.ت، ص١٢.

[5] درك کینان: کوردو کوردستان، و. ئەبوبەکر خۆشناو، سلیمانی، ١٩٩٩، ل٢٩.

پێشتر والی سیواس بوو، کرایە نەخشەڕێژو ڕێکخەری ئەو شالاّوانەی کە دەبوو بکرێنە سەر کوردستان، عوسمانییەکان (میر محەممەد)ی میری سۆرانیان کردە یەکەمین ئامانجی ئاشکرای خۆیان[1] چونکە ئەم میرە پاش ئەوەی دژی دەسەلاّتی نێوەندی وەستایەوە، توانی دەسەلاّتی خۆی بەسەر بەشی هەرەزۆری باشووری کوردستاندا بسەپێنێت[2] کە لە ماردین و ڕووباری دیجلەوە لە لای ڕۆژئاوای تا شنۆ لەلای ڕۆژهەلاّت و لە جەزیرەوە (بۆتان) لە باکوور تا دەگاتە توزخورماتوو لە باشووری دەگرتەوە[3]، بەچەشنێك توانا سەربازییەکانی گەیشتە ئاستێك والی بەغداد (عەلی ڕەزا پاشا) نەیتوانی لە میانەی بەکارهێنانی هێزەوە بەری پێبگرێت، بەڵکوو ناچار مەسەلەکەی بەئاشتەوایی لەگەڵدا بڕییەوەو دەسەلاّتی بەفەرمی ناسیی، وەك دەڵێن پلەی پاشایەتیشی پێبەخشیوە[4].

کارو چالاکییە سیاسیەکانی میر محەمەد سنووری کوردستانی تێپەڕاند، بەگوێرەی توێژینەوەیەکی بەڵگەنامەیی لە ساڵی (١٨٣٢)دا پرۆژەیەکی هاوبەش، کە خۆی لە ڕزگارکردنی ناوچەکە لەژێر چنگی عوسمانییدا دەبینیەوە، هەریەك لە میری سۆران و مەمالیکەکان (کە تازە لەبەغداد دەرکرابوون) و هەندێ سەرۆك عەشیرەتەکانی عەرەبی پێکەوە

---

[1] دیڤید مەکداول: مێژووی هاوچەرخی کورد، و. ئەبوبەکر خۆشناو، چ٢، هەولێر، ٢٠٠٥, ل٨١.

[2] مارتن ڤان برونسەن: سەرچاوەی پێشوو، ب١، ل٦٣.

[3] سعيد بشير اسكندر: قيام النظام الاماراتي في كردستان و سقوطه، ص١٨٢.

[4] محەمەد ئەمین زەکی: سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٩.

**کۆکردۆتەوە[1]، بە گوێرەی گێڕانەوەکانی (حسێن حوزنی موکریانی) بێت، هەر لەو ماوەیەدا وەك بەرنامەیەکی هاوبەش بۆ داماڵینی وڵاتی کوردانو شامو میسر لە عوسمانییەکان، نامەی محەمەد عەلی پاشای والی میسر (١٨٠٥-١٨٤٩)و ئیبراهیمی کوڕی گەشتۆتە میری سۆران[2] ئەم پرۆژانە ئەگەرچی سەریان نەگرت[3]، بەڵام عوسمانییەکانی بەئاگاهێنایەوەو پێدەچێت هەر ئەم جمووجوڵانەش بوبێتنە هۆی ئەوەی میر محەمەدو میرایەتییەکەی بکەنە یەکەم ئامانجی خۆیان لە ناوچەکە.**

**ئەوەبوو (محەمەد ڕەشید پاشا) لە (ئەیلوولی ١٨٣٦ )دا لە لایەن سوڵتانەوە فەرمانی بۆ هات بە سەرکردایەتی سوپایەکی مەزن هێرش بۆ سەر وڵاتی کوردان دەستپێبکات، هەرچی عەلی ڕەزا پاشای والی بەغدایە (١٨٣١-١٨٤٢) لە لای خۆیەوە هەمان شتی کرد، بەهەمان شێوە (محەمەد پاشا)ی والی موسڵ، "هەر سێ سەرکردەی تورك پێکەوە بە تەبایی دژی بەگی ڕەواندوز، سەرۆکی باڵای کوردەکان وەستانەوە"، سوپای عوسمانی لە (٤٠) هەزار جەنگاوەر پێکهاتبوو، بەگی ڕەواندوز کە بینی بە لەشکرێکی مەزن دەوردراوە، تێگەیشت کە ڕووبەڕووبونەوەی مەحاڵە، بۆیە پێشنیاریکرد ئەگەر بیبەخشن خۆ بەدەستەوەدەدات، لە کۆتاییدا خۆی دایەدەست (ڕەشید محەمەد پاشا)، ئەویش بەڕێزەوە ڕەوانەی ئەستەموڵی**

---

[1] عماد عبدالسلام رؤوف: دراسات وثائقية فى تاريخ الكرد الحديث وحضارتهم، ص ص٢٢١-٢٢٥.

[2] عەلی سەیدۆ گەورانی: لە"عەممان"ەوە بۆ"ئامێدی" گەشتێك بە کوردستانی باشووردا، و. تالیب بەرزنجی، چ١، سلیمانی، ٢٠٠٠، ل١٦٢.

[3] عماد عبدالسلام رؤوف: دراسات وثائقية في تاريخ الكرد الحديث وحضارتهم، ص ص ٢٢٦-٢٢٧.

کرد، هەرچی سوڵتانە بەخشیی[1]، بـەڵام لە گەڕانەوەدا بێسەروشوێن کراو تێداچوو[2]. پاش ئەوە عەلی ڕەزا پاشا بە ناچاری[3] (ڕەسول)ی برای میر محەمـەدی کـردە حـوکمڕانی ڕەوانـدزو دەوروبـەری تـا والی بەغـداد نـەجیب پاشـا (١٨٤٢-١٨٤٧) لـە سـاڵی (١٨٤٦ )دا، لەسـەر کـار لایـدا[4] بـەو جـۆرە کۆتــــایی بــــە میرنــــشینی ســــــۆران هــــاتو ڕەوانــــدوز کەوتەدەســــت

[1] گەشتنامەی پوژۆلا بۆ کوردستان ساڵی ١٨٣٧، و. نەجاتی عەبدوڵڵا، هەولێر، ٢٠٠٩، ل ل ٥٢-٥٣.

[2]محەمەد ئەمین زەکی: سەرچاوەی پێشوو، ١٢٦.

پێـچەوانەی ئـەم گێڕانـەوە بـاوە، بـە گـوێرەی پـوژۆلا، دوای ئـەوەی بـەگی ڕەوانـدوز سـوێندی خـوارد کـە وەفـاداری سـوڵتان بێـت و لـەوە بـەدوا چـەکەکانی تـەنها بـۆ داکـۆکیکردن لـە ئیمپراتۆریـا دژی دوژمنـان بـەکاربهێنێ، سـوڵتان بەخـشینەکەی لێ هەموارکرد، ڕەوانـەی میزۆپۆتامیای کردەوە، ئەویش کاریگـەر بە چاکییەکانی سوڵتان گـوتی"کـەوا هـەرگیز خـۆی نـابوورێ کـەوا ئیهانـەی پادشایەکی ئەو هێنده شەهامەتدار کردووە کە تاقە بیانووی ئەوەیە ئەگەر پێشتر بیناسیبایە ئەوا هـەرگیز شـەڕی سوڵتانی نەدەکرد و ئەو ئاسوودە نابێ، تـەنها ئەوکاتـە نـەبێ کە لـە ئاسـت بەخشندەییەکی وەکو ئەودابێت، بەوەی هـەموو کۆششێك بکات بۆ سڕینەوەی کـەمترین شـوێنکاری ئـەو هەڵـە گەورەیـە کـە لـە بەرامبـەر ئـەودا کردوویـە" ئـەم بەڵێنـە فەرمییـە بـە جێگەیـەنرا. بـەگی ڕەوانـدوز گەڕایـەوە جـەزیرە بـە خـۆی و چـەند کوردێکـەوە کـە بڕیاریانـدا دوای بکـەون چوونە پـاڵ هێزەکـانی عوسمـانی. بڕوانـە، گەشـتنامەکەی پـوژۆلا بـۆ کوردسـتان سـاڵی ١٨٣٧، ل ٥٣.

[3] عەلی ڕەزا پاشا بەو ئومێدەی حوکمی ڕاستەوخۆی دەوڵـەت بگێڕێتـەوە ئـەو دەڤـەرە، لەپێشدا جێگرەکەی خۆی لە ڕەواندز دانا، بەڵام سەپاندنی ئەو جۆرە حوکمڕانییە ئاسان نەبوو، هیچ نەبێ ملکەچپێکردنی عەشیرەتە لۆکالییەکانی و سیستمێکی ئیداری تۆکمەی پێویـستبوو، ئـەم کـارەش لـەو ڕۆژگـارەدا بـەوان مەیـسەر نـەدەبوو. بڕوانـە، عبـدالعزیز سلیمان نوار: سەرچاوە پێشوو، ل١٠٩.

[4] عبدالعزیز سلیمان نوار: تاریخ العراق الحدیث، ص١٠٩

عوسمانییەکانو فەرمانبەرانی ئەوان لەوە بەدوا ڕاستەوخۆ حوکمڕانییان دەکرد[1].

پێدەچێت مەرگ بواری (محەمەد رەشید پاشا)ی عوسمانی نەدابێت بەرنامەی داڕووخانو لەنێودانی میرایەتییەکانی کوردستان تەواوبکاتو دانیشتوانەکەی ملکەچی حوکمڕانی ناوەندیی بکات، لەبەر ئەوە گێڕانەوەی ناوچەکانی تری کوردستان لە باشوور بۆ (عەلی رەزا پاشا)ی والی بەغداد جێهێشت[2].

ساڵی (١٨٣٧) میر ئیسماعیل (میری میرایەتی بادینان) بەوە تاوانبارکرا لە والی بەغداد هەڵگەڕاوەتەوە، هەرچی والییە بەسەرکردایەتی جێگرەکەی، سوپایەکی رەوانەی بادینان کرد، بەڵام میر ئیسماعیل توانی بەر بەم سوپایە بگرێت. لە کۆتاییدا خودی والی خۆی بۆ ملکەچپێکردنی ئەم میرنشینە، هەڵمەتێکی نوێی بۆ سەر بادینان دەستپێکرد، پاش ماوەیەك لە گەمارۆدانی ئامێدی، والی توانی (ئیسماعیل پاشا) بگرێو دەستبەجێ بۆ دەستبەسەرکردنی رەوانەی بەغدادی بکات، هەرچی حوکمڕانیکردنی میرایەتییەکەیە دایەدەست (عەبدولقادر)ی برای ئیسماعیل، کە پێشتر بۆ دڵنیابوون لە یاخینەبوونی ئیسماعیل لە دەسەڵاتی بەغداد، والی لای خۆی

---

[1] محەمەد ئەمین زەکی: سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٢.، مارتن ڤان برونسەن: سەرچاوەی پێشوو، ب١، ل٦٣.

[2] محەمەد رەشید پاشا کەخەونی بوو سەرجەم کوردستان ملکەچی دەسەڵاتی ناوەندی بکات، لە شوباتی ساڵی (١٨٣٧) بە پەتایەکی کوشندە ( کۆلیرا) لە دەوروبەری دیاربەکر مرد، سوڵتان سەرکردایەتی سوپاکەی دایە حافز پاشا و جەنگ لە دژی کوردان بە هیچ شێوەیەك ڕانەگیرا. بڕوانە، گەشتنامەکەی پوژولا بۆ کوردستان ساڵی ١٨٣٧، ل ٥٤.

دەستبەسەری کردبوو[1]. زۆری نەبرد والی بەغداد لەژێر فشاری دۆخی گشتی ڕوو لە خراپی دەوڵەتی عوسمانی و ناوچەکە، کە بواری جێبەجێکردنی حوکمڕانی ڕاستەوخۆی نەئەدا، ناچاربوو ئیسماعیل پاشا بگێڕێتەوە بۆ حوکمڕانی بادینان. بەتایبەت عوسمانییەکان تازە بەدۆڕاوی لە شەڕی نزیب (١٨٣٩)[2] دەرچووبوون و خودی (ئیسماعیل پاشا)یش، بە ئارامی دانەدەنیشت و دژ بە والی موسڵ هان و دنەی عەشیرەتەکانی ناوچەکەی ئەدا[3]

حوکمڕانی (ئیسماعیل پاشا) زۆری نەخایاند، چونکە دوای ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی کێشەکانی خۆی لەگەڵ (محەمەد عەلی) والی میسر یەکالاکردەوە، ساڵی (١٨٣٨) والی موسڵ محەمەد ئینجە بەیرەقدار (١٨٣٣-١٨٤٣ز) کە **"ئەرکی خۆی لە تێکووپێکدانی میرایەتییە بچوکەکانی کورددا دەبینیەوە"** ڕاسپارد کە **"کارە تەواونەکراوەکانی کوردستان**

---

[1] عباس العزاوي: تاريخ العراق بين احتلالين، ج٧، الدار العربية للموسوعات، د.ت، ص٤٥.

[2] شەڕی نزیب: ئەو شەڕەیە کە لە نێوان سوپای عوسمانی بەسەرکردایەتی (حافظ باشا) و هێزەکانی (ئیبراهیم پاشا)ی کوڕی محەمەد عەلی پاشای والی میسردا، لە (٢٤ی حوزەیرانی ١٨٣٩) نزیك شاری نەسیبین، کە لە سەرچاوە ڕۆژئاواییەکاندا بە نزیب ناسراوە ڕوویدا، لە کۆتایدا هێزەکەی ئیبراهیم پاشا سەرکەوتنی بەدەست هێناو (١٦٦) تۆپ و (٢٠) هەزار تفەنگی وەك دەستکەوتی شەڕ بۆ مایەوە. بڕوانە: هيثم هلال: موسوعة الحروب، ط٢ ، بيروت، ٢٠٠٨، ص ص٣٥٤-٣٥٥.

[3] عبدالعزيز سليمان نوار: تاريخ العراق الحديث، ص١١١.

**تەواوبكات**"[1]. هەڵبەت مەبەستی لەنێوبردنی ئەو میرایەتییە كوردانە بوو، كە هێشتا لە ناوچەكەدا مابوون.

محەمەد ئینجە بەیرەقدار بەهێزێكی گەورەوە ڕووی لە ئامێدی كرد، پاش گەمارۆیەكی درێژخایەن توانی بچێتە نێو شارەكە، بەڵام ئەمجارە (ئیسماعیل پاشا) هەڵات، هەرچی بەیرەقدار بوو، چەند ڕۆژێك مایەوەو یەكێك لە پیاوە ناسراوەكانی شارەكە، كە ناوی ( یونس ئاغای گەیلی) بوو بە حوكمڕان داناو بۆخۆی گەڕایەوە موسڵ"[2].

هەرچەندە (میر ئیسماعیل) لە گێڕانەوەی میرنشینەكەی نائومێد بوو، بەڵام زۆری نەبرد سەرلەنوێ لەگەڵ سەرۆك عەشیرەتو كەسایەتییە ناسراوەكانی ئامێدیو دەورووبەریدا پەیوەندی پێكهێنایەوەو لە سەرەتای ساڵی (١٨٤٢)دا گەڕایەوە ئامێدی، بۆ ڕەوایەتیدانیش بە حوكمڕانیكردن داوای لە بەیرەقدار كرد بەفەرمی بواری گەڕانەوەی بدات، هەرچی بەیرەقدار بوو لە بری جێبەجێكردنی داواكارییەكەی، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بەهێزێكی مەزنەوە ڕێگەی ئامێدی گرتەبەر.[3] دوای شەڕێكی سەخت لە ڕۆژهەڵاتی دهوك، ئیسماعیل پاشا ناچاربوو بكشێتەوە نێو ئامێدی، بەیرەقدار سەر لەنوێ ئابلۆقەی پایتەختی دایەوەو لە كۆتاییدا، لە پایزی

---

[1] ستيفن هيمسلى لونكريك: اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ت. جعفر الخياط، ط٦، بغداد ١٩٨٥، ص ص٣٤٠، ٣٤٤.

[2] انور المائي: الاكراد فى بهدينان، ط٢، دهوك، ١٩٩٩، ص١٥٣.

[3] محەمەد ئەمین زەكی: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٣; وەدیع جوەیدە، سەرچاوەی پێشوو، ل ل١٤٢-١٤٣.

ساڵی (١٨٤٢ن)دا، ئیسماعیل ناچاربوو خۆی بەدەستەوەبدات[١]. ئەوەبوو لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەی بۆ بەغداد دوورخرانەوە، سوپای عوسمانیش دوابەدوای ئەوە کارگێڕیی ناوەندی گێرایەوە بادینانو ئاکرێو دهۆكو دەوروبەری[٢] بەو جۆرە وەك (ستیفن هیمسلی لۆنگریك) دەڵێت: "**زۆرینەی هۆکارەکانی کۆکردنەوەی پەرتوبلاوی ناسیۆنی (Nation) کوردییان لەنێودا.**[٣]

دوای نەهێشتنی میرایەتی (سۆرانو ئامێدی)، بابان تاقە میرایەتیی بوو کە لە باشووری کوردستاندا مابووەوە. لەڕاستیدا دواخستنی لە نێودانو لادانی ئەم میرایەتییە بەو واتایە نەبوو کە هەوڵەکانی دەوڵەتی عوسمانی بۆ سەپاندنی حوکمڕانی ناوەندیی ڕوو لە پاشەکشێکردن بوو، بەڵکوو لە جاران سوورتربوون[٤]. وەك (میس بیل) دەڵێت: عوسمانییەکان پاش ئەوەی کێشەکەیان دەستنیشانکرد "**بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ بابانەکان ڕێبازێکی تورکانەیان هەڵبژارد، ئەویش بەکارهێنانی یەکێکیان بۆ لاوازکردنی پێگەو ڕێزی ئەوی دی، ئەوی دیکەشیان غافڵگیرانە دەستبەسەردەکرد، هەرچی سێیەم بوو بە سامانو پارە دەیانکڕی تا نەرم دەبوو و ئینجا داوای لێدەکرا خۆی ڕێکبکاتەوە**"[٥]، ڕواڵەتەکانی ئەم مامەڵەیە لە دوو دەیەی

---

[١] کامران عبدالصمد الدوسکي: بهدینان فی اواخر العهد العثمانی ١٨٧٦-١٩١٤، ط١، دهوك، ٢٠٠٧، ص٤٨.

[٢] محەمەد ئەمین زەك: سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٣; ستیفن هیمسلي لونکریك، المصدر السابق، ص٣٤٤.

[٣] بڕوانە، اربعة قرون من تاریخ العراق الحدیث، ص ٣٤٤.

[٤] شاکر خصباك: الکرد والمسألة الکردیة، بغداد، ١٩٥٩، ص٢٤

[٥] المس بیل: فصول من تاریخ العراق القریب، ت. جعفر الخیاط، بیروت، ١٩٧١، ص١٨١.

کۆتایی ئەم میرایەتییەدا بەتەواوی دەرکەوت، بەجۆرێك وەك محەمەد ئەمین زەکی دەڵێت" **پیلانگێڕان لەیەکتریو ناکۆکی لە نێو میرەکانی ئەم بنەماڵەدا، میرایەتییەکەی لە داڕووخان نزیك کردەوە**"[1]. لەڕاستیدا ئەوەی ناکۆکییەکانی قوڵتردەکردەوە، هەڵکەوتی جیۆپۆلیتیکی میرایەتی بابان بوو، کە کەوتبووە سەر هێڵی سنوور لە نێوان عوسمانییەکانو ئێراندا، بەتایبەتیش ئێران کە لە ململانێی خۆیدا لەگەڵ عوسمانییەکان، دەیویست بەهۆی پاشاکانی بابانەوە دەسەلاتو پێگەی خۆی لە کوردستاندا بەهێزبکات[2]و ناوچەی سلێمانی کە بە گوێرەی پەیمانەکانی پێشوتری ئەو دوو دەوڵەتە، بەر عوسمانییەکان کەوتبوو بۆخۆی داماڵێت، بەتایبەت لەساڵانی کۆتایی میرنشینەکەداو لە سەروبەندی دانوستانەکانی پەیماننامەی ئەرزەرۆمی دووەم لە ساڵانی (١٨٤٣-١٨٤٧)[3].

پاش ئەوەی پیلانگێرانو ناکۆکی نێو بنەماڵەی بابان لە سەردەمی (مەحموود پاشاو سلێمان پاشا)دا گەیشتە لوتکە[4]، پەیماننامەی ئەرزەرومی دووەم (١٨٤٧) راستەوخۆ بووە هۆیەك بۆ نەهێشتنی میرایەتییەکەو لادانی[5]. بەتایبەت پاش **"دەست هەڵگرتنی ئێران لە**

---

[1] بڕوانە، خولاصەیەکی تاریخی کوردو کوردستان، ل١٦٣.

[2] محەمەد حەمە باقی: سەرچاوەی پێشوو، ل ل٧٨ و٨٠.

[3] عبدالعزیز سلیمان نوار: العلاقات العراقیة الایرانیة ...، ص٨٥.

[4] بۆ وێنە شاری سلێمانی لەماوەی چوار ساڵدا شەش جار لەمیانی شەڕەوە، لەنێوان مەحمود پاشا بەهاوکاری ئێرانییەکانو سلێمان پاشا بە هاوکاری والییەکانی بەغداد، دەستاودەستی کردووە. بڕوانە، عبدالقادر رستم بابانی: سیر الاکرد در تاریخ و جغرافیای کردستان، بە اهتمام محمد رئوف توکلی، چ٢، چابخانەی گلبانگ، ب.س ل١٤٨.

[5] عباس العزاوي: المصدر السابق، ج٧، ص١٠٨.

**خواستەکانی خۆی لە شارو ویلایەتی سلێمانی"**[1] ئیدی بێ ئەوەی هێزو سوپا بەکاربهێنن، بە بڕیارێکی نامق پاشای والی بەغدا (١٨٤٩-١٨٥١) لە ساڵی (١٨٥١)دا میرایەتی بابان کۆتایی هاتو لە هەمان ساڵدا ئیسماعیل پاشای عوسمانی کرایە قایمقامی سلێمانی[2] ، هەرچی سەرانی بنەماڵەی بابانیش بوو، ئەوا عوسمانییەکان بەسەر ناوچە جیاجیاکانی ئیمپراتۆریەتیەکەیاندا پەرشو بڵاویان کردنەوە[3].

هەڵبەتە نەهێشتنی میرایەتییەکان کاریگەری قوڵی لەسەر دۆخی گشتی کۆمەڵگەی کورد جێهێشت، بەهۆی نەمانی ئەو بونیادە نێوانکارە دانپێدانراوەوە (مەبەست میرومیرایەتییەکانە)، هەمیشە ناکۆکی نێوان ئاغاکان درێژەی هەبوو، ئەمەش بۆخۆی دەبووە مایەی لاوازبوونی بونیادە کلاسیکییەکەی هێز، ئاکام بەشێوەیەکی بەرفراوان پەنا بۆ شێخانی ئایینی دەبرا، بۆ ئەوەی رۆڵی نێوانکار لە نێوان ئاغاکانو دێهاتو پیاوانی عەشیرەتەکاندا بگێڕن[4]، بە کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی میرنشینەکان، کۆتای بە قۆناغێکی گرنگی مێژووی نوێی کورد هاتو دەسەڵاتی ناوەندی گەڕایەوە باشووری کوردستان، ئەم قۆناغە تا کۆتایی حوکمڕانی عوسمانی لە ساڵی (١٩١٨) لە ناوچەکە بەردەوام بوو.

---

[1] منوچهر پاراسادوست: سەرچاوەی پێشوو، ل٨٢.

[2] محەمەد ئەمین زەکی: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٣; عباس العزاوي، شهرزور- السليمانية اللواءْ والمدينة، راجعه وقدم له وعلق عليه محمد علي القرداغي، ط١، بغداد، ٢٠٠٠، ص ٢٠٥.

[3] المس بيل: المصدر السابق، ص١٨١.

[8] Hurst Hannum: Autonomy, Sovereignty and Self-determination ( U.S.A-University of Pennsylvania Press-1990), p.182.

عوسمانییەکان تێکڕای یاساو سیستمی کارگێڕیو داراییو دادوەرییەکانی خۆیان، بەو فۆرمەی کە لە ویلایەتەکانی تری دەوڵەتدا هەبوو، لە باشووری کوردستان جێبەجێکرد، لەو چوارچێوەدا ناوچەکەیان بەسەر چەند یەکەیەکی کارگێڕیدا دابەشکرد لە فۆرمی (لیوا یا سەنجەق، قەزا، ناحییە). بەڵام وەك تێبینی دەکرێ، ئەم دابەشکردنە جێگیرنەبوو و تا کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمیش فۆرمی کۆتایی خۆی وەرنەگرتووە.

بۆ وێنە، لە ناوەراستی سەدەی نۆزدەهەمدا بەشێك لە باشووری کوردستان لە چوارچێوەی سنووری کارگێڕی ویلایەتی بەغداددا بوو، کە پێکهاتبوو لە (٥) لیوا : بەغداد، بەسرە، کەرکوك، کۆی سنجەق، سلێمانی. لە کاتێکدا بەشەکەی تری لە چوارچێوەی ویلایەتی موسڵ دا بوو، ناوچەکانی: ئاکرێ، زێبار، مزووری، داوودە، بروارى، زاخۆ، دهۆكو سنجاری، پاش کەمتر لە (٢٠) ساڵ بەدیاریکراوی لە ساڵی (١٢٨٤ك/١٨٦٧)دا، دەبینین باشووری کوردستان کەوتۆتە چوارچێوەی کارگێڕیی ویلایەتی بەغداد کە لە (٧) لیوا پێکهاتبوو، ئەوانیش: بەغدا، بەسرە، سلێمانی، شارەزوور (واتە کەرکوك)، زەنگاباد، رەواندوز، موسڵ بوون.[1]

لە ساڵی (١٨٧٩)دا سەرلەنوێ ویلایەتی موسڵ پێکدەهێنرێتەوەو هەردوو لیوای کەرکوكو سلێمانی بە قەزاو ناحیەکانیانەوە دەخرێتە سەری[2]، واتە زۆرینەی ناوچەکانی باشووری کوردستان کەوتنە

[1] بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەوە بڕوانە: خليل ساحلي اوغلو: المصدر السابق، ص ص٥١٩-٥٢١.

[2] ستيفن هيمسلي‌لونكريك: المصدر السابق، ص ٣٧٦

چوارچێوەی ویلایەتی نێوبراو، لە کاتێکدا ناوچەکانی تری (وەك خانەقین و مەندەلی) لە چوارچێوەی ویلایەتی بەغدادا مانەوە. تێبینی ئەوەش دەکرێ ئامێدی کە پێشتر سەر بە لیوای موسڵ بوو لە دابەشکردنە کارگێڕییەکانی ساڵی (١٢٨٤ك-١٨٦٧)دا، کراوەتە پاشکۆی ویلایەتی هەکاری، وەك لە ساڵنامەکانی[1] دەوڵەتی عوسمانی ساڵی (١٣٠٢ك/١٨٨٥)دا هاتووە[2]، بەلاّم ساڵی(١٨٩١) سەرلەنوێ جیاکراوەتەوەو خراوەتەوە سەر ویلایەتی موسڵ[3] .

دابەشکردنە کارگێڕییەکان لەو هەرێمەی ئەمڕۆ پێی دەوترێت عێراق، تارادەیەك لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا جیگیربوو، لەو مێژووە بەدواوە زۆرینەی ناوچەکانی باشووری کوردستان کەوتە چوارچێوەی کارگێڕی ویلایەتی موسڵ کە لەم لیوایانەی لای خوارەوە پێکهاتبوو:

١- لیوای موسڵ: لەگەڵ قەزاکانی ئامێدی، زاخۆ، دهۆك، ئاکرێ، سنجار، بە سەرجەم ناحیەو گوندەکانییەوە.

---

(1) ساڵنامە: تێرمێکە لە دوو ووشە پێکهاتووە، (ساڵ)و(نامە)، پێکەوە مانای (نامەی یا کتێبی ساڵانە-year book) دەگەیەنێت، یەکەم ساڵنامەی عوسمانی لە ساڵی ١٨٤٧ دەرچووە، ساڵنامەکان زانیاری کارگێڕی و ئابووری و کۆمەلاّیەتی و جوگرافی و...هتد، لەبارەی هەرێم و ویلایەتەکانی عوسمانی تیایە. بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەوە بڕوانە: فاضل بیات: دراسات في تاریخ العرب فی العهد العثماني، ص ص٢٠٤-٢٢٧

(4) Justin Macarthy: The Arab World,Turkey and Balkans 1878-1914:A Handbook of Historical statistics(Boston-1982)p.15.

(٣) ئەم گۆڕانکارییە ساڵی (١٨٩١) ئەنجام دراوە، چونکە لە ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ دا بۆ ساڵی (١٣٠٨ك/١٨٩٠ز) ناوی ئامێدی لە چوارچێوەی ویلایەتی موسڵ دا نەهاتووە، بەلاّم لە ساڵنامەی ساڵی (١٣١٠ك/١٨٩٢ز)دا ناوی هاتووە. بڕوانە، سالنامت ولایت موصل ١٣١٠هـ، ص ١٧٣.

٢- ليواى كەركوك: لەگەڵ قەزاكانى رەواندوز، كۆى سنجەق، رانيە، اربيل (هەولێر)، وصلاحيە (كفرى)، بە سەرجەم ناحيەوە گوندەكانييەوە.

٣- ليواى سلێمانى: لەگەڵ قەزاكانى، كوڵعەنبەر (هەڵەبجە)، مەعمورە الحميد (پشدەر)، بازيان، چوارتا، شەهر بازار، بە سەرجەم ناحيەو گوندەكانييەوە.

هەرچى ناوچەكانى ترى باشوورى كوردستانە لەوانە، قەزاكانى خانەقين و مەندەلى و بەدرە، كەوتنە چوارچێوەى كارگێڕى ليواى بەغداد (كە سەنتەرى ويلايەت بوو)[1].

دەزگاى كارگێرى عوسمانى بەشێوەيەكى گشتى پێكهاتبوو لە (والى) كە لە سەنتەرى ويلايەتدا گەورەترين و بالآترين بەرپرس بوو، پۆستەكەى لە هەمانكاتدا كارگێڕى و رامياريش بوو، لە جێبەجێكردنى تێكراى فەرمان و ياساكانى دەوڵەتدا لێپرسراوبوو، بە هاوكارى گەورە لێپرسراوەكانى ترى ويلايەتەكە لەوانە: كەهيە (كتخدا)[2]، دەفتەردار[3]، مەكتوبچى.... هتد، سەرجەم كاروبارە كارگێڕى، سەربازيى و داراييەكانى بەرێوەدەبرد. هەرچى سەنجەق/ليوايە بوو ئەوا كەسێك بەڕێوەيدەبرد پێيان دەوت

---

[1] غانم محمد علي: النظام المالي العثماني في العراق ١٨٣٩-١٩١٤، رسالة ماجستير، كلية الآداب، جامعة الموصل، ١٩٨٩، الملحق رقم(١)؛ جميل موسى النجار، الادارة العثمانية فى ولاية بغداد ١٨٦٩-١٩١٧، ط١، القاهرة ١٩٩١، ص١٣٣.

[2] كەهيە (كتخدا): جێگرو پشتى والى بووە، لەسەرجەم پرسە ئيدارى و دارايى و سەربازيەكاندا هاوكارى والى دەكرد.

[3] دەفتەردار: نوسەرى ژمێريارى بووە، سێ پلەى دەفتەردارى هەبووە، يەكەميان لە ئاست وەزيرى دارايى دا بووە، دووەم، چاودێرى شێوازى باجى دەكرد، سێيەميان، سەرپەرشتى فەرمانەكانى ئەستانبولى دەكرد. بڕوانە: يوسف عزالدين: داود باشا ونهاية المماليك فى العراق، ط٢، بغداد، ١٩٧٦، ص٢٠.

(موتەسەریف)، بەرپرسبوو لە جێبەجێکردنی سەرجەم ئەو فەرمانانەی لە والییەوە بۆی دەهات، لەگەڵ ئەمیشدا کۆمەڵێك بەرێوبەری پلە خوارتر هەبوو کە هاوکاری بوون، لەوانە ژمێریار، بەڕێوبەری تەحریر..... هتد. لە قەزاکانیشدا (قایمقام) ترۆپکی دەسەلاٌتی حکومەت بوو، بەرپرس بوو لە کاروبارە مەدەنیی و دارایی و ئەمنییەکانی سنووری قەزاکە، بە یاریدەی چەند بەرپرسێك لەوانە، بەڕێوبەری دارایی، کاتب تحرير و چەند بەڕێوبەرێکی تر، کارەکانی قەزاکەی بەڕێوەدەبرد. لە ناحیەکانیشدا (بەڕێوبەری ناحیە) بالاٌترین کارمەندی حکومەت بوو، قایمقام پێشنیازی دامەزراندنی دەکرد، لەگەڵ نووسەرێك و چەند بەرپرسێکی تردا سەرپەرشتی کاروبارەکانی خەڵکیان لە سنووری ناحیەکەدا دەکرد. لە گوندەکانیشدا (موختار) هەبوو، کە لە میانەی چەندین ئەرك و کارەوە نێوانکاری لەنێوان خەڵك و حکومەتدا دەکرد[(١)].

عوسمانییەکان لە باشووری کوردستاندا ئەو بنەما کارگێڕییانەیان جێبەجێدەکرد، کە لە سەرەوە هێمامان بۆکرد، بەلاٌم وەك مێژوونووسان جەختی لەسەر دەکەنەوە، لە کوردستاندا بەگشتی سیستمی کارگێڕی عوسمانی لاوازو پڕ گەندەڵی و بەرتیلخواردن و قۆرخکاری بووە، وەك لۆنگریك ئاماژەی پێداوە کارگێڕی نوێ **"رێگەی والاٌکرد بۆ رێنماییە نووسراوەکانی سەر کاغەز، کارمەندی ترسنۆك کە کڕین و فرۆشتنیان پێوەدەکرا بەپارە، بۆ قۆرخکردنی بەدو لاوازو دەرکەوتنی زمانی نامۆی**

---

[(١)] بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی دەزگای کارگێڕی عوسمانی بڕوانە: جميل موسى النجار: المصدر السابق، ص ص١٦٣-٢٢١.

**تـوركی"** [1]، محەمـەد ئـەمین زەکـی هـەمان مەسـەلە دووپاتدەکاتـەوە کـاتیٚ دەڵێـت: " لـەم دەورەدا ئیـدارەی کوردسـتان زۆر پەرێـشان بـوو، ئـەهالی بـەخۆیانو مـاڵو ڕۆحیانـەوە، دایمـە لـەژێر تەهلەکـەدابوون، ئومـەراو مەئمورین، دایمە چاویان لەڕووتاندنەوەیان بوو"[2].

لە ئاکامیشدا پشێویو ئاڵۆزی لە ناوچەکە سەریهەڵدا، عوسمانییەکان کە جـەختیان لـە جێبـەجێکردنی سیاسـەتی سـەرکوتکردنی میرانـی کـوردو سـەپاندنی کـارگێڕی ناوەنـدیی کـردەوە، لـە کاتێکـدا ئامـانجی یەکـەمیان بـۆ جێبەجێکرا، بەڵام بە گشتی نەیانتوانی ئامانجی دووەم بێننەدی.[3]

هەڵوەشاندنەوەی میرایەتییەکانی کورد، نەیتوانی ئەو ناوچانە بباتـە نێـو دەزگاکـانی حـوکمڕانی عوسمانییـەوە، هـەر بۆیـە لـەم قۆناغـەدا پرسـی عەشـیرەتەکان بـوو بـە زەقتریـن ئـەو پرسـانەی ڕووبـەرووی دەسـەڵاتدارانی دەوڵەت بوویەوە[4]، چونکە بەشێکی فراوان لـەو ناوچانەی کـە پێشتر لـەژێر دەسـەلاتی میرایەتییـەکانی (بابـان، سـۆران، بادینـان)دا بـوون، کەوتنـە بـەر

---

[1] بڕوانە، اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ص٣٤٥ ; يوسف عزالدين: المصدر السابق، ص ص١١-٢٢.

[2] بڕوانە، خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان، ل١٥٦.

[3] وەدیع جویدە: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٦٩.،

Maria T.Oshea:Trapped between the Map and reality:Geography and Percotions of Kurdistan, Newyork-2004,p.77.

[4] ستیفن هیمسلی لونکریك: المصدر السابق، ص ص ٣٤٦ و٣٤٧.

ڕاوڕووتی عەشیرەتە وردەکان، ئەوانەی پێشتر لەلایەن میرە بەهێزەکانی ئەو میرنشینانـــەوە بەشێوەیەك لە شێوەکان جڵەویان گیرابوو[1].

وێڕای ئەوە کاربەدەستانی بێگانە جێگای کاربەدەستە ناوچەییەکانیان گرتەوە، گەنج و لاوی کورد بەزۆر راپێچی سەربازی دەکران، عوسمانییەکان زوڵم و ستەمی زۆرتریان بۆ کورد هێنا و باج و سەرانەی زیاتریان بەسەر خەڵکەکەیدا سەپاند[2]. بەم هۆکارانەوە دۆخی ئابووری ناوچەکانی کورد بە هــۆی بــاج ســەندنی بێــسنوورەوە تادەهــات ئــاڵۆزترو وێرانتردەبــوو، دەستکەوت و بەروبوومی جووتیارەکان ئەوەندە ڕووی لە کەمی کرد، بەشی باجدانی نــەدەکرد، بــاجی کاربەدەســتانی دەوڵــەت ئەوەنــدە سەرشــانی قورســکردبوون، ناچــاربوون گونــدەکانیان چــۆڵبکەن و روو لــە شــاخەکان بکەن[3].

بێگومان ئەم هەل و مەرجە زادەی شکستی دەسەڵاتداران و ژەندرمەی (پۆلیسی) عوسمانی بوو، کە بەهۆی گەندەڵبوونیان لە ڕووی کارگێڕی و سیاسی و تێنەگەیشتنیان لە دۆخی کورد، نەیانتوانی بەشێوەیەکی درووست ناوچەکانی کورد بەرێوەبەرن، سەرباری ئەمە کارگێڕی ناوەندیی بۆ کورد مەسەلەیەکی نامۆ بوو[4]. تەنها چارەسەر بەدەست حکومەتەوە

---

[1] وەدیع جویدە: سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٩، مارتن ڤان برونسن "المجتمع التقليدي والدولة" مجلة دراسات كردية، العدد(٤) السنة (٩) باريس ١٩٩٢.ص٤٣.

[2] نەوشیروان موستەفا: کورد و عەجەم، مێژووی سیاسی کوردەکانی ئێران، چ١، ب. ش، ١٩٩٢، ل١٥٢.

[3] جەلیلی جەلیل: هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦١.

[4] عثمان علي: دراسات في الحركة الكردية المعاصرة ١٨٣٣-١٩٤٦ دراسة تاريخية وثائقية، تقديم: محمد الهماوندي، ط١، اربيل،٢٠٠٣، ص١٤.

بریتیبوو لە ماوەیەك جاریَ هەناردنی (هەڵمەتی تەمێکارانە)[1] بۆسەر ئەو ناوچانە، ئەو هەڵمەتەی کە تیایدا بەشێکی هێزەکان لە خودی عەشیرەتەکان پێکدەهێنران، ئەوەش بە بەردەوامی دەبووە سەرچاوەی هێنانەکایەی نائارامی و بەرەڵلایی و نەدەتوانرا ئامانجەکان بەدی بهێنرێت، هەروەها زۆربەی ناوچە ئاڵۆزەکان هیچ کات بەبەردەوامیی هێمنی تێدا جێگیرنەدەبوو، زۆرجاریش ئەم چارەسەرە جگە لە شەپۆلێکی دیکەی خوێنرێژی و توندوتیژیی و نوێبوونەوەی کێشە عەشیرەتییەکان، بەرهەمێکی تری نەدەبوو[2].

لەراستیدا ئەم گۆڕانە بنەڕەتییە لە سروشتی سەرکردایەتی کورددا، جگە لەوەی رۆڵێکی بەتینی لە دواخستنی پرۆسەی گۆڕان و بەرەوپێشخستنی کۆمەڵایەتی و سیاسی کورددا گێڕا[3]، لە هەمانکاتدا کۆمەڵگەی کوردی زێتر لەبەریەك هەڵوەشاندەوە، پشێوییە عەشیرەتییەکان زۆر بەئاشکرا لەملاو ئەولای کوردستان بەرچاودەکەوتن، کە هێمای رەتکردنەوەی دەسەڵاتی ناوەندیی و ئەو بۆشاییە سیاسییە بوو کەوتبووە ناو هەناوی ئەم کۆمەڵگەوە، پەلامارو یاخیبوونی عەشیرەتەکانی هەمەوەند دژ بە عوسمانییەکان لە ماوەی شەستەکانی سەدەی نۆزدەهەم، لەشکرکێشی

---

[1] لە مێژووی عوسمانیدا بەکارهێنانی ئەم تێرمە زۆر باوە، زیاتریش هێمایە بۆ ئەو هەڵمەتە سەرکوتکاریانەی دەکرایە سەر ئەو ناوچانەی لەبەر هۆیەك لەهۆیەکان ( بۆ وێنە باج نەدان) لە دەوڵەت یاخی دەبوون و دژی دەوەستانەوە.

[2] وەدیع جویدە: سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٩.

[3] میهرداد ئیزەدی: سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٣.

هەورامییـەکان بـۆ سـەر سـنووری فـارس لـە سـاڵی (١٨٦٥)دا[1]، و بەشـداری عەشـیرەتەکانی بادینـان لـە شۆڕشـەکەی (یـەزدان شـێر) لـە ناوەڕاسـتەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا ڕەنگە باشترین نموونەی ئەو ڕەتکردنەوەیە بێت.

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ئەم لەشکرکێشییە بڕوانە، علـي اكبر كردستـاني: الحديقة الناصـرية في تـاريخ و جغرافيـة كردسـتان، ترجمـة، جـان دوسـت، ط١، اربيـل، ٢٠٠٢ ، ص١٥١.

## بەشی دووەم:

## باسی یەکەم/

## زاراوە و تایبەتمەندییەکانی ڕێکخراوەی عەشیرەتی کوردی

## باسی دووەم/

## نەخشەی عەشیرەتیی لە باشووری کوردستاندا

## باسی یەکەم/

### زاراوە و تایبە تمەندییەکانی ڕێکخراوەی عەشیرەتیی کوردی

وەك زانـراوە لـە ڕۆژگـاری دەوڵـەتی عوسمانیـدا ناوچـەکانی کوردسـتان بەگــشتی فــۆرمو چوارچــێوەیەکی عەشــیرەتییان هــەبووە، بەچەشــنێك (دەبلیو.ئەی.ویگرام .W.A.Wigram و ئەدگار.تی.ویگرام E.t.wigram) لـە سـالأنی پـێش جـەنگی یەکـەمی جیهانیـدا کوردسـتانیان وەك (وڵاتـی عەشـیرەتەکان) وێنـاکردووە[1]. لـە توێژینەوەیـەکی زانـستی بەڵگەنامەیـدا سەبارەت بە کوردان لە دەوڵەتی عوسمانیدا کە لـە کتێبـی (عشائر العـراق)دا بلأوکراوەتەوە، (د.أبراهیم الداقوقي) ناوی (٣٧٩) عەشیرەتی هێناوە کە لـەو ڕۆژگــارەدا لــە تێکــڕای کوردســتاندا هــەبوون[2]، هەنــدێ لــەو عەشــیرەتانە نیـشتەجێو هەنـدێکی تریـان کۆچـەری بـوونو لـە شـوێنێکی دیـاریکراودا جێگیر نەدەبوون، بەشێکی تریان نیمچە کۆچەر ( شبە رحل) بوون[3].

---

[1] دبليو.أي. ويكرام و ادكار. تي. أي. ويكرام، مهد البشرية: الحياة في شرق كردستان، ت. ترجمة جرجيس فتح الله، ط١، دار الزمان، بغداد، ١٩٧١، ص١٢٩.

[2] بڕوانە: مجموعة من الباحثين، عشائر العراق، ط١، اربيل، ٢٠٠١، ص ص ٧-٦٤.

[3] ب. م. دانتـسيغ، الرحالـة الـروس فـی الـشرق الاوسـط، ت: معـروف خزنـەدار، بغـداد، ١٩٨١، ص ٢٤٠.

لـە ناوەڕاسـتی سـەدەی نۆزدەهەمـدا عەشـیرەتە کۆچـەرییەکان سـێیەکی دانیـشتووانی کوردستان بوون. بڕوانە:عبدالرحمان قاسملۆ، کوردستان و کورد، و.عبدالله حسن زادە، چ٢، هەولێر، ٢٠٠٧، ل١٢٦. بەلأم دۆخی کۆچەریبوون لە گەڵ دەستپێکردنی سەدەی بیستەمدا ڕوو لـە نـەمان دەکـات و زۆرینـەی هـەرە زۆری عەشیرەتەکان لەگـەڵ کۆتـایی جەنگی یەکەمی جیهانیدا جێگیر دەبن، بە چەشنێك وەك (سی.جی. ادموندز) هێمای بۆ کردووە، زۆربەی عەشیرەتە کۆچەرییەکانی کورد خـەریکن لـە گوندەکانـدا جێگیر دەبن و

بەگشتی عەشیرەت گرووپێکی کۆمەڵایەتییە، دەچنەوە سەر یەك بنەچە، خزمایەتی و بەرژەوەندیی ئابووری هاوبەش پێکەوەیان گرێدەدات[١]، یا کۆمەڵگەیەکە یا کۆنفیدراسیۆنێکی کۆمەڵگەیی، لەسەر بنەمای پاراستنی ئەو تاکانەی لە چوارچێوەیدا دەژێن بونیادنراوە، لە رووبەڕووبوونەوەی پەلامارە دەرەکییەکانداو بۆ پاراستنی داب و نەریتە دێرینەکان و نۆرمەکانی ژیان پەنای بۆ دەبەن[٢]. یا لە فراوانترین واتادا: گرووپێکە لە خەڵکی، کە هەمان ڕەگەز، نەریت، زمان و ئاینییان هەیەو لە جێگایەکی تایبەتدا دەژێن و زۆرجاریش لەلایەن سەرۆکێکەوە رابەرایەتی دەکرێن[٣].

ئەم رێکخراوە کۆمەڵایەتییە، هەرچەندە لە سەرانسەری کوردستان لە بنچینەدا هاوشێوەیە، بەڵام بەهۆی ئەو تایبەتمەندییەی کە لە بونیادی عەشیرەتیی کوردیدا هەیە، ئەو زاراوانەی دابەشبوونی عەشیرەتیی بەرجەستە دەکەن واتا (تایفە، تیرە، هۆز)، وەك یەك لە ناوچە جیاجیاکاندا بەکارنایەن و ماناکانیان بەپێی شوێن دەگۆڕێ و لەلایەن خودی عەشیرەتەکانەوە بەکاردەهێنرێت. هەر هەوڵێکیش بۆ دەستنیشانکردنی تێرمەکانی عەشیرەت و لقە داکشاوترەکانی، مرۆڤ رووبەڕووی چەمکگەلی ناڕوون دەکاتەوە.[٤]

---

خەریکی کشتووکاڵکردنن. بڕوانە: کرد، ترك، عرب، ص١٧. احمد عثمان ابوبکر: الاثار الکاملة، ج١، اعداد: ازاد عبید صالح: مطبعة شڤان، السلیمانیة، ٢٠٠٩، ص٢٨٧.

(١) فریدریك معتوق: معجم العلوم الاجتماعیة، اکادیمیا، بیروت، ١٩٩٨، ص٩١.

(٢) مذکرات دبلیو ار.هي: المصدر السابق، ص ٨٣.

(٣)Oxford Advanced Learners Dictionary, vol.7, 2007, p.1638.

(٤) بۆ زانیاری زیاتر لەمبارەوە بڕوانە: مارتین فان برۆنەسن، سەرچاوەی پێشوو،ب١، ل ل ٨٠-٨٥.

بـۆ وێنـه، لـه ناوچـەکانی باڵەکایـەتی، بـۆ دەرخـستنی دابەشـبوونی عەشیرەتی تێرمی (عەشرەتو تایفە، تیرە) بەکاردەهێنن، لای عەشیرەتەکانی ئۆرەمـارو ڕێکـانی کـە بـە دریـژایی سـنوورەکانی تورکیـا– عـیراق دەژیـن، (عەشیرەت، وەجاغ، مالا) بـەکاردەهێنرێت، لەکاتێکدا ئـەو تێرمانـەی لـە نێـو کۆنفیدراسـیونی عەشـیرەتیی جـاف دا بریتییـە لـە (عەشـرەت، تـیرە، هـۆز)، هەرچی عەشیرەتی سنجابی (سنجاوی)[1] و (عەشیرەتەکانی تـر)ی کوردانی ئێرانە، ئەوا (ئێل، تیرە، تایفە) بەکاردەهێنن[2]. تەنانەت دەوڵـەتی عوسمـانی لـە نووسـراوە فەرمییەکانیـدا کـە ئاراسـتەی عەشـیرەتە کوردەکـانی دەکـرد، زۆرجار لە بری عەشیرەت تێرمی "تایفە"ی بەکارهێناوە [3] .

(Lineage)[4] لێـدەنێن، کـە لەگـەڵ عەشـیرەت (Clan)دا، لـە ڕووی یەکگرتنی سیاسییەوە، قەبارە بچووکی و بەهێزی لەیەکیان جیادەکاتەوە[5]

---

[1] سەنجاوی: عەشیرەتێکی گەورەی کوردییە لە ناوچەی کرماشان، هاوینان هۆبەو ڕەشماڵەکانیان لە پێدەشتی ماهیدەشت و هەرێمی جوانرۆ هەڵدەدەن و زستانانیش بۆ زەوی و زاری خوارووی ئەڵوەند کۆچ دەکەن، لەو ناوچانەی کەوتۆتە باکوور و باکووری ڕۆژئاوای قەسری شیرین. بۆ زانیاری بڕوانە: ڤلادیمێر مینۆرسکی، بنچینەکانی کورد و چەند و تارێکی کوردناسی، و.نەجاتی عەبدوڵڵا، چ١، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ل١١٥–١١٧.

[2] Fredrik Barth: Principles of Social Organization in Southern Kurdistan,Oslo-1953, pp35-38.

[3] عماد عبدالسلام رؤوف، دراسات وثائقية في تاريخ الكورد الحديث، ص٢٣٣.

[4] Lineage –فخذ: بە گروپێکی خزمی یەکتر دەوترێت، کە لە خێزان گەورەترە، تاکەکانی پەیوەندییەکی خزمایەتی نەك گریمانەیی، بەیەکەوەیان دەبەستێتەوە، لە ڕووی ڕەچەڵەکی یەکایەتییەوە، لە باوکەوە بێ یا دایك، دەچنەوە سەر یەك. بڕوانە: د.شاکر مصطفى سليم: المصدر السابق، ص٥٦٦.

[5] شاكر خصباك: الاكراد دراسة جغرافية اثنوغرافية، الدار العربية للموسوعات، ٢٠٠٥، ل٣٥٠.

(بـارث-Barth) کـە بۆخـۆی لێکۆڵینـەوەی مەیـدانی لـەبارەی جـاف‌و هەمەوەنـدەوە ئەنجامـداوە، پێیوایـە بەرامبەرییەکـەی (لیـیچ) نـەگونجاوە، بەگوێرەی (بارث)، عەشیرەتی جاف بەسەر ژمارەیەك تیرەدا دابەش دەبێت، کە هەر یەك لەوانەش بەسـەر ژمارەیـەك هـۆزدا دابـەش دەبن. تیرە گروپێکی بنـەڕەتی رامیـاری‌و یەکەیـەکی خـاوەن زەوییـە. وێـرای ئـەوەی هـۆزیش بەرجەستەی گروپێکی ساکاری نەوەکان دەکات، کە تەواوی ئەندامەکانی خۆیـان دەبەنـەوە سـەر بابـەڵبابی هـەمویان[1]. (بـارث) پێیوایـە زاراوەی (طائفة)ی عـەرەبی رێك بەرامبـەر ووشـەی (هـۆزی) کوردییـە. لـەو بارەشـەوە قسەی لـەوە کـردووە کـە چۆن رێکدەکەوێت لقێك لـە تیرەیـەك جیابیبێتـەوە‌و گروپێکی نویێ پێکبهێنێت، ئەو گروپە تازەیـەش هـەمویان دەبێت سـەر بـە بەرەبابێك بن، بەلاٌم سەربەخۆبوونی خۆی دووپاتدەکاتەوە[2].

هەرچی (شاکر خەصباك)ە کە بۆ خۆی خاوەن چەندین لێکۆڵینەوەیە لـە بـارەی کـوردان‌و ئاگـاداری ئـەو تێـرم‌و زاراوانەیـە کـە (لیـیچ‌و بـارث) بـۆ بەرجەستەکردنی دابەشبوونی عەشیرەتی کوردی ئاماژەیان پێداوە، بڕوای وایـە: ئـەوەی کـە لـە سیستمی عەشیرەتی کورداندا دابەشکردنێکی ڕوون‌و جێگیر نییە‌و خودی عەشیرەتەکانیش یـەکڕا نین لـە بەستنەوە‌و گێڕانـەوەی یەکـەکانی ناسـیاوی‌و خزمایـەتی خۆیانـدا بـۆ عەشـیرەتێکی دیـاریکراو، پێدەچـێت پەیوەنـدی بـە بونیـادی عەشـیرەتی خـودی کۆمەڵگـەی کـوردی خۆیەوە هەبێ، کە لەسەر بنـەمای ڕەچەڵەکی هـەرەمی دانەمـەزراوە. بۆخۆی نموونەی باو لەسیستمی عەشیرەتیدا ئەوەیە کە لەسـەر بنـەمای (ڕەچەڵەکی هاوبـەش) دامـەزراوە، بـەلاٌم نموونـەی تـر هەیـە کـەمتر بلاٌوە، لـە پێکهاتنیـدا

---

[1] Barth.op. cit, pp. 34-37.

[2] Ibid, p. 37.

پشت به (هاوبەشی له شوێن)دا دەبەستێت. بەم چەشنه نموونەی یەکەم له عەشیرەتەکان پشت به (یەکێتی ڕەچەڵەك) دەبەستێ، نموونەی دووەمیش، پایەکانی لەسەر (یەکێتی شوێن) وەستاوە، هەرچی عەشیرەتی کوردانه ئەوا بەگشتی له نموونەی دووەمه[1]، بۆ وێنه ئەگەر پەیوەندی تیرەکانی عەرەب لەسەر بناغەی بنەچەو رەچەڵەکە (نسب)و هەموویان دەچنەوە سەر یەك بەرەباوان، ئەوا پەیوەندی لەنێو دەزگای عەشیرەتی کوردانەدا، لەسەر بناغەی زەوی‌و خاکە[2] و هەموو ئەو کەسانەی کە لەیەك شوێن نیشتەجێبوون دوای سەرۆك عەشیرەتێك کەوتوون ڕێنماییەکانی ئەویان پەیڕەوکردووە[3].

سەبارەت بەم پرسە (عباس العزاوي) دەڵێت: پرسیارمان زۆرکرد، نەمانتوانی ئەوە بسەلمێنین کە عەشیرەتی کوردی دەچێتەوە سەر یەك بەرەباوان، بەڵکو بەزۆری بنەچەیان دەگەڕێتەوە شوێنی نیشتەجێبوونیان، یا ئەو گوندەی کەپێکیانهێناوە، ئیدی ئەم گوندە باپیرەو بنەچەیەو ئەوەی تیا نیشتەجێیە، خۆی بەتاکێکی دەزانیێ‌و ئەو ڕەچەڵەکەی لێوەی هاتووە بیریدەچێتەوە. لەسەری دەڕوات‌و دەڵێت: "شایەنی هێما بۆ کردنە کوردەکان لەوە بترازێ خەڵکی ئەو گوندەن کە تێیدا دەژین‌و لە سەرۆك‌و گەورەکانی خۆیان زیاتر کەسی تر ناناسن‌و لەبارەی بنەچەی خێزانی خۆیانەوە شارەزانین، بە هەمان شێوەی هەندێ عەشیرەتی عەرەبی کە لە شێخی گوندەکە بەولاوە کەسی تر ناناسن، بەلاّم لەگەل ئەوەشدا تیرەو

---

[1] الاکراد، ص٣٤٦.

[2] توماس بوا: تاريخ الاكراد، ت. محمد تيسير مرخان، ط١، بيروت، ٢٠٠١، ص ٤٨.

[3] الكرد في دائرة المعارف الاسلامية، ت. حميد ريبوار، رابطة كاوة للثقافة الكردية، بيروت، ١٩٩٩، ص١٠٦.

عەشیرەتەکەی پشتگوێ ناخات"[1]، (جیرارد جالدیان) بڕوای وایە: بنەچەو ڕەچەڵەکی عەشیرەتیی لەنێو کورداندا بەراورد بە کۆمەڵگەکانی تر کەمتر جیێ بایەخە، لەراستیشدا هەرکەسێکی نامۆ بەعەشیرەت دەتوانێت خۆی بباتەوە سەر عەشیرەتێك لە عەشیرەتەکان، هەمووی چەند نەوەیەکی کەمە، منداڵەکانی تێکەڵ بەو عەشیرەتە دەبن[2]. ڕەنگە ئەم پرسە ئەوەمان بۆ ڕوونبکاتەوە کە بۆچی هەندێك لە عەشیرەتەکانی کورد، بەنێوی ناوچە یا شوێنیکی دیاریکراوی ئەو جوگرافیایەی تێیدا نیشتەجێن ناونراون، بۆ وێنە عەشیرەتەکانی (زێبار، پشدەر، بارزان...هتد.).

جێی خۆیەتی لێرەدا پوختەی ئەو دەرەنجامگیرییە بخەینەڕوو، کە (شاکر خصباك)، دوای وردبوونەوەو لێکۆڵینەوە لە بونیادی عەشیرەتی کوردی، لە بارەی ئەو زاراوەو تێرمانەی دابەشبوونی عەشیرەتی نیشاندەدەن بەدەستی هێناوە. بڕواشم وایە تێبینی و ڕوونکردنەوەکانی دەربارەی ئەو زاراوانەو بەراوردکردنیان بە هاوشێوەکانی بەتایبەت لای کۆمەڵگەی عەرەبی، واتایەکی وردترو ڕوونتری پێ بەخشیون.

بەگوێرەی (خصباك) زاراوەی (عەشیرەت) سەرجەم گروپە خزمە سەربەخۆکان لەخۆدەگرێت، ئەوانەی پێکەوە گردبوونەتەوە، لە سەرووی هەموو شتێکەوە، لە ناواخنیدا هەڵگری واتایەکی سیاسییە، کەواتە بەرامبەر هەردوو تێرمی(Clan)ی ئینگلیزیی و(العشیرة)ی عەرەبییە. هەرچی (تایفە)یە، ئەوا سەرجەم تاکەکانی خێزانەکانی عەشیرەت دەگرێتەوە، کە دەتوانن ڕەچەڵکی خۆیان بەرنەوە سەر بەرەباوانێك،

---

[1] عشائر العراق الكردية، ج٢، بغداد، ١٩٤٧، ص١٠.

[2] المأساة الكردية، ت. عبدالسلام النقشبندي، ط١، اربيل ٢٠٠٧، ص٤١.

خێڵەکییەکان لەیەك کاتدا بۆ پەیوەندیی خزمایەتیو سیاسی نێوانیان بەکاریدێنن، پێدەچێت یەکسان بێت بە تیرمی (Maximal Lineage)، کە لەیەککاتدا هەڵگری ئاماژەی سیاسیو خزمایەتییەو زاراوەکە (بەرامبەر بە: فخذ یا بطن)ی عەرەبیە. زاراوەی (تیرە)یش بۆ دەستنیشانکردنی ئینتیمای سیاسی، بۆ عەشیرەتێکی دیاریکراو بەکاردەهێنرێت، لەهەمان کاتیشدا ئینتیمای خزمایەتی بۆ گروپێکی دیاریکراوی پێدەستنیشاندەکرێت. لەراستیدا ئەم تێرمە هەڵگری ئاماژەیەك خزمایەتییە، کەواتە بەرامبەر هەردوو زاراوەی (Lineage Group)ی ئینگلیزیو (بیت)ی عەرەبییە. زۆرجار تیرە بەنێوی سەرۆکی ئێستاکێی، یا سەرۆکێکی ناوداری دێرینەوە ناودەنرێت. بەڵام بەبڕوای (خصباك) زاراوەی (هۆز) تەنها زاراوەیە کە خەڵکانی عەشیرەتەکان، لەسەر واتاکەی هاوڕان، هۆکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێنێتەوە، کە لە ڕووی جوگرافییەوە تەنها فۆرمی گونجاوە بۆ هەرێمە کوردییەکان، پێشیوایە لە خێزانێکی فراوان پێکهاتووەو بەرامبەر بە تێرمی (أهل)ی عەرەبییە، بەکارهێنانیشی بەشێوەیەکی تایبەت لەنێو عەشیرەتە شوانکارەکاندا باوەو بەنێوی بابەڵبابی هەمووانەوە ناودەنرێت.[1].

لەو کاتەدا بەشێوەیەکی گشتی عەشیرەتی کوردی لە دوو چینی جیاواز پێکهاتووە: چینێکی حوکمڕانی جەنگاوەر، کە لە بنەڕەتدا شوانکارەیەو بەرپرسە لە پاراستنی ژیانی تاکەکانی چینەکانی تر، هەرچی چینی دووەمە واتە چینی گشتی، پرۆسەی کشتوکاڵو بەخێوکردنی ئاژەڵ لە ئەستۆ دەگرێت. [2]

---

[1] الاكراد، ص٣٥٢.

[2] ڤ.ف.مینورسكی، الاكراد ملاحظات و انطباعات، ترجمة د. معروف خزندار، بغداد ١٩٦٨، ص ٣٤; شاكر خصباك، المصدر السابق، ص٣٤٨. (توماس بوا) عەشیرەت

بە بڕوای (خصباك) پەیوەستەگی ڕەچەڵەکی لەنێوان هەردوو چینی نێوبراودا نییە، هەمان پەیوەستەگیش لەنێوان تایفەکانی چینی گشتیشدا نییە. ئەمەش ڕۆڵی کرداری جوگرافی لەسەر سروشتی پێکهێنانی عەشیرەتی کوردی دەردەخات و دەسەلمێنێت.

" وەك دەزانین ناوچەکانی کورد شاخاوی و پڕ کەندو لەندەو زستانێکی زۆر ساردیان هەیە، لە وەها کەشێکدا گوندەکان ڕووبەڕووی دۆخی گۆشەگیربوون و دابڕان دەبنەوە، ئەم دۆخە لە بواری ئابوریدا سیاسەتی خۆبژێوی (الاکتفاء الذاتی)، لە بواری کۆمەلآیەتیشدا ڕۆحی لۆکاڵیزمبوونی (محلي) بەهێزکردووەو پەیوەندی تاکەکانی گوندی قولترو پەیوەستەگی خزمایەتی و ژن و ژنخوازیشی لە نێوانیاندا تۆکمەتر کردووە، بەلآم لە ڕووی کردارییەوە، ئەم پەیوەندییە تۆکمە فراوان نابێت و بۆ دەرەوەی گوند شۆڕنابێتەوە، چونکە کاتێ فشارێکی ئابوری، بەشێك لەم گروپە ڕەچەڵەکایەتییە، ناچار بە سەرهەڵگرتن بۆ شوێنێکی تر دەکات، ئەوا پەیوەستەگی خزمایەتی لەگەڵ گوندی دایکدا زوو لاواز دەبێت و لە پەیوەندی نوێی کۆمەلآیەتییاندا، جوگرافیا لۆکاڵیزمبوون بەسەریاندا دەسەپێنێ، بەم چەشنە لە ناوچە کوردییەکاندا فاکتی جوگرافی ڕێگرە لە

---

بەسەر چوار دەستەی بچووکدا دابەشدەکات ئەوانیش: ١- خانەدانەکان: پێکهاتوون لە بنەماڵەی سەرۆك و ئاغاکان، ئەمانە بەشی خاوەن ئیمتیازی عەشیرەتن. ٢- عەوام یا ڕەعییەت: ئەم دەستەیە لە خزمەتکارانی سەرۆك و بنەماڵەکەی پێکدێن، پێیان دەڵێن نۆکەر(خولام) کە هەموو کارێکیان پێدەکەن. ٣- چاودێرانی سەرۆك: ئەمانە هەمیشە چەکدارن، بۆ کاری سەخت و تایبەت ڕادەسپێردران. ٤- سەرۆکە ئاینییەکان: شێخ و مەلا و (سەیدەکان) بڕوانە: توماس بوا، المصدر السابق، ص٤٩. بێگومان ئەبێ تێبینی ئەوە بکرێت، ئەم دابەشکردنە لەنێو هەموو عەشیرەتێکدا، هەمیشە بەو شێوە دروست دەرناچێت.

بــەردەم دروســتبوونی عەشــیرەتێکی گــەورە کــە خــوێن بەیەکــەوەیان دەبەستێتەوە"[1].

بە بڕوای (بوا) هەندێ خەسڵەتو تایبەتمەندیی عەشیرەتەکانی کورد لە یەکتر جیادەکاتەوە لەوانە: جیهانی بچووکی عەشیرەتەکان کە لە ناوەوە ڕامەیلێکی ڕۆژهەلاّتانەی (نزعة شرقية) هەیە، کەواتە بەهۆی ئەو دۆخەی هەیەتی لە فۆرمێکی داکۆکیکارانەدا (دفاعی) دروستبووە، وەك روونە یاسای عەشیرەتی بناغەیەکی نەریتخوازانەی هەیە، هەر بۆیە بونیادێکی تۆکمەو هێزای هەیە، لەوەها دۆخێکدا ئاساییە ئەگەر هەستێکی بەهێزی خۆنازینو بالاّدەستبوونی بەسەر عەشیرەتەکانی دراوسێدا لا دروست ببێت، ئەم دەمارگیریو شانازییە بە عەشیرەت بێگومان وەك چۆن سەرچاوەی هێزە، لە هەمان کاتدا دەتوانین وەك خاڵێکی پۆزەتیف، بۆ دورکەوتنەوە لە خراپ لەیەکگەشتنو بەریەککەوتن (تصادم)، لەگەڵ گەلانی دراوسێ یا دەسەلاّتدارانی دەوڵەت، تەماشای بکەین[2].

(مینۆرسکی) پێی وایە بە گشتی کورد زۆر بەخێزانو عەشیرەتەوە پەیوەستن، هۆکاری ئەم پەیوەستبوونە تۆکمەیەش لە سونگەیەکی ئەمنییەوە ڕاڤەدەکات، کاتێ دەڵێت: "کوردەکان هەستێکی زۆر بەتینیان بەرامبەر خێزانو عەشرەت هەیە، بەتینتر لە هەستکردنیان بەرامبەر بە مرۆڤایەتی"، دەپرسێ:" کوردەکان کە لە چوارچێوەی هەردوو دەوڵەتی لاوازی عوسمانیو فارسدا دەژێن، پشت بەکێ دەبەستن؟ هێزو هاریکاری نێوانیان تەنها شتێکن کە پێوەی پەیوەستن، تەنها پیاوێك یا تەنها

[1] الاكراد، ص٣٤٨.

[2] بڕوانە: توماس بوا، المصدر السابق، ص ص٤٧-٤٨.

خێزانێك، لە چوارچێوەی عەشیرەتدا نەبێ ناتوانێت لەپێناو مانەوەدا تێبکۆشێت، پەرستنی عەشیرەت و تۆڵە لەمەوە سەرچاوە دەگرن"[1].

هەرچۆنێك بێت، ناتوانین بەهیچ چەشنێك چوارچێوەیەکی گشتی بۆ سەرجەم عەشیرەتەکان دابنێین، هەمیشە دوو فاکتەر چارەنووسی عەشیرەت دەخەنە ژێر کارتێکردنی خۆیانەوە: یەکەمیان: پەرەسەندن و ئاوێتەبوونە، ئەم دوو فاکتەیە دەبنە هۆی پێکهێنانی عەشیرەت و گردبوونەوەی لە دەوری کەسایەتییەکی دەرکەوتوو ئەویش (سەرۆکێکی میرخاس و لێهاتووە). دووەمیان: هەڵوەشاندنەوەو پەرتوبلاوبوونە، لە دۆخێکی نالەباری وەك لەدەستدانی سەرۆك، بلاوبوونەوەی پەتا یا نەهاتی، دێتەکایەوە ئەمەش بۆخۆی نەمانی عەشیرەت و هەڵوەشاندنەوەی لێدەکەوێتەوە[2].

سەرۆکایەتیکردن لای عەشیرەتەکانی کورد، هەڵقوڵاوی خواستی ئەو عەشیرەتانە بووە بۆ کەسێتییەك کە بتوانێت چالاکییە جۆراوجۆرەکانی کە دۆخی جوگرافی کوردستان بە سەریاندا سەپاندبووی رێکبخات و ئاراستەیان بکات[3]، ئەم سەرۆکە بە: مەزن، میر، بەگ یا بە ئاغا [4] نێودەبرا،

---

[1] ڤـ.ف.مینورسکي: المصدر السابق، ص ص٦٣-٦٤ .

[2] باسیل نیکیتین: الکرد دراسة سوسیولوجیة و تاریخیة، ت. نوری الطالبانی، ط٣، اربیل، ٢٠٠٤، ص١٥٣.

[3] شاکر خصباك: الاکراد، ص٣٧٨.

[4] عبدالرحمان قاسملوو: سەرچاوەی پێشوو،ل١٢٦; عەزیز شەمزینی، جولانەوەی رزگاری نیشتمانیی کوردستان، و. فەرید ئەسەسەرد، چ٤، سلیمانی، ٢٠٠٦، ل٥٥ ; سی. جی. ادموندز، المصدر السابق، ص١٧. شایەنی ئاماژەپێدانە (بەگ و ئاغا) نازناو گەلێکن، کە دەسەلاتدارانی تورك وەکو پایەیەك دەیانبەخشیە سەرۆك عەشرەتەکانی کورد، هەندێکیشیان بە فەرمانی سوڵتانی پلەی پاشاییان پێدەدرا، لەو بارەدا کوڕەکانی

که زۆرجار دەسەلاّتێکی یاسایی و ئیداری بێسنووری هەبووە، لە تێکڕای کاروبارەکاندا بۆخۆی بڕیاری دەدا[1] و لەگەڵ ئەوەی دەسەلاّتی ڕەها بوو، بەلاّم ڕدێنسپی و بەسالاّچووان جۆرێك لە مافی سانسۆریکردنیان بەسەر بڕیارەکانیدا هەبوو و دەنگیان قورسایی خۆی هەبوو، کە نەدەکرا پشتگوێ بخرێت[2]. ڕەشماڵی[3] سەرۆك لە هەموو ڕەشماڵەکانی تر گەورەتربووە، لە نێوەندی کۆمەڵێ ڕەشماڵی تردا، کە لە خۆی بچوکتربوون هەڵئەدرا[4]، هەر لەوێشدا کۆبوونەوە گشتییەکان سازئەدران و خەڵکانێکی نامۆ بۆ پشوودان و شیوخواردن روویان تێدەکرد، چەشنی دادگایەکی بالاّ بوو، سەرجەم کێشەکانی رۆڵەی عەشیرەتی تێدا تاوتوێ دەکراو زۆرجاریش بە بڕیارێك یەکالاّدەکرایەوە، ئیدی ئەو بڕیارە ستەمکارانە بوایە یا دادوەرانە[5].

---

نازناوی بەگیان هەڵدەگرت. بڕوانە: بدرخان السندي: المجتمع الكردي فى المنظور الاستشراقي، ط٢، دهوك، ٢٠٠٧، ص٥٧.

[1] عبدالرحمان قاسملۆ، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٦.

[2] باسيل نيكيتين: المصدر السابق، ص١٥١; عبدالرحمان قاسملۆ، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٦.

[3] (تاوڵ، دەوار، چادر)

[4](لايارد) لە ناوەراستی سەدەی نۆزدە تێبینی ئەوەی کردووە، ڕەشماڵی سەرۆك عەشیرەت گەورەترو پڕفەرش ترە و لە ناوەوە دابەشدەکراوەو ڕەشماڵ پایەی کۆمەلاّیەتی خاوەنەکەی لەنێو عەشیرەتدا نیشانداوە، تا پلەی خاوەنەکەی گەورەتربوایە ڕەشماڵەکە گەورەتر دەبوو.بڕوانە:.Austin Henry Layard, po.cit.p,310 ; بۆ زانیاری لەبارەی ڕەشماڵی کورد و جیاوازییەکانی لەگەڵ (خيمة)ی عەرەبیدا بڕوانە: شاكر خصباك: "بدو العرب ورعاة الاكراد مقارنة بين مظاهر و مقومات حياتهما"، مجلة الجمعية الجغرافية العراقية، المجلد السادس، حزيران ١٩٧٠، ص ص١٠٤-١٠٧.

[5] باسيل نيكيتين: المصدر السابق، ص١٥٠.

خاوەندارێتی سەرۆکو بنەماڵەکەی بۆ زەوی‌و زاری عەشیرەت، بەو پێیەی ئاغاو سەردار بوو بەناو بوو نەك خاوەنداریەتییەکی راستەقینە کە لە بنەڕەتدا بە کڕین بەدەستی هێنابێت [1] بە گوێرەی (ئەدمۆندز) سەرۆکی عەشیرەت لە باروونی فیودالی ئەوروپی دەچێت، هیچ کارێکی نییە، ژیانی لەسەر باجو دیارییە، کە رێژەکەی لە جێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی دیکە دەگۆڕێت، بەڵام نۆرمو رێسای گشتی ئەوەیە هەر جوتیارێك دەیەکی دەغڵو دانەکەی بدات، خاوەن مێگەلیش، ئاژەڵ، کە چەشنی باجێك بوو پێی دەوترا (گودە)، لەسەر بنەمای ژمارەی سەری مێگەلەکەی دەسەپێندرا، دەسەلاتی دەوڵەت لەهەر ناوچەیەکدا بەهێز بووایە، ڕاستەوخۆ ئەم باجەی وەردەگرت، بە پێچەوانەوە ئەگەر دەسەلاتی لاواز بووایە خودی ئاغا ئەو کارەی لە بری دەوڵەت جێبەجێدەکرد[2].

سەرۆك بەسەر هەموو کاروبارێك ڕادەگا، ئەو دەبێ مۆڵەتی ژن مارەکردن بدات، لە هەموو شتێکدا مافی پێشکەوتنی هەیە، لە ناو هاوەڵانیدا یەکەمە[3]، لە هەموو بارێکیشدا عەشیرەتەکان یا گوندییەکان بە چەشنێك کە وێنەی نییە، گوێڕایەڵی تەواوەتی سەرۆکو ئاغاکانیانن، ملکەچبوونیشیان وەك عەزاوی دەڵێت: "لە زۆرینەی ئەو دەوروبەرەی ئێمە دەیانناسین،

---

[1] شاکر خصباك: الكرد و المسألة الكردية، ص٧٠.، ا.م. مینتیشاشڤیلی، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٢.

[2] سي. جي. ادموندز: المصدر السابق، ص١٧.

[3] عبدالرحمان قاسملۆ: سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٦.

هاوتای نییە، بگرە ئەوانە لە خوداوەندو سەرۆکەکانیان بەولاوە کەسیتر ناناسن، ئەوەش بێگومان مانای ملکەچبوونی تەواوەتی دەگەیەنێت"[1].

بەرامبەر بەوە سەرۆك لە ئاست رۆڵەکانی عەشیرەتەکەیدا کۆمەڵی ئەرك دەکەونە ئەستۆی، مەترسیدارترینیان ئەوەبوو لە سەرجەم ئەو پرسانەی پەیوەندیان بە میرییەوە هەیە، ببێتە زمانحاڵیان‌و ئیدی لە سەرجەم پرس‌و کێشەکانیاندا، گەر ستەمکاربن، یان ستەملێکراو دوای بەرژەوەندی ئەوان دەکەوێت[2]. هەروەها بەڕێوەبردنی ناوخۆو دادوەری لە عەشیرەتدا[3]و ئەرکەکانی دیوەخان[4]و میوانداری کەسی نامۆ لە خواردن‌و حەوانەوە دەگرتە ئەستۆ، بێگومان سەرۆك یا ئاغا هەرچەندە لە میوانداریدا بەخشندەبێت، ئەوەندەش لە لایەن لایەنگرانییەوە ڕێزی لێدەگیرا، کاریگەری ئەم کارە ئەوەندەیە میوانداری‌و بەخشندەیی لەم کارەدا، دەبێتە

---

[1] عشائر العراق الكردية، ص١٢. (مەیجەر سۆن) لەم ڕووەوە چیرۆکێکی سەیری ملکەچبوون و گوێرایەڵی کویرانە بۆ فەرمانی سەرۆك ئاماژە پێدەکات، دەڵێت: ئەم ساڵ (١٩١٨) گروپێکی (١٠) کەسیم بینی لەو کوردانەی لە شەڕ گەڕابوونەوە، کە خۆیان(٥٠) شەڕکەربوون، لە شەڕو تێکڕژانێکی سەختدا پەکیان کەوتبوو، منیش پرسیارم لەبارەی هۆی شەڕەکە لێکردن، کەس نەیدەزانی! وەڵامەکەیان تەنیا ئەوەبوو، سەرۆکەکەمان پێی وتین کە بچن لەگەڵ پیاوەکانی (حەمە بەگدا) شەڕ بکەن و ئێمەش کردمان! بڕوانە: مەیجەر سۆن،: سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان، و. مینە، چ١، سلیمانی، ٢٠٠٧، ل٧٦.

[2] مذكرات دبليو ار.هي: المصدر السابق، ص ص٨٥-٨٦.

[3] ا.م. مینتیشاشڤیلی: سەرچاوەی پێشوو، ل٨٩.

[4] بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی دیوەخان‌و ئەرکەکانی، بڕوانە: دبليو ار.هي، المصدر السابق، ص ص٦٣-٦٦.، مارتین فان برۆنەسن، سەرچاوەی پێشوو، ل ل١٠٧-١١٥.

چاکەکارییەك کە مەسەلەی ڕەسەنایەتی بە تەواوی دەخاتەژێر هەژموونی خۆیەوە[1].

لە کاتێکدا سەرۆکایەتیکردنی عەشیرەت، زۆربەی کات میراتگرانە (وراثي) بووە، لەگەڵ ئەوەشدا لەم ڕووەوە یاسایەکی چەسپاوی پەیڕەوکراوی نەبووە، بەڵام ڕۆڵی بنەڕەتی لە جێگرتنەوەدا هەمیشە دراوەتە کوڕە گەورە، لە دۆخێکدا ئەگەر مەرجەکانی سەرۆکایەتی[2] تیادا هەبووایە[3]، ئەگەر نا، گەورەی لقەکان لە دانیشتنێکی گەورەی نائاسایدا کۆدەبنەوەو سەرۆکێك بۆ عەشیرەتەکە کاندید دەکەن، لەنێو پاڵێوراوەکاندا دەگەڕان بۆ لێهاتوو، بەتواناو خاوەن ئەزموون و دنیادیدەکان[4]. سامان سەرەکیترین بنەما بوو، دەبوو لەو کەسەدا هەبێت کە بۆ سەرۆکایەتی کاندید دەکرێت، واتە پێویست بوو خاوەن مەڕو ماڵاتێکی زۆربێت[5]. ڕوویداوە کەسێك لە میانی هێزەوە خۆی سەپاندبێ، یا هەمووان ملکەچیو دڵسۆزیان پیشاندابێت، بێئەوەی دەسەڵاتەکەی ڕەوابێت، بەڵام ئەم حاڵەتانە دەگمەنن و پێدەچێت ڕەوتی کاروبارە ئاساییەکانی نێو

---

[1] توماس بوا: المصدر السابق، ص٥١ ; درك كينان، سەرچاوەی پێشوو، ل ل١٦-١٧.

[2] لەوانە: دەبێت پیاوێکی مەردو میرخاس و خورت و جوامێر و دادوەر ودڵاوا بێت، ستراتیژزانێکی چاك و دادیارێکی کارامەبێت، توانای لەئەستۆگرتنی بەرپرسیارێتی دیوەخانی هەبێت، ئەمەی دواییان تەنها نێو و نێوبانگ پیشان نادات، بەڵکو پلەو پایەی سەرۆك دەردەخات. بڕوانە: مارتن فان برۆنسەن، سەرچاوەی پێشوو، ل ل١٠٨و١١٠.

[3] بڕوانە: توماس بوا: المصدر السابق، ص٥٠.

[4] کۆمەڵێك لە پسپۆڕان وئەفسەرانی سیاسی ئینگلیز: کورد و کوردستان، و.حسین عوسمان نێرگسەجاڕی و حسین ئەحمەد جاف، چ١، هەولێر، ٢٠٠٢، ل٣٣.

[5] ا.شاميلوف: حول مسالة الاقطاع بين الكرد، ت. كمال مظهر احمد، ط٢، بغداد، ١٩٨٤، ص ٤٧.

عەشیرەتەکەی گۆڕیبێت[١]. هەندێ حاڵەتیش ڕویداوە دەوڵەت سەرۆکێکی نوێی بۆ عەشیرەتێك داناوە، بەڵام دەبوو ئەم سەرۆکە لە هەمان بنەماڵەی سەرۆکی پێشوو کاندید کرابێت، ئەگەرنا لە دۆخێکی لەم چەشنەدا دەبوو سەرۆکی نوێ بۆ سەپاندنی شکۆو و جێبەجێکردنی فرمانەکان، خۆی و ماڵەکەی بە پاسەوان دیوارچن بکردایە[٢]. پرسی پێشبڕکێ و خۆپالأوتن بۆ سەرۆکایەتیکردنی عەشیرەت لە نێو کورداندا، مەسەلەیەکی ئاساییە، ڕەنگە کۆچی دوای سەرۆك عەشیرەتێك لەبەر هەر هۆیەك بێت، ئاژاوەو ناخۆشی لێبکەوێتەوە، تەنانەت دوور نییە کوشتن و بریندارکردنیشی بەدواوە بێت، لەگەڵ ئەوەشدا نموونەی زۆرمان لە بەردەستدایە، تێیدا کێشەی دەستنیشانکردنی سەرۆك لەڕێگەی هەڵبژاردنەوە نەبووە،دواتربۆتە هۆکارێك بۆ خوێنڕشتن و پیاو کوشتن[٣].

لەنێو ڕێکخراوەی عەشرەتیی و کۆمەڵایەتی کورداندا، ئەتوانین ئاماژە بۆ (سێ) وێنەی جیاوازی سەرۆکایەتیکردن بکەین:

-عەشیرەتێکی ئاسایی و کلاسیکی لەژێر فەرمانی میر یا ئاغایەکدا، ئەندامەکانی کۆکن لەسەر ئەوەی بنەچەیەکی هاوبەشیان هەیەو بەسەر باڵەکانی تیرەدا دابەشبوون. (وێنەی عەشیرەتی سورچی)[٤].

-عەشیرەتێك کە سەرۆکێکی فیودالْ لە بنەماڵەیەکی جیاواز بەڕێوەی دەبات، وێنەی عەشیرەتەکانی دزەیی و خۆشناو و جاف.

---

[١] باسیل نیکیتین: المصدر السابق، ص١٥٠.

[٢] توماس بوا: المصدر السابق، ص٥١.

[٣] بدرخان السندي: المصدر السابق، ص٨٠.

[٤]عبد ربة سكران الوائلي: اكراد العراق ١٨٥١-١٩١٤ دراسة فى التاريخ الاقتصادي و الاجتماعي و السياسي، اطروحة دكتوراه مقدمة الى جامعة القاهرة عام ١٩٨٧، ص٨٤.

-عەشیرەتێك كە لە ژێر دەسەڵاتی سەرۆكێكی ئایینیدایە وێڕای دەسەڵاتە ئایینییەكـە دەسـەڵاتی دونیایـشی لـە ئەسـتۆ گرتـووە، لەوانـە شـێخانی بەرزنجەو شێخانی بارزان[1]. وەك زانراوە شێخ لە هەموو كوردستاندا پایـەو ڕێزێكـی گـەورەیان هـەبووەو لەلایـەن خەڵكـەوە بـە گـشتیو موریـدانو شـوێنكەوتەكانیان بەتایبـەت بـەڕێزو شـكۆمەندییەكی بەرچـاوەوە تەماشـاكراون، چـونكە وێنـاوو بـڕوای خـەڵكی وابـوو كـە شـێخەكان لەگـەڵ پیاوچـاكانی ئیـسلامو تەنانـەت لەگـەڵ خوداوەندیـشدا لـە پەیوەندییـەكی ڕۆحیدان[2].

---

[1] توماس بوا: المصدر السابق، ص٤٨.

[2] بۆ زانیاری لەبارەی پێگەی شێخ و ڕۆڵی لە كۆمەڵگەی كوردیدا بڕوانە: وەدیع جوەیدە: سەرچاوەی پێشوو، ل ل١١٩-١٢٣.

## باسی دووەم:

## نەخشەی عەشیرەتیی لە باشووری کوردستان دا

پێشتر ئاماژەمان بۆ ئەوەکرد کە کۆمەڵگەی کوردی لە بنەڕەتدا کۆمەڵگەیەکی عەشیرەتیی بووە، بە چەشنێك کوردستان پێش جەنگی یەکەمی جیهانی بە "وڵاتی عەشیرەتەکان" ناوزەدکراوە، لە راستیدا بەهۆی زۆری ژمارەو زۆری لق و پۆلەکانیان و فرەڕایی سەبارەت بە هەندێکیان لەڕووی بنچینەو قەبارەو بایەخەوە، کارێکی سانا نییە لە تێکڕای عەشیرەتەکانی کوردستان بکۆڵینەوە، وێڕای ئەوەی قسەکردن لەبارەیانەوە لە نامەیەکدا جێگەی نابێتەوە، ئەمە وایکرد تەنها جەخت لە عەشیرەتە سەرەکی یا گرنگەکان بکەینەوە، ئەوانەی لە ئاستی پەیوەندییەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا یا سیاسەتی دەوڵەتی نێوبراو لە بەرامبەریان لەو قۆناغە مێژووییەی کە بۆ لێکۆڵینەوەکە دیاری کراوە لە رووداوەکانی ناوچەکەدا ئامادەگییان هەیە، هەرچی عەشیرەتەکانی ترە، ئەوا هەندێکیان ناوو بارستو ناوچەکانیان دەخەینەڕوو، ئەوانیتر تەنها هێما بۆ ناوەکانیان دەکەین.

١- کۆنفیدراسیۆنی عەشیرەتەکانی جاف:-

جاف عەشیرەتێکی مەزنی نیمچە کۆچەری بەنێوبانگە[1] و بە هۆی شێوازی کۆچەریبوونی زۆربەی لقەکانی و جێگیرنەبوونیان تا درەنگانی و نەبوونی پرۆسەی سەرژمێری لەو رۆژگارەدا، هەڵسەنگاندنێکی ورد بۆ

---

[1] مارك سایكس، القبائل الكردیة فی الامبراطوریة العثمانیة، ت. خلیل علی مراد، ط١، دار الزمان، سوریة، ٢٠٠٧، ص٤٠.

ژمـارەی ماڵـەکانی نییـە، ئـەو ژمارانەشـی هەیـە تـەنها خەملاّندنـە نـەك بـەرەنجامی پرۆسـەی سـەرژمێرییێکی ورد، پێدەچـێ کـۆنترین خەملاّنـدن بـۆ ژمارەی ماڵـەکانی جـاف ئـەوەی (فرەیـزەر) بێـت، کاتێـك سـاڵی (١٨٣٤) بـە نێوچـەکەیاندا گـوزەری کـردووە بـە (١٠تـا١٢) هـەزار مـاڵ یـا ڕەشمـاڵ خەملاّندوونی[1]. هەرچی (دەرویش پاشا)یە[2] کۆی لقەکانی "جاف"و ئەو خەڵکانەی لە عەشیرەتەکانی ترەوە هاتوونەتە نێویان، بە نزیکەی (٤١٠٠) ماڵی داناوە، لەوانـە (٣٦٥٠)یـان جاف بـوونو (٤٥٠)ی لـە عەشـیرەتەکانی دیکـەوە[3]، ئـەم خەملاّندنـەش لەگـەڵ ئـەوەی محەمـەد خورشـید (پاشـا)دا یەکدەگرێتەوە، کە لە ماوەی ساڵانی (١٨٤٨–١٨٥٢)دا لە ناوچەکانی نێوان هـەردوو دەوڵـەتی عوسمـانیو فارسـیدا وەك ئەنـدامێکی کۆمیتـەی سـنوور هاوەڵی دەرویش پاشا بووە[4].

بـەو پێیـەی جـاف کۆنفیدراسـیونێکی عەشـیرەتیی گـەورە بـووە، سـاڵنامەکانی عوسمـانی بایـەخی تایبـەتیان پێـداوە، سـاڵنامەی ویلایـەتی

---

[1] گەشتەکەی فرەیزەر بۆ کوردستان و میزۆپۆتامیا ١٨٣٤، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٢.

[2] دەرویش پاشا سەرۆکی کۆمسیۆنی عوسمانی بوو بۆ دیاریکردنی سنووری عوسمانی–ئێرانی لەماوەی ساڵەکانی (١٨٤٨–١٨٥٢) هەموو ناوچەکانی سنوور گەڕاوە و زانیاری یەکجار وردی لە بارەی عەشیرەت و سەرۆك عەشیرەتە کوردییەکان و ناوچە جێناکۆکەکانی نێوان هەردوو دەوڵەتی نێوبراو کۆکردۆتەوەو لە ڕاپۆرتێکدا بۆ دەسەلاّتدارانی عوسمانی بەرزکردۆتەوە، ئەم ڕاپۆرتە ساڵی ١٨٥٣ لە ئەستەنبوڵ بە تورکی عوسمانلی بلاّوکراوەتەوە و ساڵی ١٩٥٣ لە لایەن وەزارەتی دەرەوەی عیراقەوە کراوەتە عەرەبی، بۆ زانیاری سەبارەت بەم ڕاپۆرتە بڕوانە: گێلان: کوردەکانی ئێران و هێرشی عوسمانی، و. نەجاتی عەبدوڵلاّ، چ١، سلیمانی، ٢٠٠٤، ل٦٩.

[3] درويش باشا: تقرير درويش باشا لتحديد الحدود الايرانية–العثمانية سنة ١٨٥٣، مطبعة الحكومة، بغداد ١٩٥٣، ص٣٠.

(5) Mehemed hurşid paşa: Seyãhatnãme-I Hudûd,Çevrimyazi:Alãattin Eser, Istanbul-1997,S-181.

(موسـڵ)ی سـاڵی (١٣١٠ك–١٨٩٢)، لقـەكانی (میكـایلی، شـاتری، یـزدان بەخشی، رۆغزایی، گلاڵی، هارونی، نەورۆڵی، سەدانی (سادەنی)، عەمەڵە) ناو هێناوەو و ژمارەی ماڵەكانیانی بە (٦٨٥٠) ماڵ داناوە، كە لە ڕاستیدا ئەمانـە ژمارەگـەلێكی وردو تـەواوەتی نییـەو تـەنها خەملاٚندنـە[١] هەرچـی سەرچاوەكانی دوا دەیەی سەدەی نۆزدەهەمە تێكرای لقەكانی (جاف)یان بە (١٢) هەزار ماڵ خەملاٚندووە[٢]. لـە سـەرەتاكانی سـەدەی بیستەمیشدا، هـەر یەك لە (مارك سایكس)و (میجەر ئی. ب. سۆن) ژمارەی ماڵـەكانیان بـە (١٠) هــەزار دانــاوە[٣]. بـەگوێرەی مینۆرســكی دەوروبــەری ســاڵی (١٩١٤) لــەم ژمارەیـە (٢٠٠٠)یـان نیـشتەجیٚو (٨٠٠٠)یـشیان كۆچـەری بـوون[٤]. پـەلی كۆچەری جاف لە زستانان بە زۆری بە درێـژایی ڕووباری سیروان بە دیوی ڕۆژئاوایـدا لـە بانیخێلاٚنـەوە تـا بەرامبـەر قزڵرەبات دەژیـان، هاوینـانیش لـە ڕێگـەی ناوچـەی پێنجوێنـەوە خۆیـان دەگەیانـدە نـاو خـاكی ئێـران لـە نزیـك سنە (كوردستانی ئێران)، هەرچی تیرەكانی (بەداغیو سادەنی)یـە برێكجـار هۆرێنو پێدەشتی شێخانیشیان دەبڕی[٥].

---

[١] سالَنامت ولایت موصل، ١٣١٠ ﻫ، ص٢٢٧ .

[٢] بڕوانە: علي اكبر كردستاني: المصدر السابق، ص ١٦٤; فەیسەڵ دەباغ: كوردستان لە چاپكراوە عوسمانییەكان، چ١، هەولیر، ٢٠٠٤، ل٥٥.

[٣] بڕوانە: مارك سایكس: المصدر السابق، ص٤٠; مێجەر ئی. بی. سۆن، چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەكانی كوردستانی خوارو‌و، ل٦٧.

[٤] ڤلادیمێر مینۆرسكی: بنچینەكانی كورد و چەند و تارێكی كوردناسی، ل ل٧٤–٧٥.

[٥] مێجەر ئی. بی. سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەكانی كوردستانی خواروو، ل٦٥;

Naval Staff: Intelligence Department: A handbook of Mesopotamia.vol.1. second edition (N-1918),P.111.

جاف لە بنەڕەتدا لە ڕووی ژمارەوە لەوە کەمتربوونو لە (جوانڕۆ) لە ناوچەی ئەردەڵاندا نیشتەجێبوون، تا سەرەتاکانی سەدەی هەژدەهەم لەو ناوچەدا بەبێ کۆنترۆڵی هیچ ڕەعیەتێکی ئێرانی، لەژێر دەسەڵاتی خانەکانی ئەردەڵاندا ئەو ناوچەیان بەڕێوەبردووە، بەڵام بەهۆی ناکۆکییەك[1] لەگەڵ ئەردەڵانەکاندا، پاش کوژرانی سەرۆکی جافو برایەکی، ژمارەیەکی زۆری سەرۆکی لقەکانی هەڵدێنو پەنادەبەنە بەر پاشای بابان، لەکاتێکدا ژمارەیەکی کەمی لقەکانی جاف هەر لە (جوانڕۆ) دەمێننەوە لەوانە: قوبادی، باوەجانی، ولدبەگی، ئایناخی، ئیمامی، دەروێشی..هتد[2] ئەمانە پاشتر بە جافی جوانڕۆ[3] ناسران.

---

[1](نکیتین) هۆی ناکۆکی نێوان جافەکان و ئەردەڵانەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەوەی گوایە ناوچەکانی جاف زۆر بە پیت بووەو هێزو تین و توانایشیان هەمیشە لە پەرەسەندندا بووە، ئەمەش خانەکانی ئەردەڵانی نیگەران کردووە، بۆیە هەوڵیان داوە دەسەڵاتی خۆیان بەسەر ناوچەکانیاندا بسەپێنن. باسیل نیکیتین: الاکراد، ص٢٠٥.

[2] مێجەر ئی. بی. سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، ل ل٦٦-٦٧.

[3] سی. جی. ادموندز: المصدر السابق، ص١٣٠.

هەرچی گروپە گەورە کۆچکردووەکەیە، بە جافی مورادی نێوبراون[1]، پاشتر پۆلێکی تر لە جافەکانی جوانرۆ ئەوانەی زانییان مەحاڵە بتوانن لەژێر دەسەڵاتی ئەردەڵانەکاندا بمێننەوە، بڕیاریاندا بچنە نێو خاکی گۆرانەوەو ملکەچی سوڵتاکەنیان بن، ئەوانیش پێکهاتبوون لە لقەکانی: قادر میروەیسی، تایشەی، قەڵغان چاگی، یوسف یارئەحمەد، کۆیك، نێرژی، گورگایش‌و ئەمانە بە جافی گۆران ناسراون[2]. تەنیا لقێك کەلەم دوو کۆمەڵە جیادەبێتەوە( شەرەفبەیانیە)، ئەوانیش هاتوونەتە نێوچەی (هۆرێن- شێخان)و سەربەخۆ ژیاون[3].

پێدەچێت نێوی جاف بۆ یەکەم جار لە پەیماننامەی ساڵی (١٦٣٩) نێوان دەوڵەتی عوسمانی‌و فارس هاتبێت[4]و لە رۆژگاری پێش دەرکەوتنی

---

[1] بەپێی مێژووەکەی کەریم بەگی جاف ئەم نازناوە لەوەوە هاتووە، جافەکان لەسەردەمی سوڵتان مورادی چوارەمدا (١٦٢٣-١٦٤٠) چونەتە سنووری بابان لە شارەزوور و دواتر گەڕاونەتەوە زێدی خۆیان لە جوانرۆ، ئیدی جافەکانی جوانڕۆ و کرماشان ئەو ناوەیان لێناون. بڕوانە: کەریم بەگی جاف، تاریخی جاف، لێکۆلینەوەی حەسەن جاف، چ١، ١٩٩٥، ل١٤٧. (نیکیتین)یش ئەڵێ: ساڵی ١٦٣٨ جافەکان لە پرۆسەی داگیرکردنی (بەغداد)دا هاوکاری سوڵتان مورادی چوارەمی عوسمانیان کردووە، ئەویش نازناوی مورادی پێبەخشیون. بڕوانە: باسیل نیکیتین، الاکراد، ص٢٠٦. هەرچی (محەمەد خورشید پاشا)یە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا بە (جافی سلێمانی) ناوی بردوون، ئەوانەی ئێرانیش بە (جافی زەهاو).بڕوانە: Mehemed Hurşid paşa: A.G.E, s.181

[2] مێجەر سۆن، سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان، ل١٢٤.

[3] هەمان سەرچاوە، ل١٢٥; محەمەد ئەمین زەکی بەگ، تاریخی سلیمانی و وڵاتی، ب٣، چ٢، سلیمانی، ٢٠٠٦، ل ١٣٠.

[4] عباس العزاوی، عشائر العراق الكردية، ص٢٠.

عوسمانییەکانـدا لـەم ناوچـە بـەم نـاوەوە نەناسـراون، چـونکە لـە سەرچـاوە مێژووییەکاندا ئاماژەیان بۆ نەکراوە[1]. لـە بەڵگەنامەیـەکی عوسمانیـشدا کـە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە سـاڵی (١٧٠٠)، ئامـاژە بـۆ ئـەوەکراوە کـە مەڵبەنـدە بەراییـەکانی جـاف لـە بنەڕەتـدا دەوروبـەری بەغدایـە[2]. بـڕوای بـاویش وایـە مێـژووی جـافی مـورادی لـە هـەلاتن یـا کۆچـکردنی (زاهـیر بـەگ)ەوە، لـە سـەردەمی مـورادی چـوارەم (١٦٢٣–١٦٤٠) دەسـتپێدەکات، نێـوبراو بـە خـۆیو (٤٠٠) ماڵـەوە، بـە یـاوەری (خانـە بـەگی) باوکـە گـەورەی بـەگزادەی وڵدبـەگی، لـە جـوانڕۆوە چـونەتە بـانیخێلان، کـە دەکەوێتـە دیـوی ڕۆژئـاوای ڕووباری (سیروان) لەو ناوچەیەی کەوتۆتە نێوان پێبازو هەڵەبجـە[3]. دواتـر لەگـەڵ ڕۆژگـاردا ژمـارەو پێگـەیان ڕوو لـە زیـادبوون دەکـاتو بـە ڕێککـەوتن

---

بە گوێرەی ئەم پەیماننامە کە بە زەهاب ناسراوە، هەردوو تیرەی جاف (هاروونی و زیائەددین)ی خراونەتە ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکان. بڕوانە: هنری رۆلنسن" سەرجەمی ئەو پەیمانانەی بەندن بەکێشەی نێوان تورك و فارس"، و. نەزەند بەگی خانی، گۆڤاری کاروان، ژ. (١١)ی سال ١٩٩٤، ل٧

[1] زرار صديق توفيق، القبائل و الزعامات القبلية الكردية فى العصر الوسيط، ط١، اربيل، ٢٠٠٧، ص ٥١.

[2] عماد عبدالسلام رؤوف، دراسات وثائقية في تاريخ الكرد الحديث، ص٢٤٨.

[3] کەریم بەگ، سەرچاوەی پێشوو، ل ل١٤٧–١٤٨.

مێژووی هاتنی (زاهیر بەگ) یەکدەنگی لەسەر نییە، مەستورەی کوردستانی کۆچی عەشایەری جاف بەسەرۆکایەتی (زاهیر بەگ) ئەگێرێتەوە بۆ سەردەمی نادر شای ئەفشار بە دیاریکراویش بۆ ساڵانی (١٧٤٢–١٧٤٣ز). بڕوانە: مەستوورە کوردستانی، سەرچاوەی پێشوو، ١١١. هەرچی (سی.جی.ادموندز)ە، پێی وایە باوەرپێکراوترین ساڵی ( ١٧٧٢)ە، ئەو کاتەی ئەحمد پاشا میری بابان بووە. بڕوانە: کرد و ترك و عرب، ص١٣٠.

لەگەڵ بابانەکان، دەوڵەتی عوسمانی ریگەی پێدان ئەم ناوچانەی خوارەوە بگرن:

لە هاوینان لە ناوچە بەرزاییەکانی سنووری ئێران لە دەوروبەری پێنجوێن و لە زستانیشدا ئەو زەوی و زارانەی کە سەر بە (کەرکوك)ن، لە پایزان و بەهارانیش پێدەشتی شارەزوور، لە حکومەتی لۆکاڵی گوڵعەنبەر[١]، زۆری نەبرد هێزو تواناکانیان لە ناوچەکەدا بەچەشنێك بەرچاو دەبێت، کاتێ ساڵی (١٨٢٠) (کلودیوس جیمس ریچ) دەچێتە ناوچەکەو چاوی بە (کەیخەسرەو بەگ)ی سەرۆکی جاف دەکەوێت، دەڵێت: لە کاتی شەڕداو بۆ جێبەجێکردنی داواکارییەکانی میری بابان، جافەکان توانایان هەبووە دوو هەزار سوار ئامادەبکەن[٢]. هەر لەو ماوەیەداو لە چوارچێوەی بەشداریکردنی لقەکانی (جاف)دا لە ناکۆکییەکانی نێوان عەبدوللا پاشاو مەحموود پاشای باباندا (حسین ناظم بیك) ئاماژەی بۆ (١٠) هەزار سوارەی جاف کردووە کە پشتی مەحموود پاشای بابانیان بەرداوەو داویانەتە پاڵ عەبدوللا پاشا[٣]. بێگومان ئەم ژمارە وردو تەواو نییەو زۆر زێدەڕۆی تێداکراوە، بەتایبەت کە خەملاندنەکان بۆ ژمارەیماڵەکانی جاف چەندین ساڵ دوای ئەو رۆژگارە نیوەی ئەو ژمارە نەبووە.

---

[١] مێجەر ئی. بی. سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، ل٦٧.

Gengiz Eroğla: Murat BabuÇoğlu,Orhan özdil, S.210.

[٢] Claudius James Rich: op, cit, p.112

[٣] بڕوانە: حسين ناظم بيگ: تاريخ الامارة البابانية، ت. شكور مصطفى و محمد الملا عبدالكريم المدرس، ط١، هەولێر، ٢٠٠١، ص ص٣١٥-٣١٦.

لەڕاستیدا دوای پەیماننامەی زەهاو نێوی جاف لە نێو رووداوەکانی ناوچەکەدا زۆر بەکەمی هاتووە، چونکە میرەکانی بابان بەسەر عەشیرەتەکانی ژێر دەسەڵاتیاندا باڵادەستبوون، لەوانە لقەکانی جاف. دوای داڕوخانی میرایەتی بابان و تێکچوونی ئارامی ناوچەکە، عەشیرەتی جاف بەهێز دەبێت و خەڵکان و گروپگەلی تر لە عەشیرەتەکانی ناوچەکە دەچنە ناویەوە (١). راپۆرتەکەی (دەرویش پاشا) باس لە فرەیی لقەکانی جاف دەکات و دەڵێت: "لە زستانان لە سلێمانی و دەوروبەری و هاوینانیش لە ناوچەی سنە ژیان دەگوزەرێنن، ساڵانە بە دوو بەش (قسط) (٧٠٠٠) قران(٢) وەك خەرجخانە دەدەنە موتەسەریفی سلێمانی... تا سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم باجی لەوەڕگەیان داوەتە وڵاتی ئێران، بەڵام لە ئێستادا هیچیان پێنادەن"(٣).

لقەکانی جاف رۆژ دوای رۆژ ژمارەیان پتردەبوو، بەڕادەیەك ئەو هەرێمەی تیابوون بەشی نەدەکردن و بوونە جێفشار بۆ وردە عەشیرەتەکانی وەك (زەند، گێژ، رۆژبەیانی) و لە شوێنی خۆیان لە ناوچەکانی سەرقەڵاو رۆژهەڵاتی کفری هەڵیان تەکاندن (٤).

---

(١) Barth. op.cit, p. 14

(٢) قران: دراوێکی زیوی ئێرانییە، لە دوو جۆر پێکدێت، یەکەمیان " قرانی ناسر شا"یە و بەناوی ناسرەدین شای قاجارەوە (١٨٤٨-١٨٩٦) ناونراوە بەرامبەر بە $4\frac{17.5}{40}$ قرشی عوسمانی بوو، دووەمیشیان (قرانی باناباد)ە، و بەرامبەر دوو قرش و چواریەکی قرشێك بووە. بڕوانە: غانم محمد علي: المصدر السابق، ص١٧٣.

(٣) درويش باشا: المصدر السابق، ص ٣٠.

(٤) سي. جي. ادموندز، المصدر السابق، ص١٣٢.

محەمەد خورشید پاشا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا جافەکان، سێ (بەگ) سەرۆکایەتی دەکردن، ئەوانیش محەمەد بەگ کەیخەسرەو بەگو محەمەد بەگی قادر بەگو محەمەد بەگی کوڕی ئەحمەد بەگ بوون، یەکەمینیان سەرۆکایەتی زۆرترین ژمارەی جافی دەکرد[١]. سەرۆکەکانی جاف دەسەڵاتێکی گشتیان بەسەر تیکڕای پۆلەکانی عەشیرەتەکەدا هەبوو[٢]. بەلاَم جیابوونەوەی چەند لقێکیان ئەم دەسەلاَتەی کزو لاوازکرد[٣] سەرۆکایەتیکردنیش بەدەست لقی ئەرستۆکراتی بنەماڵەی جافەوە بوو کە پێیان دەوترا ( بەگزادە)، سێ پۆل بوون ئەوانیش: ولد بەگی، خەسرەو بەگیو بەهرام بەگییە، دەکرێ سەرۆکی سیاسی عەشیرەتەکە لە یەکێك لەم سێ پۆلە بێت[٤]. تا ساڵی (١٨٨٠) سەرکردایەتی بە دەست (محەمەد پاشای کوڕی کەیخەسرەو بەگ)ەوە بوو، پاش ئەو دەسەلاَتی جاف بەسەر کوڕەکانیدا (مەحموود پاشا، عوسمان پاشا، محەمەد عەلی) دابەش دەبێت.

بە گوێرەی تێبینییەکانی (مێجەر سۆن) کە ساڵی (١٩٠٩) نووسیویەتی، لقەکانی ( ئەمەڵە، جافی تیلان، جافی سەرتەك، میکایلی، شاتری، یەزدان بەخشی، روغزایی، گلاڵی، هارونی، سادەنی، ئاغا سوری، چەنگەنی، باشکی، زەردوی، شیخ سمایلی، موسەوی، تیلەکۆ) لەژێر فەرمانو سەرکردایەتی (مەحموود پاشا)دا بوون، کە بە سەرۆکێکی گشتی

---

[١] Mehemed Hurşid paşa: A.G.E, s.182.

[٢] عباس العزاوي، عشائر العراق الكردية، ص٢٢.

[٣] مێجەر ئی. بی. سۆن، چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، ل٦٥.

[٤] Barth: op. cit, p. 41.

ناسراوبووەو هەمیشە لە گەڵیاندا گەرمیانو کوێستانی کردووەو لە کۆچو رەودا پێکەوەبوون[1]. لە کاتی پێویستدا لە توانایدا بووە (٤٠٠٠) پیاوی هەڵکەوتوو بە تفەنگی (مارتینی) سازو ئامادەبکات[2]. پاش ئەویش (عوسمان پاشا)یەو سەرۆکی بەشی دووەمی عەشیرەتەکەیە، ئەوانەی لە شارەزوور نیشتەجێن، نزیکەی هەموو ناوچەی گوڵعەنبەری بەدەستەوەیە، لەگەڵ ئەوەی بەهێزە، کەچی دەستی لە هەموو شت هەڵگرتووەو بووە بە قایمقامی هەڵەبجە.[3] لە (قزڵرەبات)یش (محەمەد عەلی)یان خاوەن باخو بێستانێکی زۆر بووەو ژیانێکی ئاسوودە ژیاوە[4].

### ٢- باجەلان

ئەم عەشیرەتە لە دوو پۆلی سەرەکی پێکدێت، (جومورو قازانلوو)، (جومور): پێکهاتوون لە لقەکانی (سەگەوەند، حاجیلەر، غەریبوەند، شێرەوەند، چوارکلاو، مەمەوەند، داودەوەند، جەلیل ئاغا)، هەرچی (قازانلوو)یە لقەکانی بریتین لە (حاجی خەلیل، والی ئاغا، عەبدولرەحمان ئاغا)[5]. دوو لقی تری قەزانلوو هەن یەکەمیان لە ناوچەی (بایبوخ-بابوك)ی لە نێوان زێو موسڵ دا دەژین، دووەمیشیان لە نزیك کەرکوك[6]. ئێزەدی

---

[1] سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان، ل ل١٢٥-١٢٦.

[2] میجر سون، رحلة متنكر الى بلاد مابين النهرين و كردستان، ت. فؤاد جميل، ج١، ط١، بغداد، ١٩٧٠، ص٢٨٧.

[3] سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان، ل ١٢٦.

[4] میجر سون، رحلة متنكر الى بلاد مابين النهرين و كردستان، ص ٢٨٧.

[5] مێجەر.ئی.بی.سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، ل٣٥.

[6] تقرير دائرة الحاكم المدني البريطاني في العراق، ملاحظات عن عشائر كردستان الجنوبية "بين الزاب الكبير وديالى" (١٩١٩)، ت. فؤاد حمة خورشيد: ط١، بغداد، ١٩٧٩. ص٢٠.

وەك گەلە عەشیرەت ئاماژەی بۆ كردووون[1]. ژمارەیماڵەكانیان بە (١٣٠٠) خەملێندراوە[2].

شـوێنی (جومـور)ەكـان، ئـەو پێدەشـتەیە كـە بـە باجـەلان ناسـراوەو سـنوورەكەی بـەم شـێوەیە: لـە بـاكوورەوە جۆبـاری (جـدول) عەباسـان، لـە باشـوورەوە ڕێگـەی قەسـری شـیرین-كرماشـان، لـە ڕۆژهەڵاتـەوە گردۆڵكـەی داری دیوانو بێشكان، لە ڕۆژئاواشەوە ڕووباری سیروانو بەرزاییەكانی ئاغ داغ. هەرچی شـوێنی (قازانلوو)ەكانیـشە، لـەو پێدەشـتەیە كـە بـە (بنكـورە) ناسـراوەو سـەر بـە خانەقینـە، سـنوورەكەی بـەم شـێوەیە: لـە بـاكوورو ڕۆژئاواوە ڕووباری سیروان، لە باشـوورەوە باوەپلاویو جەبـەل مـرواری، لـە ڕۆژئاواوە ئاغ داغ[3].

لە بەڵگەنامەكانی عوسمانیدا ئەم عەشیرەتە بەشێوەی (باجوانلو، باجوان، باجـەلان) نێـوی هـاتووە، بـۆ وێنـە لـە دابەشـكردنە ئیدارییـە بەراییـەكانی عوسمانیــدا بــەدیاریكراوی ســاڵی (١٥٤٤)، لــە چوارچــێوەی ویلایــەتی بەغدادا، وەك لیوای (باجوانلو) كە (دونمز بەگ) میرییەتی نێوی هاتووە[4]. وەك لـە بەشـی یەكەمیـشدا ئامـاژەم پێـدا، لـە چوارچـێوەی (لوڕسـتان)ی ویلایـەتی تـازە دروسـتكراوی عوسمانیـدا لـە كوردسـتانی باشـوور، وەك سەنجق/لیوای باجوانلو نێوی هەیە، پاشتریش كـە عوسمانیـەكان ویلایـەتی

---

[1] میهرداد ئیزەدی، سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٠..

[2] مێجەر ئی. بی. سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەكانی كوردستانی خواروو، ل٣٥ ; محمد مردۆخی كردستانی: تاریخ مردوخ، چ.اول، تهران، ١٣٧٩، ص٩٠.

احمد عثمان ابوبكر: المصدر السابق، ص٥٣٥ ; Mehemed Hurşid

[3] paşa: A.G.E, ss.89-90

[4] فاضل بیات: الدولة العثمانیة فی المجال العربي، ص٢٩٨.

(نێوبراویـان هەڵوەشـاندەوە، باجـەلأن لـە چوارچـێوەی ویلایـەتی بەغـدادا پێگـەی (میرایـەتی/سـەنجق)ی پێـدراوە. کـە مـیر( دونمـز بـەگ)ی میریـشیان ساڵ(١٥٥٠) دەمرێت، میرمیرانی بەغداد (عەلی پاشا) نوسـراوێك ئاراسـتەی دەوڵـەتی عوسمـانی دەکـات، لـە هەڵبـژاردنی میر سـەنجقێك بـۆ عەشیرەتەکە ئاگاداریان دەکاتەوە، تیایدا ئاماژە بـۆ ئـەوە دەکـات کـە کوێخـاو گـەورەکانی باجـــەلأن داوای دانـــانی (دلاوەر پاشـــا)ی ئـــامۆزای (دونمـــز) دەکـــەن، حکومەتیش داواکەی بۆ جێبەجێکردوون[1].

لە دەفتەری دامەزراندنەکانی عوسمانی نێوان ساڵانی (١٥٧٣-١٥٨٦) لە چوارچێوەی ویلایەتی بەغدادا، باجوان (باجەلأن) وەك لیوایەك کە حەوت قۆناغێك (مراحل) دەکەوێتە باکوری بەغداد نێوی هاتووە، بەڵام لە دەفتەر دامەزراندنەکانی نێوان ساڵانی (١٦٣١-١٦٤٢) وەك لیوای باجەلأن ئاماژەی بۆ کراوە[2]. پاش روداوەکەی بەکر سوباشی لە ساڵی ١٦٢٣[3]و داگیرکردنی بەغداد لە لایەن سەفەوییەکانەوە، ئەم عەشیرەتە کە ئەوکاتە (عوسمان بـەگ) ســەرۆکی بــووە، ملکەچــی دەســەڵاتی ســەفەوییەکان بــووە، بــەڵام دوای سـەرلەنوێ داگیرکردنـەوەی بەغـداد لەلایـەن عوسمانیەکانـەوە لـە سـەردەمی (مـورادی چـوارەمدا)، باجـەلأن دەچـنەوە ژێـر دەسـەڵاتی عوسمـانی، هەرچـی عوسمانییەکانـە میرایەتیەکـەیان هەڵناوەشـێنێتەوەو دانینـاوە بـە عوسمـان بـــەگی سەرۆکیـــشیاندا[4]. بـــەپێی (هینـــری رۆلنـــسن) دوای بەســـتنی

[1] المصدر نفسه: ص٣٦١.
[2] فاضل بيات: المصدر نفسه ، ص ص٣٠٣ و٣٠٨.
[3] بۆ زانیاری لە بارەی ئەم رووداوە بڕوانە: ستيڤن هيمسلي لونكريك، المصدر السابق، ص٧٠-٧٥ ; علي شاكر علي: تاريخ العراق فى العهد العثماني،٢٩-٣٧.
[4]فاضل بيات: الدولة العثمانية فى المجال العربي، ص١٠٢.

پەیماننامەی زەهاو(١٦٣٩) سولّتان موورادی عوسمانی (دەرنە)ی پێشکەش بە عەشیرەتی باجەلاّنی لایەنگیری کردووە، کە پێشتر جێی عەشیرەتی کەلّهوڕ بووە، بەلاّم لە دەوروبەری سالّی (١٧٠٠) کەلّهورەکان بە چاوپۆشی فەرمانڕەوای کرمانشا باجەلاّنەکانیان لە دەرنە دەرکردو ناچاریان کردن خۆیان لەو ناوچەو دەشتاییانە بکوتن کە ماوەیەك دواتر پاشای باجەلاّن شاری (زەهاو)ی لێدروستکرد، ئیدی پاشاکانی باجەلاّن تا سەرەتاکانی سەدەی نۆزدە بە پێی بەرژەوەندییەکانی خۆیان دەبنە پشتگیریکەری بەغدادو سلێمانی (بابان)و کرمانشا[1].

لە دوا چارەکی سەدەی حەڤدەهەمدا (ئەرقود بەگ) سەرۆکیان بووەو وەك (سنجەق میرایەتی عەشیرەتی باجەلاّن) لە دابەشکردنە ئیدارییەکاندا ناوی هاتووە، دوای ئەویش محەمەد بەگی ئامۆزای سەرۆکایەتی عەشیرەتەکەی لە ئەستۆ گرتووە، لەسەر بنچینەی گونجاندنی لەگەلّ رۆلّەکانی عەشیرەتەکەیدا لە (٣ی نیسانی ١٦٨٧)دا سەرلەنوێ میرایەتی عەشیرەتەکەی پێدراوەتەوە، لە قۆناغی عوسمان بەگدا هەردوو سنجەقی درنەو درتەنگ بە عەشیرەتی باجەلاّن سپێردراوە، لە ڕاستیدا ئەم عەشیرەتە وەك سنجەق میرایەتییەك تا دەگاتە سالّی (١٧٣٠) نێوی هەیە[2]. بۆ یەکەم جار عوسمانیەکان نازناوی پاشایەتیان بەخشیە (ئەحمەد پاشای باجەلاّن) کە لە پایتاق لەگەلّ نادر شای ئەفشاردا (١٧٣٣-١٧٤٧) جەنگاوە، کە بەگوێرەی (هنری رۆلنسن) نێوبراو بۆ بەرگریکردن لە (دەرتەنگ) دژی نادر شا ئەشکەنجەیەکی زۆری چێژتووە[3]. لە سالاّنی دواتریشدا چەندین سەرۆکی تری ئەم عەشیرەتە نازناوی پاشایەتیان پێبەخشراوە.

---

[1] هنری رۆلنسن: سەرچاوەی پێشوو، ل١٣.

[2]فاضل بيات: الدولة العثمانية فى المجال العربي، ص١٠٢و ٣١١.

[3]هنری رۆلنسن: سەرچاوەی پێشوو، ل١٣.

بەهۆی پەلامارەکانی کەریم خانی زەندەوە (١٧٥٩-١٧٧٩)، (زەهاو)ی بنکەی باجەلاّن بە لەشکری (خان) وێران و کاولکراو عەبدولاّ پاشای سەرداری باجەلاّن و خەڵکەکەی ئاوارەی ناوچەکانی کۆیسنجەق و موسڵ بوون، دوای پێنج تا شەش مانگ مانەوە لە زەهاودا، والی بەغداد حەسەن پاشا (١٧٧٨-١٧٨٠)، عەبدولّا پاشای باجەلاّن بە ئەرکێکی تایبەت ڕەوانەی لای کەریم خان دەکات ، بەلاّم بەهۆی مردنییەوە لەو ماوەیەدا عەبدولقادر پاشای کوڕی دەکرێتە موتەسەریفی ناوچەکە[1].

ساڵی (١٨١٦) (جیمس بیکنگهام) چۆتە پێدەشتەکانی باجەلاّن و (زەهاو) کە ئەوکات شارۆچکەیەکی (١٠٠٠) ماڵی و مەڵبەندی (عەبدولفەتاح پاشا)ی[2]باجەلاّن بووە، لەوێوە تێکڕای ناوچەکانی باجەلاّن و هەرێمە دراوسێکانی ملکەچی دەسەلاّتی ئەوبوون[3]، بۆخۆیشی سەر بە ویلایەتی

---

[1] بڕوانە: درویش پاشا: المصدر السابق، ص ١٤.

[2]عەبدولفەتاح پاشا کوڕی گەورەی ئیبراهیم پاشای باجەلاّن بووە، ساڵی (١٧٨٦) و لەسەردەمی سلیمان پاشا (١٧٨٠-١٨٠٢)ی والی بەغدادا، پاشایەتی (درنە و باجەلاّن) وەردەگرێت، بەهۆی کەمتەرخەمی لە هاوکاریکردنی والی نێوبراودا دژ بە سلیمان شاوی و شێخی مونتەفیك دەسەلاّتی لێوەرگیراوەتەوە، بەو شێوە چەند جارێك دادەنرێت و لادەدرێتەوە، تا ساڵی (١٨١٦) کە ساڵی هاتنی (بێکنگهام)ە بۆ ناوچەکە جارێکی تر دادەنرێتەوە. بڕوانە: جمال بابان"نظرة الى تأريخ عشيرتی(پشدەر-الميراودلیین) و باجەلاّن (باجلان)، گۆڤاری کۆری زانیاری عیراق"دەستەی کورد"ب٢٣-٢٤، بەغدا ١٩٩٢، ص ص٢٥٧-٢٥٨.

[3](المنشي البغدادي) کارمەندی نشینگەی بریتانی لە بەغداد، و هاوڕێ گەشتی (کلودیوس جیمس ریچ) کە ساڵی (١٨٢٠) ڕێی لە ناوچەکە دەکەوێت، ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە باجەلاّن(٣٠٠) دێی هەبووە و (زەهاو) بنکەیان بووە. بڕوانە: المنشي البغدادي، المصدر السابق، ص ٦٢.

بەغداد بووە، لە کاتێکدا پێشتر ناوچەکە ماوەیەکی زۆر لەژێر دەسەڵاتی فارسدا بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە بۆچوونی (بیکنگهام)، ناوچەکە هەر چەشنە دەسەڵاتێکی دەرەکی رەتکردۆتەوە[١]. چوار ساڵ دوای (بیکنگهام) نشینگەی بریتانی لە بەغداد (کلودیوس جیمس ریچ) لە گەشتەکەیدا بۆ کوردستان، رێی کەوتۆتە (بنکورە)ی سەنتەری باجەلان (لقی قازانلوو)، و بۆتە میوانی (حەسەن ئاغا)ی سەرداریان و ئەویش میوانداریییەکی شایستەی کردووە[٢] .

بەهۆی لاوازی ویلایەتی بەغدادەوە لە قۆناغی چاوتێبڕینەکانی (محەمەد عەلی میرزا)دا[٣]، بۆ ناوچەکانی میرایەتی بابان، بنەماڵەی باجەلان و جوتیارە سەربەخۆکانی ناچارکراون بچنە نێو شەڕێکی نایەکسانەوە لەگەڵ نێوبراو، دەرەنجام باجەلانەکان ناچاربوون زەهاو چۆڵبکەن[٤]. پاش مۆرکردنی (پەیماننامەی ئەرزرۆمی دووەم لە ٣١ی مایس ١٨٤٧) کە عوسمان پاشای

---

[١] بڕوانە: جیمس بیکنگهام، المصدر السابق، ج٢، ص٢٣٤ و دواتر

[٢] Claudius James Rich: op, cit, p.215

[٣] محەمەد عەلی میرزا: کوری فتح عەلی شا(١٧٩٧-١٨٣٤)ی ئێرانە، لە ماوەی حوکمڕانی باوکیدا لە نێوان ساڵانی(١٨٠٦ تا ١٨٢١) کراوەتە حاکمی کرماشان، لەو ماوەدا نەخشی بەرچاوی لە رووداوەکانی ناوچەکەدا هەبووە، هەوڵەکانی بۆ لکاندنی ناوچەکانی میرایەتی بابان بە دەسەڵاتی ئێرانەوە بە " شمشێر و قەڵەم"ەوە بەردەوام بوو. بڕوانە: ستیڤن هیمسلی لونکریك، المصدر السابق، ص٢٩٢; مێجەر سۆن، سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان، ل٩٨. بۆ زانیاری زیاتریش بڕوانە:عبدالعزیز سلیمان نوار، داود باشا والی بغداد، دار الکاتب العربي للطباعة والنشر، القاهرة، ١٩٦٨، ص ص١٦١-١٨٢.

[٤] تقریر دائرة الحاکم المدني البریطاني في العراق ، ص ص ٢٣-٢٤.

باجـەڵان بـۆ خـۆی بەشـداری تیـاکردووە[1] ئیـدی بـە گـوێرەی بەنـدەکانی، (زەهـاو) دەدرێتـە ولاتـی فـارس، بنەماڵـەی باجـەڵان پێیـان باشـتربووە وەك رەعیەتی عوسمـانی بمێننـەوە، لـەو سـونگەوە کۆچیان کـردووە بـۆ ناوچـەی خانەقین[2]. موستەفا پاشا، دوایین سەرۆکی باجەڵان بوو کە نازناوی پاشای هەبووەو پێش جەنگو لە ماوەی جەنگی یەکەمی جیهانیـدا رۆڵـی بەرچاوی لە ڕووداوەکانی ناوچەکەدا هەبووە.

[1]بەشداریکردنی (عوسمان پاشای باجەڵان) وەك دوا حاکمی زەهاو بۆ ئەوەبوو نوێنەرانی نێوانکار لە کۆنگرەکەدا لێپێچینەوەی لەگەڵ بکەن، لەچوارچێوەی ئەو بەڵگانەدا عوسمانیەکان پێشکەشی کۆنگرەکەیان کردووە و مافە مێژووییەکانیان لە زەهاو دەسەلمێنێت. نوێنەرانی نێوانکار چەند پرسیارێك ئاراستەی (عوسمان پاشا) دەکەن، ئەویش لەولامدا جگە لەوەی داکۆکی لەوە دەکات، کە لە ناوەڕاستەکانی سەدەی هەژدەهەمەوە زەهاو سەر بە عوسمانیەکانە، ئاماژە بۆ ئەوەش دەکات فارسەکان لە ساڵی (١٨١١) لەو شارە دەریانکردووە و بە هۆی ئەوەی ناوی (عوسمان)ە رکیان لێهەڵگرتووە! فارسەکان ساڵی (١٨١٦) (زەهاو) دەدەنەوە دەست دەوڵەتی عوسمانی، هەمدیسان ساڵی (١٨٢٢) دەیگرنەوە، بەڵام لە پەیماننامەی یەکەمی ئەرزڕوومدا (١٨٢٣) جارێکیتر دەکەوێتەوە ژێر دەسەلاتی عوسمانی. بڕوانە: عبدالعزیز سلیمان نوار، العلاقات العراقیة الایرانیة، ص٨١.

[2] احمد عثمان ابوبکر، المصدر السابق، ص٥٤٠.

٣- هەمەوەنـد

بـــەنێوبانگترین عەشـــیرەتی جـــەنگاوەری[١]کوردســـتانن، بـــەگوێرەی خەملاندنی مارك سایکس لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا پێکهاتبوون لە (١٢٠٠) خێزان[٢]، ئیزەدی وەك یەکیەتییەکی عەشیرەتیی گەورە ئاماژەی بۆ کردوون[٣]. لە لقە بنەڕەتیـەکانی هەمەوەنـد: بـەگزادە (چـەلەبی)، ڕەشـەوەند، ڕەمەوەنـد، سـەفەروەند، سیتەبەسـار[٤]، لەگـەڵ ئـەم لقانەشـدا چـەند لقێکـی جوتیاریی هەیە، ئەوانیش لـە: (کافرۆشـی، بیریـایی، سـوفیەوەند، چـنگنی) پێکــدێنن و لــە گونــدەکانی (موزەفــەر، دۆلان، هــەنجیرە، کانیمــاران....) نیــشتەجێن[٥]. بــە بــڕوای (ئەدمونــدز) لقــی (سیتەبەســار) لــە کۆچــە بەراییەکانیدا لەگەڵ هەمەوەند هاتوون[٦].

---

[١]کوڕانی هەمەوەند کە تەمەنیان دەگەیشتە حەوت ساڵان، هەمان شێوەی سەربازێك باوکیان فێری ئامرازەکانی شەڕو ڕوبەڕوبوونەوەیان دەکردن، پاش ئەوەی بۆ تەنها جارێك لە شەڕێکدا خۆی دەسەلماند، ئیدی ڕێگەیان دەدا چەك هەڵبگرێت، (ئاغا)ش ئەسپێك و تفەنگێکی باشی لەگەڵ بڕێك ئاژەڵدا بۆ فرۆشتن پێشکەشدەکرد، هەرچی ئاغای گوندەکانە هەمیشە بە ئومێدبوون خێرا چەکدار بۆ ئاغای لقە سەرەکییەکانی هەمەوەند ئامادەبکەن. بڕوانە:

Barth.op.cit, p. 54.

[٢] القبائل الكردية في الامبراطورية العثمانية، ص٣٩.

[٣] میهرداد ئیزەدی: سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٨..

[٤] مێجەر ئی. بی. سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، ل ل٥٠-٥١.

[٥] تقرير دائرة الحاكم المدني البريطاني في العراق، ص ص٦٦-٦٧.

[٦]بڕوانە: كرد و ترك و عرب، ص٤٤.

## سنووری جوگرافی عەشیرەتی هەمەوند:

لە باکوورەوە ناوچەکانی شوانی بازیان‌و چیای تۆکمە، لای باشوورەوە رووباری تاووق(تاوغە)، بە دیوی رۆژهەڵاتیشدا زنجیرە شاخی بن زەردەو تاسڵوجە، هەرچی خۆرئاوایەتی قەرەحەسەن‌و شوانی خاسەیە[1].

وەك لە یادەوەری لۆکاڵیدا (الذاکرة المحلیة) هاتووە، هەمەوەندەکان سەرەتا لە کوردستانی ژێر دەسەڵاتی فارسدا، لە ناوچەکانی سنە، کرماشان، زەهاوو (شیراز)ی سەنتەری هەرێمی فارسدا لە باشووری ئێران نیشتەجێبوون[2]. بەپێی سەرچاوە بەراییەکانیش لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەمەوە هاتوونەتە ناوچەی بازیان‌و تیایدا جێگیربوون [3] (سۆن) پێی وایە لە بنچینەدا جافن‌و لە سەرەتاکانی سەدەی هەژدەهەمدا تێکەڵیان بوون[4]. سەرباری ئەمە، بۆچوون هەیە تێکڕای هەمەوەند دەباتەوە سەر جاف[5]. بەڵام لە هەموو بارێکدا، دواتر هەمەوەند بۆ خۆیان لە ڕووی سترەکتۆری پێکهاتەی سۆسیۆ-کۆمەڵایەتیانەوە ئیتنیەکی تایبەت‌و

---

[1] محەمەد ئەمین زەکی: تاریخی سلیمانی وەلاتی، ل١٣٨.

[2] دارا ئەحمەد کەریم بەگ: کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند، چ١، هەولێر، ٢٠٠١، ل٣٣.

[3] Mehemed Hurşid paşa: A.G.E, ss. 246 .

باڕۆن ئیدوارد نۆڵدە: سەرچاوەی پێشوو، ل٩.

[4] مێجەر ئی. بی. سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، ل ٦٠.

[5] عباس العزاوي: عشائر العراق الكردية، ص٣١.

سەربەخۆ پێکدێنن[1]. هەمەوەندە ڕەسەنەکان تێکڕا لە نەوەی چەلەبی باوکی ڕەسوولّ–ن، لقەکە ناوەکەی لە ناوی یەك لە دوای یەکی دامەزرێنەکانەوە هاتووە، بەم چەشنە ڕەشەوەند مانای تیرەی ڕەشید دەبەخشیّ، ڕەمەوەند تیرەی ڕەمەزان و سەفەروەندیش تیرەی سەفەر، هەمووشیان کوڕی چەلەبین[2].

٤- زەنگەنە

عەشیرەتێکی دێرینی ناوچەکەن، پێکهاتوون لە دوو پۆل: فارس ئاغایی و ڕۆستەم ئاغایی کە تێکڕا لە ساڵەکانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا بە (٤٥٠) ماڵ خەملێندراون و لە دەورووبەری کفری و ئیبراهیم خانچی و سوماك (سماق) نیشتەجێبوون و بە کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییەوە خەریکن[3] سنووری جوگرافی زەنگەنە: لە گوندەکانی زەرداو، دوانزە ئیمام، ڕەحیم وەرەقە، تەپەی عەلی، لەگەڵ زەوی و زارەکانی باشوورو ڕۆژهەلاّتی کفری. هەرێمی ئیبراهیم خانچی، لە ئاوایيە سەرەکیەکانی: ئیبراهیم خانچی، غەفووری ژاڵە، عەبدولرەحمان شەشە، ژاڵەو پەلك، کەوشەنی زەوی و زارەکانی بەم شێوەیە: لە باکوورەوە زەوی و زارەکانی داودە، لە باشوورەوە بەلەگە، لە ڕۆژهەلاّت زەوییەکانی سوماق، ڕۆژئاوای زەوییەکانی داودە[4]. لقێکی زەنگەنە لە

---

[1] نەجاتی عەبدوللاّ: ئیمبراتۆریا، سنوور، خێڵ: هۆزی هەمەوەند لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا، لە چوارچێوەی کتێبی: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خوارو، ل١٠٩.

[2] مێجەر ئی. بی. سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خوارو، ل ٦٠.

[3] محەمەد ئەمین زەکی: خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان، ل٢٤٠.

[4] مێجەر ئی. بی. سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خوارو، ل٩١.

دەوروبەری کرماشانو هەلیلان-ە لە ولاّتی ئێران[١] بەپێی (شەرەفنامە)ش بەشێکیشیان کەوتۆنەتە ناوچەی خۆراسان[٢]، لە باکووری رۆژهەلاّتی ئێران.

زەنگەنە لە بنچینەدا لە عەشیرەتەکانی هەرێمی (شاخەکان-الجبال)ی کوردستانی رۆژهەلاّتەو پێشتر بەم ناوەوە نەناسراوە، یەکەمین ناوهێنانی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سیازدەهەمی زایینی، کاتێك جەمالەدین بالاّنی میریان بە لەشکرێکی (٢٠٠٠) کەسییەوە، قەوارەیەکی عەشیرەتیی بونیادناوەو دەسەلاّتی خۆی بەسەر ناوچەکانی کەنگاوەرو دەوروبەریدا سەپاندووە[٣]. لە ڕاستیشدا لە سەدەی حەڤدەهەمداو لە چوارچێوەی دەولّەتی سەفەویدا زەنگەنە پلەی گرنگو بەرچاویان هەبووە، لەوانە لە نێوان سالاّنی ١٦٦٩-١٦٨٩(عەلی خانی زەنگەنە) توانی بگاتە پلەی وەزیری مەزن، هەروەها کەسانی تر لە عەشیرەتەکە چەندین پلەی ئیداریو سەربازییان بەدەستهێناوە[٤].

وەك لە بەشی یەکەمدا ئاماژەمان پێدا، (زەنگەنە) لە ناوەڕاستەکانی سەدەی شانزەهەمدا لە چوارچێوەی (ویلایەتی لوڕستاندا)دا، سنجەق/لیوا بووە. دواتریش وەك لیوایەك کە بەشێوازی (میرایەتی عەشیرەتی)

---

[١] محمد مردوخ کردستاني: سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٦.

[٢] بڕوانە: شەرەفنامە، ل٤٣٥.

[٣] زرار صديق توفيق: المصدر السابق، ص١٠٨.

(2) Rudi Matthee:” Administrative Stability and change in Late 17th century Iran: The Case of Shaykh Ali Khan Zanganah1669-89” International Journal of Middle East studies, vol. 26, No.1, feb.1994, pp81-92.

بەڕێوەبراوە لە چوارچێوەی ئەیالەتی شارەزووردا دانراوە. بەپێی دەفتەر دامەزراندنەکانی دەوڵەتی عوسمانی ژمارە (٢٦٦ و٦٠٩٥) کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە نێوان ساڵانی (١٦٣١-١٦٤٢ز)، زەنگەنە سنجەق/لیوایەك بووە سەر بە ئەیالەتی بەغداد، بەڵام جارێکی تر نێوی لە دەفتەری دامەزراندنەکانی ساڵانی دواتردا لە چوارچێوەی ویلایەتی شارەزووردا هاتووە، کە وەك عەشیرەتێك بە شێوازی میرایەتی عەشیرەتیی لە لایەن میرەکانییەوە بەڕێوەبراوە، لەو ماوەیەی سەرەوەشدا بە (ئیسماعیل بەگ) سپێردراوە[1]. شوێنی میرایەتییەکەش کەوتبووە نێوان هەردوو رووباری (ئاوەسپی)و (روخانە)، بنکەکەی هەندێ جار (خۆرنەوەزان) بووە لەو ناوچەی بە "گیل" ناسراوە، هەندێ جاریش گوندی (قەیتوول) کە سەر بە ناحیەی (سەنگاو) بووە. پاش لەنێوچوونی ئەم میرایەتییە بەشێك لە عەشیرەتەکە کۆچ دەکەن بۆ دەوروبەری خانەقین و کفری[2].

### ٥- شـوان

عەشیرەتێکی نیشتەجێ و دەوڵەمەند بوون[3]، پێکهاتوون لە دوو لق، ئەوانیش: شوانی خاسەو شوانی بازیان، تێکڕا لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا بە (١٥٠٠) کەس مەزەندەکراون[4]، لە ماوەی دوای جەنگی یەکەمدا سەرچاوەی تر بە (٢٠٠٠) کەس خەملاندوونی[5]. سەرجەمی شوان جوتیار بوون و (ئاغا)یان نەبووە، لەگەڵ هیچ عەشیرەتێکی ناوچەکەدا لەژێر

---

(١) فاضل بيات: الدولة العثمانية في المجال العربي، ص ص٣٠٨ -٣٢٠

(٢) جميل بندى الروزبياني: المصدر السابق، ص٢٦٢.

(٣) مێجەر سۆن: سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان، ل ٦٨.

(٤) Naval Staff: Intelligence Department, op, cit, p.111.

(٥) محەمەد ئەمین زەکی: خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان، ل٢٤١.

باری هیچ پەیوەندیو پاشكۆیەتییەكدا نەبوون، بەگشتی ملكەچی خاوەن زەویو زارەكانیانن كە دانیشتووی شارن[1]. بەشێوەیەكی گشتی شوان لەم كەوشەنانەدا ژیاون: لە باكوورەوە عەشیرەتی شێخ بزێنی، لە باشوورەوە رووباری خاسەو چەمچەماڵ، بە دیوی رۆژهەڵاتدا زێی بچووكو تۆخمەداغ، لای رۆژئاواوە عەشیرەتی شێخ بزێنی بیبانی، زۆریان لە گوندەكانی سەرگردی گوڕگوڕ لە نزیك كەركوك دەژێن[2].

مێژووی ئەم عەشیرەتە ڕوونو دیارنییە، لە سەردەمی عوسمانیدا لە چوارچێوەی ئەو ناحیەدا بووە كە لە رووی ئیدارییەوە بە ناحیەی شوان[3]ناسراوە، لە كۆتاییەكانی جەنگی یەكەمی جیهانیدا شوان بە دەست پەشێویو نەبوونی سەرۆكێكەوە كە بتوانێت یەكیانبخات، تووشی ناكۆكیو شپرزەیی بوون[4].

## ٦- تاڵەبانی

بنەماڵەكەو جوتیارەكانی ئەم عەشیرەتە پێكدەهێنن كە نێوی (تاڵەبان)ییە، بەگشتی شوانكارەو كشتوكاڵكارن، لەگەڵ ئەو جوتیارانەی بە بنەماڵەوە بەندن تێكڕای ماڵەكانی تاڵەبانی بەگوێرە خەملأندنێك لە ماوەی

---

[1] سي. جي. ادموندز: المصدر السابق، ص٢٥٠.

[2] مێجەر ئی. بی. سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەكانی كوردستانی خواروو، ل٨٢.

[3] ناحیەی شوان كە سەر بە سەنجەقی كەركوك بوو لە كۆتاییەكانی سەدەی نۆزدەهەمو سەرەتاكانی سەدەی بیستەمدا بریتی بوو لە (٦٦)گوند، بنكەی ناحیەكە گوندی"حاجی بیهان یا بیحان" بوو، بڕوانە:

Osmanli Vilayet Salnamelerinde Mosul: s.191.

[4]تقرير دائرة الحاكم المدني البريطاني في العراق، ص ص١٢٤-١٢٥.

سالآنی جەنگی یەکەمی جیهانیدا (١٠٥٠) ماڵ بوون[١]. بەسەر گوندەکانی: گل، قەرەبلاغ، دەشتی بنکورە، گۆڕەشەلە لەسەر ڕووباری سیروان نزیك باجەلآنەکان، گوندی سەرتاف، گوندی حاجیلەر، گوندی شێخ نوری، بادیاوەو زەوییەکانی نزیك کەرکوك دابەشبوون[٢]. باپیرە گەورەی تاڵەبانی، مەلا محموودی کوڕی ئاغا ڕۆستەمی کوڕی ئاغا یووسفە، لە نەوەی کاکە سووری ناوچەی بۆکانە لە کوردستانی ڕۆژهەلآت، لە نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەهەم دا بۆ تەواوکردنی خوێندنو فەقییەتی ڕوویکردۆتە باشووری کوردستان، تا لای مەلا ناودارەکانی ئەو ناوچەیە بخوێنێ، پاش تەواوکردنی خوێندنو بوونی بە مەلا، ماوەیەکی زۆر لە ناو عەشیرەتی زەنگەنەدا ژیاوەو میر ئیسماعیلی زەنگەنە کچی خۆی پێداوە، لەو تێکەڵییەوە لەگەڵ زەنگەنە بە مەلا مەحموودی زەنگەنە ناسراوە[٣].

بەپێی گێڕانەوەیەك لەو ماوەیەدا کە مەلا مەحموود لە گوندی (قرخ)ی نزیك چەمچەماڵ ژیاوە، شێخ ئەحمەدی هیندی لاهووری دەبێتە میوانیو دەیکاتە خەلیفەی خۆیو مافی ئیرشادی تەریقەتی قادری پێدەبەخشێت، پاش مردنیشی (شێخ ئەحمەد)ی کوڕی لە ئیرشادو ڕێگا پیشاندانی خەڵکدا درێژە بە ڕێبازەکەی باوکی دەدا، دواتریش چۆوەتە گوندی تاڵەبانو تێیدا نیشتەجێ بووەو هەر لەوێ نەوەیەکی زۆری خستۆتەوە،

---

[١] المصدر السابق، ل ل٨٤-٨٥.

[٢] مێجەر ئی. بی. سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، ل ل٨٤-٨٥.

[٣] نوری تاڵەبانی: شێخانی ئیرشادی تاڵەبانی و چەند ناودارێکی تری ئەم بنەماڵەیە، چ١، سلێمانی ٢٠٠٢، ل ل١١-١٦.

ئیدی نێوی گوندەکە بەسەر بنەماڵەکەدا دابڕاوە[١]، پاشتر نەوەکانی هەر یەك چـــوون بەلایەکـــداو لەناوچـــەکانی خۆیانـــدا کـــاری شـــێخایەتیان لـــە ئەستۆگرتووەو لە ڕێگەی کاریگەریو دەسەڵاتی ئایینییەوە بوون بەخاوەن گوندگـەلێکی زۆرو کێڵگـەی گـەورە[٢]و تەکیـە کـە هەفتانـە بـە ئامـادەبوونی خـــودی شـــێخەکان کـــۆڕی زیکریـــان تێـــدا ڕێکدەخـــست، بـــەنێوبانگترین تەکیـەکانیان تەکیـەی کـەرکوكو تەکیـەی تاڵەبانییـە لـە بەغـداد، کـە ئەمـەی دواییـان (شێخ عەبدولرەحمان)ی تاڵـەبانی دروستیکردووە، کـە یـەکێك بـوو لەو شێخانەی تاڵەبانی کـە هـەژمونی گـەورەی لـە سـەر موریـدەکانی لـە نێـو عەشـیرەتەکاندا هـەبووە، سـاڵی (١٨٨٥) دوای ئـەوەی دەبێتـە وێرانـە بـە سەرپەرشتی (مەحموود حیلمی) ژمێریاری ویلایەتی بەغداد تەکیەکە نۆژەن کرایـەوە[٣]. لـە نێـودارترین کەسـایەتی تاڵـەبانی لـە پـێش جـەنگی یەکـەمی جیهانیو پاشتردا (شێخ حەمیـد) بووە، کـە دەسـەڵاتو هـەژمونی زۆری لـە نێو عەشیرەتەکانی ناوچەکەدا هەبووە، وەکو سەرۆکێکی سـەرەکی ئـاینزایی شافیعی لە ناوچەکە تەماشاکراوە[٤].

### ٧-بنەماڵەی بەرزنجە

بەرزنجـــە گونـــدێکی بـــچووکە لەســـەر ڕووی باشـــووری شـــاخی (کروکجـاو=کـوڕە کـاژاو)، کەوتۆتـە دیـوی ڕۆژهـەڵاتی شـاری سـلێمانی،

---

[١] هەمان سەرچاوە، ل ل ١٧-٢٦.

[2] Gökhan Çetinsaya, Ottman Administration of Iraq, 1890-1908, Routledge, Newyork, 2006, p74.

عباس العزاوي: عشائر العراق الكردية، ص١٢٢.

[٣] عباس العزاوي: تاريخ العراق بين احتلالين، ج٨، الدار العربية للموسوعات، د.ت، ص٩٦.

[٤]تقرير دائرة الحاكم المدني البريطاني في العراق، ص١٣١.

**سـەنتەری ناحیـەی (سروچـك)ە سـەر بـە قـەزای شـارباژێر[١]. بـە گـوێرەی (سي.جي. ادموندز) بنەماڵەکە لە ڕووی ژمارەوە زۆرتـرینو بە دەسـەڵاتیش گـەورەترین بنەماڵـە بـوون لـە کوردسـتانی باشـووورداو نێـوی خۆیـان لـەم گونـدەوە وەرگرتـووە[٢]. بەرزنجەییـەکان ڕەچـەڵەکی خۆیـان دەبەنـەوە سـەر (بابا عەلی هەمەدان)[٣]و گوایـە دوابەدوای مردنـی هـەردوو کوڕەکـەی (سـەید موسـاو سـەید عیـسا) کۆچـیان کـردووە بـۆ پێدەشـتەکانی شـارەزوور لـە کوردسـتانی باشـوورو گونـدی (بەرزنجـە)ی نێوبراویـان ئاوەدانکردۆتـەوەو مزگەوتێکیان تێیدا بونیادناوە[٤].**

---

[١]محمد الخال، الشيخ معروف النودهي البرزنجي: مطبعة التمدن، بغداد ١٩٦١، ص٢٥ ; عماد عبدالسلام رؤوف: مراكز ثقافية مغمورة في كردستان، مؤسسة موكرياني للبحوث و النشر، اربيل، ٢٠٠٨، ص٣٩.

[٢] سي. جي. ادموندز، المصدر السابق، ص٦٨. هەڵبەتە زێدەڕۆیی لەم بۆچوونەدا هەیە، چونکە بەلایەن کەمەوە لە ڕووی ژمارەوە زۆرترین نەبوون.

[٣]بابا عەلی هەمەدانی خوشکەزای بابا تاهیری هەمەدانی و یەکێکە لە زانا دەرکەوتووەکانی سەدەی حەوتەمی کۆچی، خاوەن چەندین نوسینە بە زمانی عەرەبی و فارسی، لەوانە (ذخيرة الملوك، شرح اسماءالله، اسرار النقطة). بڕوانە: محمد الخال، المصدر السابق، ص٦٩; عبدالرحمن ادريس صالح البياتي: المصدر السابق، ص ص٣٣-٣٤.

[٤]عبدالقادر محمد البرزنجي: سادات البرزنجية: مطبعة الترقي، كركوك، ١٩٥٦، ص٣. دەگوترێ (سەید عیسا و سەید موسا)ی برای پێکەوە بۆ زیارەتی (مەککە) چوون، لە خەونێکی هاوبەشدا لە (مەدینە) پێیان گوتراوە کە لە ڕێگادا ڕێکەوتی بەردێکی ڕەشی گەورە دەکەن، پێویستە ئەو بەردە لەگەڵ خۆیان ببەن تا لە خەوێکی دیکەدا ئاگاداردەکرێنەوە لە کوێ بمێننەوە و مزگەوتێك درووستبکەن، دوای ڕۆژێك ڕێ بڕین لەژێر سێبەری کەپری شوانێك نووستن، ئینجا بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی یەزدان لەو شوێنە مانەوەو مزگەوتێکیان لە جێی کەپرەکە درووستکرد، هەمووان مێژووی ئەم ڕووداوە دەبەستنەوە بە ڕووخانی خەلافەتی عەباسی بەدەست مەغۆلەکان لە ساڵ

بــەگوێرەی تۆرەمانــە ڕابــردووی بنەماڵەکــە، ســەید موســا نــەوەی لێنەکەوتۆتەوەو گشت ئەندامانی بەرزنجە لە ڕواڵەتدا دەچنەوە سەر کەسێك بە ناوی (بابا ڕەسووڵ) کە بە بابا ڕەسووڵی گەورە دەناسرێ‌و نۆیەم نەوەی سەید عیسایە، پاش بابا ڕەسووڵ کوڕەکەی بە ناوی ئیسماعیل لە گوندی بەرزنجە کە ناوەندی بنەماڵەکە بوو لە جێی دانیشت. جێگرەکان‌و لق‌و پۆپی بنەماڵەکە بە ناوی ئەو گوندانە دەناسرێن کە پێنج کوڕو خزمە گرنگەکانی ئیسماعیل تەکیەیان تێدا دامەزراندووە، وەك: سەرگەڵوو، گڵەزەردە، قازان قایە، دۆڵ پەمۆ، نۆدێ. لە مێژووی بنەماڵەکەشدا ساڵی (١٧٩٢-١٧٩٣) تایبەتمەندییەکی گرنگی هەیە، چونکە لەو ساڵەدا بوو کە سوڵتان سەلیمی سێیەم (١٧٨٩-١٨٠٧) ژمارەیەك موڵك‌و زەوی بۆ خزمەت بە مزگەوت بە (سەید تەها)ی نەوەی شێخ ئیسماعیل بەخشی[1].

لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا شێخ مارفی نۆدێ (١٧٥٣-١٨٣٨) یەکێك لە سەرگەورەکانی شێخانی بەرزنجەی سلێمانی بووە، لە ڕۆژگارێکەوە کە مەولانا خالید[2] سلێمانی بە جێهێشت، بەرۆگرەکانی شێخ

---

(١٢٥٨). بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: سي. جي. ادموندز، المصدر السابق، ص ص ٦٨-٦٩.

[1] المصدر نفسه، ص ص٦٩-٧١.

[2] مەولانا خالید کوڕی حوسێن، هەڵگری نازناوی زیائەددینی شارەزووری، سەر بە لقی میکائیلی عەشیرەتی جاف بوو، ساڵی (١٧٧٩) لە قەرەداغ لە دایك بووە، هەر لەوێ چووەتە بەر خوێندن، بۆ پەرەپێدانی ئاستی خوێندەواری، خۆی شوێنە جیاجیاکانی کوردستان گەڕاوە، ساڵی (١٨٠٩) چووەتە هیندستان، پاش وەرگرتنی مووڵەتی ئیرشادو خیلافەتی لە ڕێبازەکانی تەسەوف گەڕاوەتەوە سلێمانی و لە ماوەیەکی زۆر کورتدا سەرنجی خەڵکێکی زۆری بۆ ڕێبازێکی نوێ (نەقشبەندی) ڕاکێشاوە و بووەتە ڕکابەرێکی بەهێزی ڕێبازی قادری، بەڵام زۆر نابات مەولانا خالید لە ژێر فشاری

مارف بوونە گرنگترین ڕێبەرانی تەریقەتو پاش داڕمانی میرایەتی بابانیش بوونە سەرکردەی سیاسی بێ ڕکابەری شارەکەو دەوروبەری[1]. هاوڕێ لەگەڵ بنەماڵەی نەهری دا لە هەکاری، شێخانی بەرزنجە سەر بە تەریقەتی قادری بوون، کە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا تاقە تەریقەتی دەستڕۆیشتوو و باڵادەستی کوردستان بوون، ئەم دوو بنەماڵەیە لە سەیدەکان بوون، هەردوو چاودێری ئەوەبوون کە لە ناو تەریقەتدا تەنیا ئەندامانی خانەدان بگەنە پلەی (شێخایەتی)، بەم چەشنە دەسەڵاتو هەژموونی خۆیان بە سەر لایەنگیرو شوێنکەوتەکانیاندا سەپاندو تۆڕێکی فراوانی موریدەکانیان بە تەواوی لە کوردستاندا بڵاوببۆوە[2].

نێوبانگی شێخانی بەرزنجە لە سەردەمی کاکە ئەحمەدی شێخ-دا (١٧٩٣-١٨٨٧) دەگاتە لوتکە، بەتایبەت کە مریدانی سنووری کوردستان تێدەپەڕێنێتو دەگاتە وڵاتانی ناوەڕاستی ئاسیا[3]و دەبێتە جێبایەخی هەر یەك لە سوڵتان عەبدولعەزیز (١٨٦١-١٨٧٦)[4] و سوڵتان عەبدولحەمیدی

---

لایەنگرانی ڕێبازی قادریدا لە ١٨٢٠/١٠/٢٥ سلێمانی جێدێڵێت و دەچێتە بەغداد و پاش دوو ساڵ مانەوە دەڕوات بۆ شام، لەوێ لە ساڵی (١٨٢٦) بە نەخۆشی تاعون دەمرێت. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مەکتووبات: وەرگێڕدراوی نامە فارسییەکانی مەولانا خالید، و. سەباح بەرزنجی، چ١، هەولێر، ٢٠٠٩، ل ل١١-١٣.

[1] مارتین فان برۆنەسن، سەرچاوەی پێشوو، ب٢، ل٢٢٩.

[2] دیڤید مەکداول، مێژووی هاوچەرخی کورد، و. ئەبوبەکر خۆشناو، چ٢، هەلیر ٢٠٠٥، ل ل ٩٣-٩٤.

[3] ڤ.ف. مینورسکي: المصدر السابق، ص٥١.

[4] Gökhan Çetinsaya: op. cit, p74. بڕوانە:

دووەم (١٨٧٦-١٩٠٩)[1]. بێگومـان جگـە لـە پێگـە ئاینییەکـەیان، ئـەو ژێرخانـە ئابوورییـەی بنەماڵەکـە هـەیبوو، یاریـدەدەرێکی گـەورەبوو لـە میانییـەوە بتـوانن ڕێبەرایـەتی سیاسـی ناوچـەکە لـە ئەسـتۆبگرن، هـەر لـە سەرەتای حوکمڕانی سوڵتان عەبدولحەمیدەوە سەرانی بنەماڵەکە بەتایبەت (شـێخ سـەعید) دەسـتیان دایـە کڕینـی زەوی‌و زارو گونـدو ئاواییـەکانی دەوروبـەری شـاری سـلێمانی، بـەوەش توانییـان هێزێکـی تایبـەت بۆخۆیـان پێکبهێنن[2]و دەسەڵاتی ئاینیی‌و سەرمایەداری خۆیان یەکبخـەن[3]، تێکڕای عەشیرەتەکانی ناوچەکەش بخەنە ژێر کارتێکردنی خۆیانەوە[4].

## ٨-کۆمەڵە عەشیرەتەکانی پشدەر

پشدەر لە بەهێزترین عەشیرەتەکانی باشووری کوردستانن، لـە بنەوانـەدا نێوی (نورەدینی)یە، نازناوی بنەماڵەی حوکمڕان تیایدا (میراودەلی)یـە، کـە دەسـەڵاتێکی ڕەهـای بێڕکابـەری بەسـەر تێکـڕای عەشـیرەتەکەدا هەیـە[5] و بەنێوی (میرعەودال ئاغا)ی باپیریانەوە نێونراون، کە لـە دەوروبـەری سـاڵانی (١٨٤٠) لە تروپکی میرخاسی‌و گەنجیدا بووە[6]. پـشدەر بـە خۆڕێکخستن‌و دەسەڵاتی توند نـاودارن[7]، ناولێنانیـشیان بـە (پـشدەر) ناولێنـانێکی هەڵەو

---

[1]محمد امين زكي: مشاهير الكرد و كردستان، اعداد رفيق صالح، ط١، سليَماني ٢٠٠٥، ص٣٤٦. ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ بۆ ساڵی ١٣٣٠ك وەك عەشیرەتی نورەدینی ئاماژەی بۆ کردوون. بڕوانە: سالنامت ولايت موصل، ١٣٣٠ه، ص٣٣١.

[2]تقرير دائرة الحاكم المدني البريطاني في العراق، ص١٠١.

[3] ڕەمزی قەزاز: بزوتنەوەی سیاسی و رۆشنبیری کورد، چ١، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل٨٢.

[4] المس بيل: المصدر السابق، ص١٣٦.

[5] سي.جي. ادموندز: المصدر السابق، ص١٩٨.

[6] مارتین فان برونەسن: سەرچاوەی پێشوو، ب١، ل١٢٢.

[7] مێجەر سۆن: سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان، ل٨٥.

باوه، چونکه خەڵکی ناوچەکە هەموویان سەر بەم عەشیرەتە نین، لە پشدەردا چەندین عەشیرەتی دیکە ئەوانەش کە سەر بە عەشیرەتێکی دیاریکراو نەبوون، بوونیان هەبووە.

عەشیرەتی پشدەرو گوندەکانی لە بناغەدا دوو بەشبوونو پێکهاتبوون لە:(ئاغاوات)و (مسکێنەکان). ئاغاواتی میراودەڵی بریتیبوون لە(٢٥٠) ماڵ، هۆمەر ئاغای (٢٠) ماڵ، وەسۆ ئاغایی (١٠)ماڵ، تێکرا (٢٨٠) ماڵ بوون، هەموو پشدەرو پاشکۆکانی سەربەخۆ بەڕێوەدەبرد، هەرچی مسکێنەکانی عەشیرەتەکەیە لە ناوچەی قەڵادزێ، ژمارەیان زیاد لە (١٦٠٠) ماڵ دەبوو[١]. لەوانە عەشیرەتی شیلانی (شیلانە)یە، کە کەوتۆتە دەوروبەری مەرگە، ئەمانە ناچنەوە سەر نورەدینی، واتە لەوان جودان[٢]، (١٠ تا ١٢) گوندنو ژمارەیان نزیکەی (٣٠٠) ماڵ دەبوو[٣]،و عەشیرەتی جافەتی (جافە ڕەشکە)، کەوتونەتە نێوان پشدەرو سلێمانی، لە بنەڕەتدا جافن، بەڵام سەر بە پشدەرن[٤] و ژمارەیان (١٠٠٠) ماڵ دەبوو[٥]. هەروەها (عەشیرەتی شینکی) لە ماوەت، هەشت گوندیان هەیەو نزیکەی (٤٥٠) ماڵن، بەری ئالان (١٥) گوندنو نزیکەی (٥٠٠) ماڵ دەبوون، دۆڵی ماوەتو سەراو میراوا، شارباژێڕ، ئالان، دۆڵیو بەشێکی ناحیەی چوارتا (٦٥) گوندی تیایەو

---

[١]محەمەد ئەمین زەکی: تاریخی سلێمانی وڵاتی، ل١٣٦.

[٢]عباس العزاوي: عشائر العراق الكردية، ص٥٧.

[٣]محەمەد ئەمین زەکی: تاریخی سلێمانی وڵاتی، ل١٣٦.

[٤]عباس العزاوي: عشائر العراق الكردية، ص٥٧.

[٥] محەمەد ئەمین زەکی: تاریخی سلێمانی وڵاتی، ل١٣٦.

نزیکـەی (٢٠٠٠) ماڵێـك بـوون، سـەرباری ئەمانـە زیـاد لـە (١٠٠٠) مـاڵ عەشیرەتی هەمەڕەنگ لە ناوچەکەدا هەیە[١].

## ٩–یەکێتی عەشیرەتەکانی بڵباس

بڵبـاس لـە بنەوانـەدا کۆنفیدراسـیۆنێکی عەشـیرەتییە، وەك لـەوەی عەشیرەتێکی دیاریکراو بێت، لە کاتی شەڕو تەنگانەدا پشتی یەك دەگرن[٢]، بە گوێرەی (ریچ) لقەکانی ئەم کۆنفیدراسیۆنە بریتین لە: (١)کابیز-Kabiz، کـە بنەماڵـەی حـوکمڕانن و لـە (٢٠٠)کـەس پێکهـاتوون، (٢) مـەنزور (لـە ڕاستیدا مەنگوڕە)، (٣) مامش، (٤) پیران، (٥) ڕەمك، (٦) سن –Sinn و تافە Taafah– کـە پێکـەوە عەشـیرەتێك پێکـدێنن، و سـەرۆکی عەشـیرەتەکان بـە موزنMuzzin-(مەبەستی مەزن)ە ناسراون[٣]، سنووری جوگرافی لقەکانی بڵباس بەم شێوەبوو:

**مەنگوڕ:**

عەشـیرەتێکی کۆچـەریبوون، لـە ناوەراسـتەکانی سـەدەی نۆزدەهـەم دوو بەشـبوون: کادەرویـشی و زودی، تێکـڕا ژمارەیـان (١٢٠٠) مـاڵ بـووە[٤]، بەگوێرەی (کرزون) لە هەشتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا مـەنگور پێکهـاتبوون لـە (٥٠٠٠) مـاڵ[٥]، هەرچـی (مـارك سـایکس)ە لـە سـەرەتاکانی سـەدەی بیـستەمدا بـە (٢٠٠٠)مـاڵ داینـاون[٦]. ئـەم عەشـیرەتە زیـرەکترین و جـێ

---

[١] هەمان سەرچاوە، ل١٣٦.

[٢] تقرير دائرة الحاكم المدني البريطاني في العراق، ص ٢٩.

[٣] Claudius James Rich: op. cit, p.152.

[٤] درويش باشا: المصدر السابق، ص٣٦.

(9) George N.Curzon: Persia and The Persian Question, second impression-London-Frank Cass co.Ltd-1966, vol.I, P.555.

[٦] بڕوانە: القبائل الكردية فى الامبراطورية العثمانية، ص٤٢.

بایـەخترین عەشـیرەتەکانی ئێـرانو دەوڵـەتی عوسمـانی بـوون، سـنووری جوگرافییـان، لـە باشـووری سـابلاخەوە (مـەهاباد) شـۆڕدەبێتەوە تـا زنجـیرە شـاخی وەزنـێ، لـە رۆژئاواشـەوە لەگـەڵ (مامـەش) هاوسـنوورن، کـە ئـەو ناوچـەیە شـانۆی شـەڕە سـنووری نێـوان ئێـران – عوسمانییـە[1]. بارەگـای حـوکمڕانی مـەنگوڕەکان کـە ئاغاوەتـەکانیانی تێدایـە لـە بـەرەی مێرگـان (ترکـەش)ە لـە سـەر کـەناری ڕاسـتی کـەڵوێ، کەوتۆتـە نێـوان لاجـانو سەردەشـت[2]. نـاودارترین سـەرۆکیان (هـەمزە ئاغـا)یـە، کـە یـەکێك بـوو لـە سـەرکردەکانی شۆرشـی سـاڵی (١٨٨٠) بـە ڕێبەرایـەتی شـێخ عوبێـدوللای نــەهری‌و لەگـــەڵ عەبـــدولقادری کـــوڕی شـــێخدا، چـــەند شـــوێنێکی ئازەربایجانیـشیان گـرت لەوانـە (میانـداو و بنـاو)[3]. لـە ناوەڕاسـتەکانی سـەدەی نۆزدەهەمـدا مـەنگوڕ لـە هاوینـان لـەو ناوچـانەی سـەرەوە ژیـاون، زستانانیش ڕوویان کردۆتە پشدەرو کۆیسنجەق کە سەر بە سلێمانییە[4]. بەڵام دواتر دوای ئاڵۆزبوونی کێشەکانی سنوورو ناچاربوونی عەشیرەتەکان بە نیشتەجێبوون، بەشی هەرەزۆری مەنگوڕ کەوتوونەتە سنووری ئێران، تەنها دوو لە لقەکانی کەوتوونەتە سنووری عیراق، یەکەمیان: (زوودی)یە

[1] میرزا محەمەد جەوادی قازی: "هۆزی کوردی مەنگوڕ"، و. ا.پەروێزی، گۆڤاری کاروان، ژمارە، ١٥، ساڵی پێنجەم، ل٥. (ئەم نوسینە لە بنەڕەتدا بەئەڵمانی نوسراوە و ساڵی (١٩١٠ز) لە گۆڤارێکی ئەڵمانیدا بلاوکراوەتەوە).

[2] ڤلادیمێر مینۆرسکی، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٤.

[3] بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی مەنگوڕ بڕوانە: میرزا محەمەد جەوادی قازی"نامیلکەی دەستنیشانکردنی خێلاتی دانیشتووی دەوروبەری سابلاغی موکری" گۆڤاری ژین، بنکەی ژین، ژ١، ساڵی یەکەم ٢٠٠٩، ل٦١-٦٣. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی مێژووی پڕ ڕووبەڕووبوونەوە و ژیانی پڕ ستەمی هەمزە ئاغا لەگەڵ دەوڵەتی قاجاری ئێرانیدا بڕوانە: محەمەد حەمە باقی: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٦ و دواتر.

[4] بڕوانە: دەرویش باشا: المصدر السابق، ص٣٦

لــه (٢٦) گونــددا لــه رۆژئــاوای رووبــاری ژاراوه، دووەمیــشیان (مــەنگوڕه رووتــه)یــه، کــه لــه کــەناری رۆژهــەلاّتی سەرچـاوەکانی رووبـاری ژاراوه (٤) گوندیان هەیه[١].

**مامەش:**

عەشیرەتێکی کۆچەریبوون، له ناوەڕاستی سـەدەی نۆزدەهەمـدا ژمارەیـان بــه (٤٠٠) مــاڵ هەڵــسەنگێندراوه[٢]، لــه کاتێکـدا لــه هەشـتاکانی ســەدەی نۆزدەهەم به (٣٠٠٠) ماڵ خەملێندراوون[٣]، به گوێرەی (مارك سایکس)یش لـه سـەرەتاکانی سـەدەی بیـستەمدا (٢٠٠٠) مـاڵ بـوون[٤]. لـه زسـتانان لـه ناوچەی پێنجوێن‌و کۆیسنجەق‌و پشدەر ژیاون، وەرزەکانی تـری ساڵەکه لـه دیوی رۆژهەلاّتی لاهیجانی سەر به سابلاّخ . له گرنگترین دێهاتـەکانیان لـەو ناوچــەیه: (پەســۆی، ئــەلۆس، جەلــدیان، دێ شــەمس، کێلەشــین)ه، ئــەم عەشیرەته له باری زۆریی ئەندامان‌و سامان‌و تواناییـەوه لـه عەشیرەتەکانی دەوروبەری خۆیان زیاترن[٥].

---

[١] سي. جي. ادموندز: المصدر السابق، ص٢٠١.

[٢] درويش باشا: المصدر السابق، ص٣٧.

[٣] Curzon, op. cit, P.555

[٤] القبائل الكردية....، ص٤٢.

[٥] بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی (مامەش) بڕوانه: میرزا محەمەد جەوادی قازی"نامیلکەی دەستنیشانکردنی خێلاّتی دانیشتووی دەوروبەری سابلاّغی موکری"، ل٦٤.

**پیران:**

ژمارەیان تا ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەم (١٠٠٠)ماڵێك بوون[١]، لای سایکس بوون بە (٩٠٠) ماڵ[٢]. لە وەرزی هاویندا لە چەند پارچە گوندێکی لای رۆژئاوای لاهیجان، کە بە کۆنە لاهیجان ناو دەبرێ، دادەنیشن[٣]. لە وەرزی زستانیشدا لە ناوچەی بیتوێن و کۆیسنجەق و قەرەچۆغ و هەولێر دەژێن[٤]. لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا بەهۆی ناکۆکییەك لەگەڵ (مامەش)ی دراوسێیدا لە بەردەم بەرپرسانی ئێراندا بە سەرپێچیکەر دانران، بەو بۆنەوە ئاوارەی ناوچەی خۆشناوەتی بوون، بەڵام دوای چەند ساڵێك سەرلەنوێ گەڕانەوە هەرێمی لاهیجان[٥].

**سن:**

پێکهاتوون لە دوو لق، یەکەمیان (سن)، دووەمیان (تافا)یە، بەڵام هەردووکیان بە (سن) ناودەبرێن و زۆر بە کەمی ناوی تافا دەبرێت[٦]. ژمارەیان لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا بە (٤٠٠) ماڵ خەمڵێندراون، ئەم عەشیرەتە سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بوون، لە زستاندا

---

[١] درویش باشا: المصدر السابق، ص٣٧.

[٢] القبائل الكردية....، ص٤٠.

[٣] میرزا محەمەد جەوادی قازی: "نامیلکەی دەستنیشانکردنی خێڵاتی دانیشتووی دەوروبەری ساباڵغی موکری"، ل٦٤.

[٤] درویش باشا: المصدر السابق، ص٣٧.

[٥] میرزا محەمەد جەوادی قازی: "نامیلکەی دەستنیشانکردنی خێڵاتی دانیشتووی دەوروبەری ساباڵغی موکری"، ل ل٦٤_٦٥.

[٦] محمود احمد محمد: مێژووی هۆزی بڵباس لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ، ب١، چاپخانەی تاڤگە، سلێمانی ١٩٨٩، ل٢٠٩.

لـه قـەزای بتـوێن، لـە وەرزی هاوینـدا لـە ناوچـەی سـەردەشـت و نلـین فـەقێ عیسا و دەشتی وەزنە (وەزنێ)دا ژیاون[1].

رەمك:

لـە دوو بـەش پێكدێن: ڕەمـەكی فـەقێ وەیـسی و ڕەمـەكی فـەقێ عەبـدوللاَ ئاغا، ژمارەیـان تێكـڕا لـە ناوەراسـتەكانی سـەدەی نۆزدەهـەم بـە (١٢٠) مـاڵ هەڵسەنگێندراوە، لە وەرزی هاوین و زستاندا لە قەزای بیتوێن دەژیان، بەلاَم لـــە هاوینـــدا ڕان و مێگەلـــەكانیان بـــە شـــوانەكاندا ڕەوانـــەی لاهیجـــان[2] و كوێستانەكانی قەندیل دەكرد[3]

عەشیرەتەكانی بڵباس مێژوویـەكی دێرینیـان لـە ناوچـەكەدا هەیـە، بـەپێی بەڵگەنامەیەك كـە مێژووەكـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ سـاڵی (٩٨٢ك/١٥٧٤) بڵبـاس هاوڕێ لەگەڵ عەشیرەتی (ئاكۆ)دا سەر بە ویلایـەتی (شـارەزوور) بـوون، وەك لـە بەڵگەنامەكـەدا هـاتووە هـەردوو عەشـیرەتی نێـوبراو باجیـان بـە دەوڵـەت نـەداوە، والی شـارەزووریش بـۆ وەرگرتنـی باجەكـە، دەسـتەیەك سـەربازی ئینكیـشاری ناردۆتـە سـەریان، ئـەوانیش كـە ژمارەیـان(٨٠٠) سـوارە بـووە، بەشێوەك هاتوونەدەست لێیـان سـەربازەكانیان تووشـی شـۆك كـردووە و لـە ئاكامـدا نائومێدانـە بـێ وەرگرتنـی باجەكـە گەڕاونەتـەوە[4]. میر شـەرەفخانی بەدلیسی لەبارەیانەوە دەڵێ: (...گوایە رۆژێك لە رۆژان (٢٤) تیرەی سەرەكی لە بەرەبابی رۆژەكی لە نزیك تاب–كە سەر بە ناوچەی خۆیتـە– كۆبوونـەوە و

---

[1] درویش باشا: المصدر السابق، ص٣٧.

[3] محمود احمد محمد: سەرچاوەی پێشوو، ل٢١٠.

[4] عماد عبدالسلام رؤوف: دراسات وثائقية في تاريخ الكرد الحديث وحضارتهم، ص٢٤٠.

بوونە دوو بەش. دوازدەیان یەکتریان گرت‌و ناویان لە خۆ نا بڵباسی دوازدە تیرەکەی دیکە بە قەوالیسی ناسراون، دەڵێن قەوالیس‌و بڵباس سەر بە بابانەکانن، دوو گوندیش بەو ناوە لە هەکاری هەیە.) [1].

پێدەچێ بڵباس لە رۆژگاری سوڵتان سولەیمان قانوونیدا نائارامی لە ناوچەکانیاندا روویدابێت‌و بەناچاری دابێتیانە پاڵ وڵاتی ئێران[2]، دواتریش لە ئاکامی شەڕو هێرشە نابەرامبەرو بەردەوامەکانی بنەماڵە فەرمانڕەوا یەك لەدوای یەکەکانی ئێران سەفەوی، ئەفشاری‌و قاجاری ( کە هەندێ جار بۆ پەلاماردانیان لەگەڵ عوسمانییەکان رێکەوتوون)، کە بۆ سەرکوتکردن‌و لەنێوبردنی بڵباس دەیانکرد، دەرەئەجام زۆرێك لە لقەکانی ناچارکراون کۆچ‌و رەو بکەن بۆ ناوچەکانی: هەولێر، شارەزوور، پشدەر، بیتوێن...هتد[3]. لەگەڵ ئەو ستەم‌و زوڵمە زۆرەی مێژووی نوێی بڵباس بەخۆوەی بینیوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم عەشیرەتە لە جێی خۆیاندا ملیان بۆ کەس نەداوە، ئیدی دەسەڵاتی تورك بێت یا ئێران[4].

بەگوێرەی (راپۆرتی سنوور) لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا هەرێمی (لاهیجان) کە شوێنی (بڵباس)ە، جێناکۆکی گەرمی نێوان

---

[1] بڕوانە: شەرەفنامە، ل٤٧٠.

[2] عباس العزاوي: عشائر العراق الكردية، ص٦١.

[3] بۆ زانیاری لەسەر ئەو هێرش و پەلامارانە، بڕوانە: میرزا رەشید ئەدیبولششوعەرا: مێژووی ئەفشار، و.سەلاحەددین ئاشتی، بنکەی ژین، سلیمانی ٢٠٠٨، ل٨٨ ولاپەڕەکانی دواتر; محەمەد حەمە باقی، ڕاپەرینی هەمزاغای مەنگوڕ لەبەڵگەنامەکانی قاجاریدا ١٨٥٤-١٨٨١، چ١، هەولیر، ٢٠٠٢، ل ل٢٨-٣٥.

[4] محەمەد حەمە باقی: ڕاپەڕینی هەمزە ئاغای مەنگوڕ لە بەڵگەنامەکانی قاجاریدا، ل٢٧.

عوسمانییەکانو ئێران بووەو بۆ سوودوەرگرتن لە پێگەیانو مسۆگەرکردنی دەسەلاّتو هەژموونی عوسمانی لە ناوچە جێناکۆکەکانی سنوور لەگەلّ ئێراندا، دەرویش پاشای عوسمانی، پێشنیاری راکێشانی بلّباس دەکات بەلای دەولّەتەکەیدا، لیژنەی دیاریکردنی سنووریش ناوچەکانی بلّباسی کردۆتە دوو کەرتەوە، بەشی رۆژهەلاّتی، کە لقەکانی (مامەشو مەنگوڕ)ی تیادەژێت بەر ولاّتی ئێران کەوتووە، هەرچی رۆژئاوای هەرێمەکەیە کە لقەکانی (پیرانو ڕەمك)ی تێدا دەژیو سەر بە کۆیسنجەقە دراوەتە دەولّەتی عوسمانی[1].

## ١٠-بارزان

لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا کۆمەلّە عەشیرەتەکانی بارزان بریتی بوو لە (٧٥٠) خێزان، وەك خەلّکانێکی جەنگاوەرو بەو خێزانە ئایینیەی کە پێیان دەلّێن (شێخانی بارزان) ناسرابوون[2] و نێوی خۆیان لە ناوچەکەوە، کە گوندێکی بچووکی بە هەمان ناو تێدایە وەرگرتووە[3]، دەلّێن شێخانی بارزان سەر بە بنەمالّەی میرانی ئامێدی، (مەسعوود)ی باپیرەیان هاتۆتە گوندی (هەڤنکا)ی نزیك بارزانو تێیدا نیشتەجێبووە، یەکێك لە نەوەکانی بەناوی (شێخ تاجەددین) کە زانایەکی گەورەو پیاوێکی کارامە بووە خەلّکێکی زۆری لێ کۆبۆتەوەو بە موریدەکانییەوە هاتوونەتە بارزانو لەوێ

---

[1] بڕوانە: دەرویش باشا: المصدر السابق، ص٣٦.

[2] مارك سایکس: المصدر السابق، ص٤٥.

[3]بازیل نیکیتین: بازیل نیکیتین و کوردناسی،ب١، و. نەجاتی عەبدوللاّ، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٤. ل٤٠ ; فەیسەلّ دەباغ: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠.

تەکیـەی تێیـدا دادەمەزرانـدووە[1] ئیـدی لـە سـەردەمی نەوەکانیـدا ڕێبـازە سۆفیگەرییەکەیان بە ناوچەکانی دەوروبەردا بڵاوبووەوەو هەژموونی ڕۆحـی بەسـەر چـەندین عەشـیرەتی بـچووك و گـەورەدا سـەپاند لەوانـە: عەشـیرەتی بـەڕۆژێ لـە باشـووری شـاخی شـیرین، لـە گونـدەکانی (بـارزان، بلـە، بـازیو هوسـتان). عەشـیرەتی شـیروان لـە گونـدەکانی (ریـزان، شـەروانو مـەزن). مـزوری بـالا لـە گونـدەکانی (سـیلکی، کۆزیو شـنکیل). عەشیرەتی هـەرکی بناچـی لــە گونــدەکانی (دیــری، ســتوبیو کــی)[2]، هــەروەها لــە نێــو عەشیرەتەکانی گەردی، دۆڵەمەری، نزاری[3].

لە بنچینەدا بارزانییەکان یەکێتییـەکی عەشـیرەتینو دوای جیابوونـەوەیان لـە زێبارییـەکان دەرکـەوتن، بەهانـەی جیابوونەوەکەشـیان جیـاوازی بـڕوا – عقیدە بوو، بەم واتایە بارزان لە دوو ئاستدا عەشیرەتیو ئایینی نێوی خۆی دەبەخشێتە گروپێکی جیابووەوە لە عەشیرەتی زێبار، لەم سۆنگەوە لەڕووی عەشــیرەتییەوە تێکــڕای ئــەو زێبارییانــەی لــە دەســەڵاتی ئۆرســتوکراتی کشتوکاڵی هەڵگەڕانەوەو لە ڕووی ئایینییـەوە دوای شـێخانی بـارزان کـەوتن بە بارزانییەکان دەناسرێن[4].

---

[1] مسعود البرزاني: البرزاني و الحركة التحررية الكردية، انتفاضة بارزان الاولى ١٩٣١-١٩٣٢، كردستان، ١٩٨٦، ص١٦.

[2] حسن مصطفى: البرزانيون، ط١، بغداد، ١٩٦٤، ص ص١٣-١٤.

[3] بشير سعيد عبدالرحمن: بهدينان و عشائرها، دراسة تاريخية، ط١، دهوك، ٢٠٠٧، ص٢٣٤-٢٣٧ .

[4] فريد اسسرد: اصول العقائد البرزانية، مركز كردستان للدراسات الاستراتيجية، السليمانية، ٢٠٠٨، ص٢٥٥.

بەم چەشنە بارزانییەکان عەشیرەتێك نەبوون کە پەیوەستەگی خوێن و خزمایەتی تاکەکەکانی پێکەوە گرێبدات و بیانباتەوە سەر بەرەباوانێك، بەڵکو جۆرێکە لە کۆنفیدراسیۆنی ئارەزوومەندانە لە نێوان چەند عەشیرەتێکی جیاوازدا، کە لایەندۆستی و ئینتیمای ڕۆحی بۆ شێخی تەکیەی بارزانی نەقشبەندی بەیەکەوەیان دەبەستێتەوە[1] لە ڕاستیشدا شێخانی بارزان لە دیدگای موریدو شوێنکەوتەکانیدا ئەوەیان تێپەڕاندبوو بە تەنها سەرۆکێکی عەشیرەتیی بن، بەڵکوو وەك کەسانێکی بەڕەچەڵەك پیرۆز تەماشادەکران[2].

لە قۆناغە بەراییەکاندا بنەماڵەی ئایینی بارزان لەژێر هەژموونی شێخانی نەهریدا بوون لە هەکاری، کاتێکیش شێخ عەبدولسەلامی یەکەم دەگاتە پلەی شێخایەتی و لە لایەن خەلیفەکانییەوە بە (غەوس) ناو دەبرێت و زۆرێك لە عەشیرەتەکانی ناوچەکە دەسەڵاتی ئایینی ئەویان ناساند، شێخانی نەهری کەوتنە خۆو لەشکرێکی گەورەیان لە هەموو عەشیرەتەکانی ناوچەکە کۆکردەوەو چوونە سەر موریدو لایەنگرەکانی لەنێو عەشیرەتەکانی گەردی و شێروان و مزورییەکاندا، وێڕای تاڵانکردنی زۆرێك لە ماڵەکانیان، هەندێکیشیان لێکوشتن، شێخ عەبدولسەلام بە ناچاری چووە ئاکرێ. بەهەرحاڵ ناکۆکی شێخانی نەهری و شێخانی بارزان لە سەردەمی شێخ موحەمەدی (١٨٣٨-١٩٠٢) کوڕی شێخ عەبدولسەلامدا سەریهەڵدایەوە، بەڵام لە کۆتایدا شێخ موحەمەد دانی بەدەسەڵاتی شێخانی نەهری‌دا ناو لاپەڕەیەکی نوێی پەیوەندی دۆستانەی لە نێوان هەردوو بنەماڵەدا

[1] كاوس قفتان: الانتفاضات البرزانية: صفحات من الحركة القومية التحررية الكردية فى النصف الاول من القرن العشرين، مطبعة سركوتن، ٢٠٠٢، ص ص١٣-١٤.

[2] دبليو.أى. ويكرام و ادكار. تي. أي. ويكرام: المصدر السابق، ص١٣٣.

هێنایەکایەوە[1]، وێڕای ئەم دانپیانانە بەڵام هەوڵ‌و کۆششەکانی شێخانی بارزان بۆ ڕزگاربوون لە هەژموونی شێخانی نەهری‌و بەهێزکردنی نفووزی خۆیان بەردەوام بوو، شکستی شێخ عوبێدوڵلا لە هێرشەکانی بۆ سەر ئێران ساڵی ١٨٨٠، کە بەرزانییەکان بەشداریان تێدا نەکردبوو ئەو هەلەی هێنایەپێش، دوابەدوای ئەم شکستە باڵادەستی شێخانی نەهری‌و دەسەڵاتی سەرۆکە ئاینییەکانیان لە ناوچەکەدا کزولاواز بوو، بەتایبەت دوای دوورخستنەوەی شێخ عوبێدوڵلاو خێزانەکەی بۆ حیجاز، ئیدی شێخ موحەمەد وێڕای فشارو دژایەتییەکانی بەرەی ئۆرۆستوکراتی زێبارییەکان‌و شێخە سورچییەکانی بجێل شێخانی‌و نەهری بە ڕێبەرایەتی موحەمەد سدیقی کوڕی شێخ عوبێدوڵڵاو برادۆستیەکان توانی سەرکەوتووانە پرەنسیپ‌و بڕواکانی بڵاوبکاتەوە‌و ڕووبەری دەسەڵاتی خۆی فراوانبکات‌و تەکیەی بارزانیش بکاتە تەنها سەنتەرو سەرچاوەی بەها ڕۆحییەکانی موریدو لایەنگرانی[2]

دوای شێخ موحەمەد، شێخ عەبدولسەلامی دووەم (١٩٠٢-١٩١٤) توانی کۆنفیدراسیۆنێکی عەشیرەتی لە لقەکانی بەروژ، مزووری، شێروان دوڵەمەڕی پێکبهێنێت[3] و لە کۆتایشدا نزیکەی تێکڕای بەگزادەی عەشیرەتەکان قەڵەمڕەوی ئەویان هەموارکردوو خەڵکێکی زۆر لە عەشیرەتەکانی زێباری، شێروانی، برادۆستی، ڕێکانی، گەردی بوون بە

---

[1] بازیل نیکیتین: سەرچاوەی پێشوو، ل٤٢-٤٥.

[2] بڕوانە: فرید اسسرد، المصدر السابق، ص٦٤ و ١٥٤.

[3] مامخان شێروانی، بارزان و ڕەچەڵەکی بارزانییان: لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی و مێژوویی لەسەر بارزان تا بەهاری ١٩٧٤، لەندەن، ١٩٧٤، ل٥١.

دڵسۆزو موریدی[1]، ماوەی نێوانساڵی ١٩٠٢-١٩٠٧ بۆ شێخ عەبدولسەلام، وەك چۆن قۆناغی خۆ پەروەردكرنو حەسانەوەو سوود وەرگرتن بوو لەو خۆشەویستیو ڕێزەی شێخی باوكی لە دڵی موریدو لایەنگرانیدا چاندبووی، لە هەمانكاتدا قۆناغی پێگەیشتنی كەسایەتی ئەو بوو لە گۆڕەپانی مامەڵەی عەشایەریو سیاسەتدا[2]. دوابەدوای ئەوە قۆناغێكی نویٚ لە ژیانی شێخدا دەستپێدەكات، كاتێك وەك كەسایەتییەكی داكۆكیكەر لە مافە كولتووریو سیاسییەكانی كورد، لەگەڵ ئیتحادییەكاندا دەكەوێتە ناكۆكیو جەنگەوە[3].

### ١١- زێبار

پ.لێرخ لە ناوەڕاستەكانی سەدەی نۆزدەهەمدا وەك گەورەترین عەشیرەتەكانی ناوچەكە لە ڕووی ژمارەوە ئاماژەی بۆ كردوون[4]. (مارك سایكس)یش لە سەرەتاكانی سەدەی بیستەمدا بە (١٠٠٠) ماڵ خەملاندوونیو تێكڕای عەشیرەتەكە نیشتەجێبوونو (٣٠) گوندیان

---

[1] بازیل نیكیتین: سەرچاوەی پێشوو، ل ل٥٠.

[2] پی ڕەش: المصدر السابق، ص٨٨.

[3] لە بڕگەكانی دادێت بە درێژی باس لەم مەسەلەیە دەكەین.

[4] بڕوانە: دراسات حول الكرد الایرانیین و اسلافهم الكلدانیین الشمالیین،ت.عبدي حاجي، بنكەی ژین، ط٣، السلیمانیة، ٢٠٠٨، ص٧٥.

ئاوەدانکردۆتـەوە[1] و کەوتوونەتـە نێـوان ئـاکرێ‌و زێـی گـەورە، (بـاریزان، قەلادە، شووش، عەمرانی) گرنگترین قەڵاکانیانە[2].

لــە دێــرینترین عەشــیرەتەکانی بادینانــە، لــە سەرچــاوە ســۆمەری‌و ئەکەدییەکانـدا بـە (سـاوبار یـا سـیبارو) نـاوی هـاتووە[3]. شـەرەفخانی بەدلیسی لە کۆتاییەکانی سەدەی شانزەهەمدا وەك دووەم گەورە عەشیرەتی بادینان ئاماژەی بۆ کردووە، ناویشیانی بردۆتـەوە سەر ڕووباری (زێ) کە خەڵکەکە لە کەنارەکانیدا نیشتەجێیە[4].

زێبارییەکان لە یەکەمین عەشیرەتەکانن کە هاوکاری میرەکانی بادینانیان کردووە، بۆ گەیشتن بە حوکمڕانی لە ئامێدی‌و دەوروبەری، تا ئەو ڕادەی لە بەڵگەنامــەکانی ئــەم بنەماڵەیــەدا بــە (وەزیرەکــانی زێبــار) نێــوبراون، لــە بەڵگەنامەیـەکی عوسمانیـدا کـە مێژووەکـەی دەگەڕێتـەوە ساڵی (١٥٧٦) لـە چوارچێوەی کێشە نێوخۆییەکانی میرایەتی بادیناندا، ئاماژە کراوە بۆ ئەم عەشـیرەتە. پـاش کۆچـی‌دوایی سـوڵتان حوسـێن بـەگی مـیری بادینـان‌و دروسـتبوونی نـاکۆکی لـە نێـوان بـەهرام بـەگ‌و قوبـادی برایـدا (١٥٧٣-١٥٨٣)، ئەو کاتەی ئەمەی دواییان وەك میرێك لەسەر ئامێدی دادەنرێت، بە

---

[1] بڕوانە: القبائل الكردية...، ص٤٥. سەرچاوەیەکی عوسمانی هەمان ژمارەی بۆ خێزانەکانی داناوە، بەڵام ژمارەی گوندەکانی بە (٢٨) داناوە. بڕوانە: فەیسەڵ دەباغ: سەرچاوەی پێشوو، ل٨٦.

[2] عباس العزاوي: عشائر العراق الكرديه، ص١٠٥.

[3] میهرداد ئێزەدی: سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٠.

[4] بڕوانە: شەرەفنامە، ل١٦٢.

مەبەستی هاریکاریکردنی (بەهرام بەگ) پەنا بۆ عەشیرەتی زێباری دەبات[1].

بە گوێرەی (ئۆستن هینری لایارد) لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، ناوچەکانی نێوان ئاکرێ و سنووری ولأتی فارس چەندین عەشیرەتی کوردی تێدا ژیاوەو هەر عەشیرەتەو سەرۆکی خۆی هەبووە، بەلأم تێکڕایان ملکەچی ئاغاکانی زێباری بوون و لە میانی ئەوانەوە باجیان داوەتە عوسمانییەکان لە موسڵ[2].

لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا، لە نێو زێبارییەکاندا سێ بنەماڵەی دەستڕۆیشتوو هەبوون، ئەوانیش بنەماڵەکانی (موستەفا ئاغا، نیعمەت ئاغا، مەسیح ئاغا) بوون، بەلأم دوای ناکۆکییەکی درێژو بەرچاو لەگەڵ بەرزانییەکاندا، ساڵی (١٩٠٦) بەرەو (نەهلە)ی نزیک ئاکرێ پاشەکشێ دەکەن. لە گرنگترین ئەو عەشیرەتانەی پاشکۆی زێبارن (شێروان و مزووری)یە[3].

## ١٢- سلیڤانی

سلیڤانی لە دوو لق پێکهاتووە، یەکەمیان (سینا)، دووەمیش (دووبادا)یە، لقی یەکەم نزیکەی (١٣) گروپە، لە گرنگترین گوندەکانیان: ماڵ هەسەن، ئەرمشت، بافیان، بالقوس، سەرەکانی، مەقبەلی، باتیل، قەسر مەلا...، هەرچی لقی دووەمیانە لە (٤) گروپ پێکدێت، لە گرنگترین گوندەکانیان: کریشن، هاجیا، کولیا، بیبزنی، لە گوندەکانیان ئەوانەی سەر

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەوە بڕوانە: عماد عبدالسلام، المصدر السابق، ص٢٣٧.

[2] Austin Henry Layard: po.cit. pp.371-372.

[3] صدیق الدملوجي:المصدر السابق، ص ص١١٧-١٢٠.

بــه ئــاييني مەســيحين: هورســك، ســۆريا، ديربــون، قــرولا [١]. ســليڤانى عەشــيرەتێكى دێــرينن لــە ناوچــەكەدا، بەڵگەنامەيــەكى عوسمــانى كــە مێژووەكـەى دەگەڕێتـەوە سـاڵى (٩٨٣ك/١٥٧٥)، لـە چوارچێوەى ناكۆكييـە نێوخۆييەكانى ميرايەتى (ئاميدى)دا، هاوڕێ لەگەڵ عەشيرەتى (سيندى)دا، ئامـاژەى بـۆ كـردووون[٢]. بەهـەمان شـێوە (شـەرەفنامە)ش پێكـەوە لەگـەڵ عەشـيرەتى (سـيندى)دا، وەك (سـليمانى)، كـە لـە ناوچـەى (زاخـۆ) دەژيـن، ئاماژەى بۆ كردوون[٣].

### ١٣- سنـدى

عەشـيرەتيكى تێكـەڵن، موسـڵمان و مەسـيحى، لـە سـەرەتاكانى سـەدەى بيستەمدا تێكڕا (١٥٠٠) خێزان بوون[٤]، بەشە مەسيحييەكەى ئەم عەشيرەتە (كەمينە) بوون پێكهاتبوون لە دوو لق ئەوانيش: سلوپ (٦٠٠) خيزان، گولى

---

[١] كاميران عبدالصمد احمد الدوسكي: المصدر السابق، ص٢٨٧.

[٢] بۆ زانيارى زياتر لەم بارەوە بڕوانە: عماد عبدالسلام، دراسات وثائقية فى تاريخ الكرد الحديث و حضارتهم، ص٢٣٩.

[٣] شەرەفخانى بدليسى: سەرچاوەى پێشوو، ل١٦٢.

بە گوێرەى سەرچاوەيەك، گێڕانەوەكان باس لەوە دەكەن بناغەى زاخۆ ساڵى ١٥٦٨ لە لايەن عەشيرەتى سليڤانييەوە كە لە باشوورى شوێنى شارۆچكەكەدا نيشتەجێ بوون دامەزراوە، خێزانى شەمدين ئاغا كە لە شارۆچكەكەدا جێگيربوون و پاشتر هەڵكەوتن، لە بنەڕەتدا سەر بەم عەشيرەتەن، ئەم خێزانە لە كۆتاييەكانى سەدەى نۆزدەهەمەوە تێكڕاى موسڵمانەكان، جوولەكە و كريستانەكانى زاخۆ و دەوروبەريان حوكم دەكرد بڕوانە:

Mordechai Zaken,Jewish Subjects and their Tribal Chieftains in Kurdistan, A Study in Survial, Leiden-Brill-2007, p.35.

[٤] مارك سايكس: المصدر السابق، ص٤٨.

(٣٠) خێـزان[١] و لـه گونـدەکانیان (دەشـتەتەخێ، شـرانش، بیرسـفی)یـه، لـه لقەکانی تری ئەم عەشیرەته: بساڤا، نیری، بنستانی، جونکی، سوفی بـابلا، برخـی، مجـولی... لـه گـرنگترین گونـدەکانیـان: دار هـۆزان، هیـزاوا، کنـدك، دەحلـك، هـورز، قەسـرۆك.... [٢]. سندی مێژوویـەکی دێـرینی لـه ناوچـەکەدا هەیـه، وەك پێـشتر ئامـاژەمـان پێکـرد، چ لـه بەڵگەنامەیـەکی عوسمانیـداو چ (شەرەفنامە)ش هاوڕێ لەگەڵ عەشیرەتی سلیڤانی، لـه کۆتاییـەکانی نیـوەی دووەمی سەدەی شانزەهەم پێکەوە ناویان هاتووە.

## ١٤-دۆســکی

ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ بۆ ساڵی (١٨٩٤) ئامـاژەی پێداون[٣]، ئەو کات سـەر بـه قـەزای ئامێـدی بـوون، (دائـودی)یـەش سـەنتەریان بـووە، هـەر بـەو ناوەشـەوە نێـودەبران، لـه (٤) لـق پێکهـاتبوون ئـەوانیش: چـیایی، هـەمبی، ئەرتیـسی، کـاتولی [٤] بـه پێـی مـارك سـایکس تێکڕا ژمارەیـان (٥٠٠) خێـزان بـووە، بەشـێکن لـه دۆسـکیەکانی گەڤـەر کـه ژمارەیـان (٢٠٠٠) خێزانێـك بـووە[٥]. دۆسـکی مێژوویـەکی دێرینـی لـه ناوچـەی بادینانـدا نییـە، چـونکە شەرەفنامە لە چوارچێوەی ناوهێنـانی عەشیرەتەکانی بادینانـدا، لـه کۆتـایی سەدەی شانزە ئامـاژەی بـۆ نـەکردوون، نیشتمانی دێرینیشیان کوردستانی

---

[١] المصدر نفسه، ص٤٨.

[٢] كاميران عبدالصمد احمد الدوسكي: المصدر السابق، ص٢٨٨.

[٣] سالنامت ولايت موصل: ١٣١٢، ص٢٨٥.

[٤] صديق الدملوجي: المصدر السابق، ص١١٠.

[٥] بڕوانە: القبائل الكردية، ص٤٣. سەرچاوەیەکی عوسمانی بە (٤٣٠) خێزان ئامـاژەی بۆ کردوون. بڕوانە: فەیسەڵ دەباغ: سەرچاوەی پێشوو، ل٧٣.

باكوورەو پێدەچێ دوای ڕۆژگاری بەدلیسی کۆچیان کردبێت بۆ بادینان[١].
سەرچاوەیەك کە دەگەڕێتەوە ساڵی (١٨٢٠) وەك شارۆچکەیەکی بچووك ئاماژەی بۆ دهۆك کردووەو گوایە لەگەڵ هەشت گوندی تردا شوێنی نیشتەجێبوونی عەشیرەتی (دۆسکی)یە[٢]

## ١٤-هەرکـــی

عەشیرەتێکی کۆچەری هەرە گەورەو پەرتو بڵاون، بەشی زۆریان کەوتوونەتە ناوچەکانی نزیك (موسڵ)، لە ناوچەکانی نزیك (ئەرزەڕووم)و(وان)یشدا بوونیان هەیە، لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا بە (٣٠٠٠) خێزان هەڵسەنگێندراون، لە لقەکانی (مەندان، زیرهاتی (سەرهاتە)، زەیدان (سیدان)، حاجی)[٣]. وەك خەڵکانێکی پلە یەك لەجەنگاوەریو سەرچاوەی ئاڵۆزیو کێشەی دوور لە چارەسەر لە ناوچەی ڕەواندووز ئاماژەیان بۆ کراوە، کە هەندێ لە ژنەکانیشیان توانای چەك هەڵگرتنیان هەیەو وەك پیاو دەجەنگن، بەڵام بەگشتی ڕکیان لە کشتوکاڵکردن دەبێتەوە[٤]. سنووری جوگرافی هەرکی بەم چەشنەیە: لە وەرزی زستاندا لە ناوچەی (دیرە)ن لە ڕەواندوز[٥]، هاوینانیش ناوچەکانیان کە لەبەر قرچەی گەرما وشك دەکەن بە جێدەهێڵنو بۆ لەوەڕاندنی مێگەلەکانیان شوانەکانیان

---

[١] صديق الدملوجي: المصدر السابق، ص١١١.

[٢] Mordechai Zaken, op.cit, p.80

[٣] مارك سايكس: المصدر السابق، ص ص٤٣-٤٤ .
فەیسەڵ دەباغ: سەرچاوەی پێشوو،ل٩١. بەڵام ئەمەی دواییان، ژمارەی خێزانەکانی لە نێوان (٢٥٠٠ بۆ ٢٨٠٠) خەملاندووە.

[٤]تقرير دائرة الحاكم المدني البريطاني في العراق، ص ص٧١-٧٢ .

[٥] المصدر نفسه، ص ٧١.

بلاوەی لێدەکەن و دەچنە هەرێمە زۆرتر فینکەکانی شەمدینان، ئازربایجان و ورمیٚ لە ئێران[1].

## ١٥- ســـورچی

بە پێی مارك سایکس پێکهاتبوون لە (٣٠٠٠) خێزان، نزیکەی (١٠٠٠) خێزانیان تەواو کۆچەری بوون[2]. لە لقەکانی: یوسف کاسکی، حەریر، کلو، مام سامی، مام سالٚ، بن، مەلاباس (مەلا عەباس)ە[3].

لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا لقێکیان بە نێوی (باومر) لە ناوچەی ڕەواندوزەوە گواستویانەتەوە بۆ (کلاز)، نزیك مەرگەوەڕو شنۆ[4]. سنووری جوگرافیان بەم شێوەیە:

لە هەردوو کەناری رووباری زێی گەورەدا دەژین، ئەو بەشەی سورچی کە کەوتۆتە کەناری چەپی رووبارەکە، لە زەوی و زارەکانی بەستورەوە تا کانی عوسمان (وەتمان) شۆربۆتەوە، دەشتی (هەریر)یش بەزۆری سورچی تیا نیشتەجێیە، هەروەها تەپۆڵکەکانی دەوروبەر (بابا چیچك) تا شاخی قەندیل نزیك زێی بچووك، سەرباری ئەو شوێنانە هەندیٚ بنەماڵەی سورچی بە

---

[1] ژاك ڕیتۆریٚ: سەرچاوەی پێشوو، ل٦٥.

[2] مارك سایکس: المصدر السابق، ص ص٤٣-٤٤ . فەیسەڵ دەباغ: سەرچاوەی پێشوو، ل٩١.

[3] لقی مەلا باس بۆ ڕۆژگارێکی درێژ بە دەست ئاغاکانییەوە (مەحموود ئاغا و شەمسەددین ئاغا)وە شپرزەی دەستی شەڕ و ناکۆکی ناوخۆیی ببوون، تا ساڵ ١٩١٩ بە یەکجاری کۆتایی پێهێنرا. بڕوانە: تقرير دائرة الحاكم المدني البريطاني في العراق، ص ص ١٢٨-١٢٩.

[4] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: درويش باشا، المصدر السابق، ص٤٩.

شـێوەی پـەرش‌و بـڵاو کەوتوونەتـە ڕووی چـەپی زێ‌و شـێروانە، هەنـدێ گوندیشیان لە شاخی بەڕۆژێ هەیە[1].

### ١٦- بەرواری

عەشـیرەتێکی نیـشتەجێن، ژمارەیـان بـە گـوێرەی مـارك سـایکس لـە سـەرەتاکانی سـەدەی بیـستەمدا(٦٠٠) خێـزان بـووەو[2] لـە ڕووی نیـشتەجێبوونەوە دەبنـە دوو بەشـەوە، یەکـەم (بـەرواری بـاڵا)یـەو دەکەونـە باکووری چەمی کارە(گارا)، کە دەرژێتە زێی گـەورە، دووەمیـشیان (بـەرواری ژێـری)، دەکەونـە باشـووری گـارا[3]. لـە گـرنگترین گونـدەکانی بـەرواری بـاڵا: تەروانش، بناڤی، ئۆرە، هروور، ئایدە، ئاشووت هەرچی بەرواری ژێرییە، لـە گوندەکانی: سوارە (سوارە توکە)، براش، خرابیە، ئیسپێدار[4].

### ١٧- ئەترووش

عەشـیرەتێکی زۆر گـەورەن، ناوچـەکانی نیـشتەجێبوونیان لـە باشـووری گۆڵی وانەوە تا زاخۆو دهۆك دەگرێتـەوە[5].(مـارك سـایکس) ئەترووشـی وەك عەشیرەتێکی ئێجگار گرنگ ناوزەد کردووە، بۆچوونی وابووە ڕۆژێك دادێـت لێکۆڵینـەوەکان ئـەوە ئاشـکرادەکەن کـەوا ئەترووشـی ئـەو ئەڵقـە ونەیـە کـە

---

[1] تقرير دائرة الحاكم المدني البريطاني في العراق ، ص ١٢٧.

[2] مارك سايكس: المصدر السابق، ص٤٦.

سەرچاوەیەکی عوسمانی هەمان ژمارەی بۆ خێزانەکانی داناوە، بەڵام ژمارەی گوندەکانی بە (٢٨) داناوە. بڕوانە: فەیسەڵ دەباغ: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢.

[3] محەمەد ئەمین زەکی: سەرچاوە پێشوو، ل٢٤٥.

[4] عباس العزاوي: العمادية في مختلف العصور، مطبعة وزارة الثقافة، هەولير، ١٩٩٨، ص٧٢-٧٦. كاوة فريق احمد شاولي ئاميدي، المصدر السابق، ص١٨٨.

[5] میهرداد ئێزەدی: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٠٢.

کوردی عێراق به کوردی ئەرمینیاوە دەبەستێتەوە، ئەگەرچی لە(هەرکی)ش دەوڵەمەندترن، بەلأم لەشێوازی ژیانو دیمەنیاندا بەگشتی دەچنەوە سەر ئەوان[1]. لە ڕاپۆرتی کۆمیتەی کۆمەڵەی گەلاندا کە تایبەتە بە چارەسەرکردنی ناکۆکی نێوان تورکیا-بریتانیا لەسەر ویلایەتی موسڵ (١٩٢٤-١٩٢٥) وەك (یەکێتی ئەرتووشی) ئاماژەی بۆ کردوونو سەرجەم لقە کۆچەرییەکانی ناوهێناوە[2]. ئەترووشی هەندێ لە لقەکانی کۆچەریو هەندێکیشیان نیشتەجێ بوون، مارك سایکس بەم شێوەیە خەملأندوونی: (شەرەفان: ٣٠٠٠ خێزانن، گەورەترین فراکسیۆنی (ئەترووش)ین، بەهاران تا باشووری ئاکرێ دەچن)، (هەفجان: ٥٠٠ خێزانن)، (مام کور: ٤٠٠خێزانن)، (گەودان: ٣٠٠ خێزانن، لە بەهاراندا ڕەشماڵەکانیان نزیك زاخۆ هەڵدەدەن)، (زەفکی: ١٥٠ خێزانن)، هەروەها (زەدەك)، هەرچی لقە نیشتەجێکانییەتی پێکهاتوون لە: (میرزیکی: ٩٠٠ خێزانن، نزیك باش قەلاّ دانیشتوون)، (مامەد: ٢٠٠ خێزانن)، (مامەدان: ٢٠٠ خێزانن) (بیروز: ٦٠ خێزانن، بە تووتن چاندن بە نێوبانگن)، (مام ڕەش: ٢٠٠ خیزانن، هەڵگری بیرو باوەڕی یەزیدی بوون)، هەروەها (جرکیو ئالانو شیدازو ئیزیدیان)[3].

### ١٨- مزوری

عەشیرەتێکی نیشتەجێن، لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا بە (١٢٠٠) خێزان خەملێندراون[4]. شەرەفخانی بەدلیسی لە کۆتاییەکانی سەدەی

---

(١) بڕوانە: القبائل الكردية في الامبراطورية العثمانية، ص٥٣.

(٢) بڕوانە: عبدالرزاق محمود القيسي: المصدر السابق، ص١١٢.

(٣) مارك سايكس: المصدر السابق، ص٥٣_٥٤.

(٤) المصدر السابق، ص٤٥.

شـانزەهەمدا وەك گـرنگترین عەشـیرەتەكانی بادینـان نێـوی بـردوون[١]. لـە چوارچێوەی ئاماژەكردن بۆ ناكۆكی و كێشەی نێوان عەشیرەتەكانی بادینان، نـاوی عەشـیرەتی مـزوری هـاوڕێ بـە (زێبـار) لـە سـەرەتاكانی سـەدەی حەڤدەهـەم (١٧٠٦) لـە بەڵگەنامـەكانی عوسمانیـدا هـاتووە[٢]. بـۆ خۆیـان عەشـیرەتێكی بـە هێزبـوون و لـە نـاكۆكی و كێـشە نێوخۆییـەكانی میرایـەتی بادیناندا ڕۆڵی بەرچاویان گێڕاوە، سەرۆكی مزوری لە كۆڕو كۆبوونەوەكانی میری بادینانـدا پـێش سـەرۆك عەشیرەتەكانی تـر كـەوتووەو نزیـك بـە میر دانیـشتووە[٣]. عەشیرەتی مـزوری دوو بەشـن، مـزوری ژێـری لـە ڕۆژهـەڵاتی دهۆك نیشتەجێن و مزوری ژووری كەوتوونەتە باكووری ناوچەی بـارزان[٤]، لە لقەكانی: ئەلگوشی، خازیا، بەنانی، شەمكان، شەرەفان، مانا[٥]

١٩- گـــەردی

ژمارەیـان بـە پێـی مـارك سـایكس لـە سـەرەتاكانی سـەدەی بیـستەمدا نزیكـەی (٦٠٠٠) خێزانێـك بـووە[٦]، هـەر لـەو ماوەیـەدا سەرچـاوەیەكی عوسمـانی بـە (٧٠٠٠) خێـزان خەملاّنـدوونی[٧]. عەشـیرەتێكی نیمـچە كۆچەرین( هاوینان لە ڕەشماڵدا دەژێن و زستانیش لە نێو گوندەكاندا)، واتە هـەم كـشتوكاڵ دەكـەن و ئـاژەڵیش بەخێودەكـەن، بەمەبەسـتی لەوەڕانـدن،

---

[١] بڕوانە: شەرەفنامە، ل١٦٢.

[٢] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: عماد عبدالسلام رؤوف: دراسات وثائقية فی تاریخ الكرد الحدیث، ص١٧١.

[٣] صدیق الدملوجي: المصدر السابق، ص ص٩٦.

[٤] عباس العزاوي: العمادیة فی مختلف العصور، ص٧٠

[٥] صدیق الدملوجي: المصدر السابق، ص ص٩٦-٩٧.

[٦] مارك سایكس: المصدر السابق، ص٣٨.

[٧] فەیسەڵ دەباغ : سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٧.

هاوینـــان ڕانو مێگەلـــەکانیان دەبـــەن بـــۆ (وەزنـــێ) [1] بـــەگوێرەی (عبـــاس العزاوي) لقێك لە گەردییەکان لە لە ناوچەی مەلاتیەو شەمدینان‌دا دەژیان‌و لە بنەوانەدا دەچنەوە سەر نورەدینیەکانی پشدەر[2]. لە قۆناغی جەنگی یەکەمی جیهانی، ئەو لقەی (جەمیل ئاغای کاکل ئاغا) سەرۆکیان بووە، لە کەنارەکانی دۆڵی بەستۆڕەدا ژیاون، هەرچی لقی (مەسجد ئاغا)یە لە ناوچەی ڕەواندوزدا لەنێوان دۆڵی باستورەو دیرەدا بووە، دوو گوندیشیان لە ناوچەی کۆیە (حەمەد ئاغا سەرۆکیان بووە[3].

## ٢٠- کۆمەڵە عەشیرەتەکانی ئێزیدی

ئێزیدییـــەکان زیـــاتر کۆنفیدراســـیۆنێکی ئـــایینین‌و تاکـــەکانی ڕۆحـــی ئێزیدیبوون زیاتر تا هاوپەیمانێتی عەشیرەتی، پێکەوەیان دەبەستێتەوە[4]. تا سەرەتاکانی سەدەی بیستەمیش زانیاری لەبارەی عەشیرەتەکانی ئێزیدی بە تایبەت ناوچەی شاخی شەنگار کەم بوو، بە دەگمەن نێویان لەو نوسینە کەمانەدا هاتووە، کە گەڕیدەکانی سەدەی نۆزدەهەم دوای سەردانی ناوچەکە تۆماریان کردووە، بەڵام لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمەوە دەکرێ وردترو درێژتر قسە لە پێکهاتە ئایینی‌و ئیتینیەکانی دانیشتووی شاخی شەنگال‌و دابەشبوونی گروپە جیاوازەکانی بەپێی ناوچەکان بکەین، بەشی سەرەکی ئەو عەشیرەتانەی کە پاشتر لە (شەنگال)دا ڕۆڵی گرنگیان گێڕا، لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمەوە چونەتە شەنگال‌و تیا جێگیربوون،

---

[1] مارك سايكس: المصدر السابق، ص٣٨.

[2] عباس العزاوي: عشائر العراق الكردية، ص ص٧١-٧٢.

[3] تقرير دائرة الحاكم المدني البريطاني في العراق، ص ٦٢.

[4] میهردادی ئیزەدی: سەرچاوەی پێشوو، ل٢١٢. عبدالعزيز سليمان نوار: تاريخ العراق الحديث، ص١٢٤

گـرنگترین ئـەو عەشـیرەتانەش (قـیران، سموقـەو حـسکان)ی ئێزیـدی بـوو، ئەمانـە دێـرینترین عەشیرەتە نیشتەجێکانی شاخی شـەنگال بوون‌و نیمـچە کۆچەری بوون semi-nomadic[1]

پـووری گـەورەی ئێزیدییـەکان لـە باشـووری کوردسـتان دا، کەوتۆتـە دوو ناوچەی جیاواز، یەکەمیان: لە (شێخان)ە، نزیك بـە مەزارگـەی شێخ عـادی‌و (٥٠) کـم دەکەوێتــە بــاکووری شــاری موســڵ، دووەمیــشیان: لــە شــاخی (شەنگال)ە لە باکووری رۆژئاوای هەمان شارە بە ئاراستەی سنووری سوریا [٢]، هـەروەها چـەند دەسـتەو تاقمێکیـان لـە دهـۆك‌و بەعـشیقەدا دەژیـن[٣]. بـەگوێرەی راپـۆرتی کۆمـەڵێك لـە پـسپۆڕان‌و ئەفسەرانی ئینگلیـز کـە ساڵی ١٩٢٣ بڵاوکراوەتـەوە، ژمـارەی ئێزیدییـەکان لـە عێـراق‌و بەتایبـەت ناوچـەی موسڵ زیـاد لـە (٢١)هـەزار کـەس بـوون[٤]. لـە راپـۆرتی کۆمـسیۆنی کۆمەڵـەی گەلانیشدا کە تایبەتە بە چارەسەرکردنی کێشەی ویلایـەتی موسـڵ (١٩٢٤-١٩٢٥)، لایـەنی عێراقـی-بریتـانی ژمـارەی ئێزیدییـەکانیان لـە عێراقـدا بـە (٢١٠٠٠ تــا ٣٠٠٠٠) کـــەس خەملاندوووە، بـــەڵام لایـــەنی تـــورکی بـــە (١٨٠٠٠)کەس داینـاون[٥].

---

[7] Nelida Fuccaro: the Others Kurds; Yazidis in Colonial Iraq. London-I.B. Tauris publishers-1999, p.55.
Mehemed hurşid ;ويليام ايغلتون: المصدر السابق ، ص١١٠

[٢] paşa: A.G.E, s. 227

[٣] عباس العزاوي: عشائر العراق الكردية، ص١٠٨.

[٤] بڕوانە: کورد و کوردستان، ل ١٢٦.

[٥] بڕوانە: عبدالرزاق محمود القيسي: المصدر السابق، ص١٣٢

جێی خۆیەتی لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەین کە بەگوێرەی سەرچاوە مێژووییەکان، ژمارەی کۆمەڵە عەشیرەتەکانی ئێزیدی لە سەدەکانی پێشوتردا زۆر لەوە زیاتربوون، بۆ وێنە لە سەرچاوەیەکدا هاتووە کە ئێزیدییەکان لە سەدەی هەژدەهەمدا (٢٥٠٠٠٠) کەس بوونو لە سەدەی دواتردا دابەزیوە بۆ (٢٠٠٠٠٠) کەس، دواتریش ئۆپەراسیۆنەکانی ڕەشەکوژی ئێزیدییەکان هێندە ترسناك بووە، لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا (٥٠٠٠٠) کەسیان لێماوەتەوە[١]. بەگوێرەی (ڕۆجەر لیسکۆ) ئێزیدییەکان لە نێوان ساڵەکانی (١٦٤٠تا١٩١٠) بیست کوشتاری گەورەی کۆمەڵکوژیان بەخۆوە دیوە[٢]. هەڵبەتە سەرچاوە مێژوویەکان بڕێکی زۆر لەو کۆمەڵکوژییانە دەسەلمێنن، بەلأم بە بڕوای ئێمە زێدەڕۆی لەم ژمارانەدا هەیەو ناکرێ بە شێوەیەکی ڕەها وەربگیرێن.

عەشیرەتەکانی ئێزیدی لە شاخی شەنگاردا بەسەر دوو گروپدا دابەشدەبن، یەکەمیان: جەوانە یا جاوانا-Jawana یە، دووەمیان: خورکان-Khurkan، گروپی یەکەم بە گشتی لەهەردوو ڕووی باکوورو باشووری شاخی شەنگال نیشتەجێنو بە پرۆسەی کشتوکاڵکردنەوە سەرقاڵن. هەرچی گروپی دووەمە لە ڕۆژئاوای شاخەکە دەژێنو خاوەن زەویو

---

[١] نەجاتی عەبدوڵلاّ: کورتە باسێکی ئێزیدیناسی، لە چوارچێوەی کتێبی: ئەنستانس ماری کەرمەلی، کتێبی ئێزیدییەکان (جیلوە و مەسحەفا ڕەش) و بیبلیۆگرافیای ئێزیدیاتی، و.نەجاتی عەبدوللاّ، چاپخانەی شڤان، سلێمانی ٢٠٠٦، ل ل١٧-١٨. ژمارەی دووەم لەگەڵ هەڵسەنگاندنی (ژان پاتیستان پوژولا) یەدەگرێتەوە، کە نێوبراو لە ساڵی ١٨٣٧ دا هاتۆتە کوردستان و دانیشتوانی ئێزیدی لە ناوچەکە بە (٢٠٠٠٠٠) کەس خەملاّندووە. بڕوانە: گەشتنامەی پوژولا بۆ کوردستان ساڵی ١٨٣٧، ل٣٦.

[٢] نەجاتی عەبدوڵلاّ: کورتە باسێکی....، ل١٩ .

زارێکی کشتوکاڵی بەپیتن، سەرباری خاکێکی بەرین بە درێژی ڕۆژئاوای زنجیرە شاخی شەنگال کە بۆ لەوەڕگە بەکاردەهێنرێن، ئەمەش بۆخۆی شێوەژیانێکی نیمچە ئاژەڵداریو ڕەوەندی وەرزیانە بۆ پێدەشتەکانی جەزیرە پێبەخشیون[1].

پۆلی خورکان پێکهاتوون لەم لقە سەرەکییە نیمچە کۆچەرییانە (حسکان، سموقەو قیران)، هەرچی گروپە بچووکەکانی خۆرکانییە بریتین لە (مەندیکان، چالکان، چلکان، کورکورکان، ڕەشکان، هیورییە -Haywiriyya). لە ڕۆژهەلاتی (شەنگال)دا عەشیرەتی مەندیکان نیشتەجێیە کە ئێزیدیو موسڵمان تێکەڵنو لە ڕووی سیاسییەوە پەیوەستن بە عەشیرەتی حەبابە -Hababat ەوە کە عەشیرەتێکی نیشتەنین[2].

پۆلی جاوانا (یا جەوانە) بە گوێرەی دەمەلۆجی بریتین لە سێ لقی سەرەکی گرنگ ئەوانیش (هەبابات‌و مەهرکان‌و مالا خالتا)[3] هەرچی گروپە بچووکە پاشکۆکانێتی پێکهاتوون لە (مەسقورە، دلکان، عالدینا، عەمرا، ئادی دلە، قاسمۆك، کزان، جوکان، هسکالیە، عەلی سورکا...هتد) [4]

---

[1] Fuccaro: op.cit, p.59.

[2] Fuccaro: op.cit, p. 60.

[3] بڕوانە: صديق الدملوجي: اليزيدية، ص٢٣٣. Fuccaro: op.cit, p.61
ئەم سەرچاوەی دواییە لە بری (مالا خالتا)، هاوڕێ بە هەبابات و مەهرکان (مەسقورە)ی وەك لقێکی سەرەکی ئاماژە پێداوە.

[4] عدنان زيان فرحان، الكرد الايزيديون في اقليم كردستان، مركز الدراسات الاستراتيجية، السليمانية، ٢٠٠٤، ص٢٢٣.

هەرچی ئێزیدییەکانی (شێخان)، ئەوانیش بریتین لە دوو پۆل، یەکەمیان (ڕۆحانییەکان)ە بە پلەو پۆستە ئایینیە جۆراوجۆرەکانیانەوە[1]، کە دەچنەوە سەر بنەماڵە ئایینیە ناسراوەکان، دووەمیان (موریدەکان)ە کە بریتین لە خەڵکی ڕەشۆك و لە خزمەت و بۆ بەختەوەری سەرۆکە ئایینیەکانیان دەژێن[2]. دەرکەوتووترین عەشیرەتەکانی ئەم ناوچەیە: باستەکی، بەلسینی، بیدیی، تەرك، هەکاری، خیسەکی، دنادیە، ڕۆبنشتی، تازی، قائدی، کرنی، ماموسی، هراقی، ڕۆژەکی...هتد[3]. هەروەها لە زاخۆو سلیڤانیدا چەند عەشیرەتێکی تری ئێزیدی دەژێن کە بوونیان لە ناوچەکەدا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێکی زوو، ئەوانیش: ماسکی، موسانەو هۆبرییە[4]. لە دەوروبەری سەدەی حەڤدەهەمەوە بنەماڵەی میرانی (چۆل بەگ) ڕابەرایەتی عەشیرەتەکانی ئێزیدییان کردووەو هەموو ملکەچی بنەماڵەکەن کە لەیەك کاتدا ڕۆڵی ڕابەری دنیایی و ئاینیشیان لە ئەستۆدایەو لە ڕووی ئابووری و هەموو لایەنێکی ترەوە لە لایەن ئێزیدییەکانەوە پاڵپشتی دەکرێن[5]. تێکڕای بەشە جیاوازەکانی ئێزەدی سەرۆکی تایبەتی خۆیان هەیەو خۆیان هەڵیانبژاردوون، لە هەمان کاتیشدا دەبێ میری گەورەی

---

[1] پیاوانی ئاینی ئێزەدی بریتین لەم شەش دەستەیە: (شێخ، پیر، قەواڵ، فەقیر، کۆچاك، مورید) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ا.م. مینتیشاشڤیلی: سەرچاوەی پێشوو، ل٦١.

[2] عبدالرزاق الحسني: اليزيديون في حاضرهم و ماضيهم، ط١١، منشورات مكتبة اليقظة العربية، بغداد، ١٩٨٨، ص١٢٤.

[3] سامي سعيد الاحمد: اليزيدية احوالهم و معتقداتهم، ج١، بغداد، ١٩٧١، ص٤٤.

[4] صديق الدملوجي: اليزيدية، ص٢٤٥.

[5] میهرداد ئێزەدی: سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٥٨; عدنان زيان فرحان، المصدر السابق، ص٢١٣.

**ئێزیدی بەو هەڵبژاردنە قایلبێت[1]. بارەگای ئەم میرە لە (گوندی باعەدرا)یە لە قەزای شێخان لە باکووری ڕۆژهەڵاتی موسڵ، ئەو شوێنەی مەرقەدی شێخ عادی کە پیرۆزترین ئارامگەی لای ئێزیدیەکان گرتۆتەخۆ[2] و بەهۆی پێگەو دەسەڵاتی بەرفراوانی بەسەر عەشیرەتەکانی ئێزیدی دا سەروەت و سامانێکی زۆری دەستدەکەوت و هەرچی دەوڵەتی عوسمانییە تا ساڵی ١٨٧٥ بە فەرمی دەسەڵاتی ڕەهای میرە گەورەی ئێزیدییەکانی ناساندبوو[3].**

### ٢١- برادۆست

**بەگوێرەی پ. لێرخ لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا برادۆست پێکهاتبوون لە (٥٠٠) خێزان و لە نزیکەی (١٠٠)گونددا ژیاون[4]، بەگوێرەی مارك سایکس لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا (١٥٠٠) خێزان بوون. عەشیرەتەکە نێوی خۆی لە رووباری (برادۆست)ەوە وەرگرتووە[5]، لە باکوورەوە بە لیوای هەکاری و وان، لە ڕۆژهەڵاتەوە لە گەڵ ئێران دا هاوسنوورە، لە ناحیەیەك و (٦٤) گوند پێك هاتوون[6].**

---

[1] کۆمەڵێك لە پسپۆران و ئەفسەرانی سیاسی ئینگلیز، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٦.

[2] وەدیع جویدە: سەرچاوەی پێشوو، ل٥٧.

[3] صدیق الدملوجي: الیزیدیە، ص٢٩٥ ; عبدالرزاق الحسني، المصدر السابق، ص٦٦.

[4] دراسات حول الایرانیین و اسلافهم الکلدانیین الشمالیین، ص٧٤.

[5] مارك سایکس: المصدر السابق، ص٤٤.

[6] ئەحمەد تاقانە (وەرگێڕان)، کورد و کوردستان لە یەکەم ئەنسیکلۆپیدیای تورکی لە مێژوودا، قاموسولئەعلامی شەمسەدین سامی، چ١، هەولیر ٢٠٠٨، ل١١٤.

### ٢٢- دزەیـــی

عەشیرەتێکی گەورەن، بەشێکی کۆچەریو بەشەکەی تری کشتوکاڵکارە بوون، بەگوێرەی مارك سایکس لـە سـەرەتاکانی سـەدەی بیستەمدا نزیکـەی (٥٠٠٠)هـەزار خێـزان بـوون[1]، سەرچـاوەی تـر لـە مـاوەی سـاڵانی جـەنگی یەکەمـدا بـە (٦٠٠٠)مـاڵ داینـاون، لقـەکانی بـریتین لـە: پـیران، گوتیـولا، مامان[2]. سنووری جوگرافیایش: لە باکوورەوە زێی گـەورە، لای باشـوورەوە زێی بچووك، لـە رۆژهەڵاتـەوە ڕێگـەی ئاڵتون کـۆپری-هـەولێر، لـە رۆژئـاواوە زەوییە نزمایییەکانی دەوروبەری دیجلە[3].

### ٢٣-خۆشنـاو

عەشیرەتێکی تەواو نیشتەجێن، بەپێی خەملاندنی مارك سایکس نزیکەی (٢٠٠٠) خێـزان بـوون[4]، بـەپێی سەرچـاوەیەك لـە مـاوەی جـەنگی یەکـەمی جیهانیـدا تێکـڕا لـە ناوچەکانی شـەقڵاوەو رانیـەو کۆیـە خـاوەن (٩٣) گونـد بـوون[5]. ریـچ سـاڵی ١٨٢٠ لـە بارەیانـەوە دەڵێـت: خۆشـناو لـە سـێ لـق پێکهاتوون، ئەوانیش بـریتین لـە (میر مەهمەلیو میر یوسفیو پشتدەری)و ئاماژە بۆ ناکۆکیو دوژمنایەتییەکی دێرین دەکات لە نێوان هەردوو لقی میر مەهمەلیو میر یوسفیدا[6]

---

[1] مارك سایکس: المصدر السابق، ص٣٥.

[2] مێجەر ئي.بي.سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، ل ٤٧.

[3] هەمان سەرچاوە، ل ل ٤٧- ٤٨.

[4] بڕوانە: القبائل الكردية....، ص٤١.

[5] تقرير دائرة الحاكم المدني البريطاني في العراق، ص ٩٣.

[6] Claudius James Rich: op. cit, p.101.

### ٢٤- نیـــروه

عەشیرەتێکی نیشتەجێن، ژمارەیان بە گوێرەی مارك سایكس (٨٠٠) خێـزان بووه[١]، پێدەچـێ نێـوی عەشیرەتەکە لـە ناوچەکەوە وەرگیرابێـت[٢]. نـیروه لـە بنەوانـەدا دەچـێتەوە سـەر عەشـیرەتی دۆسـکی و لـە هەنـدێ لقـدا هاوبەشن، لە گوندە ناودارەکانیان: دوتازە، نیروە، سرتی، بیبو[٣].

### ٢٥- ڕێکـــان

عەشیرەتێکی نیشتەجێن، ژمارەیان لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا بە (٨٠٠) خێـزان خەمڵێنـدراوە[٤]. کەوتونەتـە ڕۆژهـەڵاتی عەشـیرەتی (نێـروە)، ئەمانیش بە بەشێك لە عەشیرەتی دۆسکی دادەنرێن، کە لـە چۆڵەمێرگەوە هـاتوون و لـە ناوچـەکە نیـشتەجێبوون و پێـوەی ناسـراون، لـە گـرنگترین گوندەکانیان: وەرخەل، میزی، چمێجی، هورە، وێڤکی، زهومی...[٥].

### ٢٦- ئاکـــۆ

عەشیرەتێکی نیمچە کۆچەرین، ژمارەی خێزانەکانی لە ناوەڕاستەکانی سـەدەی نۆزدەهەمـدا بـە (٥٠٠) خێـزان خەمڵێنـدراوە[٦]، هـەر لـەو ماوەیـەدا سەرچاوەی تر کۆی نێرینـەکانی عەشیرەتەکەی بـە (٦٠٠٠) کـەس داناوە،

---

[١] بڕوانە: القبائل الكردية .... ، ص٤٥.

[٢] عباس العزاوي: عشائر العراق الكردية، ص١٠٢.

[٣] عباس العزاوي: العمادية في مختلف العصور، ص ص٧٨-٧٩.

[٤] مارك سايكس: المصدر السابق، ص٤٥.

[٥] عباس العزاوي: العمادية في مختلف العصور،ص٨٠-٨١. كاميران عبدالصمد احمد الدوسكي: المصدر السابق، ص٢٨٢.

[٦] مارك سايكس: المصدر السابق، ص٤٢.

گوایە تێکڕای خەڵکەکەی لە (٤٣) گونددا ژیاون[١]. ئەدمۆندز لە ڕووی جوگرافییەوە لقەکانی بەم چەشنە دەستنیشانکردووە:

ناودەشتی:

لە دوو لق پێکدێن: (شروشی) لە (٨) گوندی قەندیل دەژێن، (ڕاژیکەری) کە بریتییە لە(٣) بنەماڵە: (باوبی) لە (٦) گوندی لە سەرووی شروش و ناوچەی تر، (خێلا) لە (٧) گونددا لە نێوان باوبی شروشدا دەژێن، (ماندومرە) لە (٩) گونددا دەژێن لە باشووری خێلا.

شاور:

لە (١٤) گونددا لە سەرووی دۆڵی شاور دەژێن، (رانیە) لە (١٨) گونددا لە خوارووی دۆڵی شاور. سەرباری ئەمانە لە نێو (ئاکۆ)دا دوو عەشیرەتی کۆچەری تر هەیە ئەوانیش: بۆڵی و بابۆڵی، تێکڕا (١٥٠) ڕەشماڵن، هاوینان دەچنە رۆژهەلاتی رەواندوز، زستانانیش مانەوەیان بەندە بە توانای بەکرێگرتنی لەوەڕگەی شوێنەکە ، ئیدی لە رانیە یا کۆیە یا هەولێر بێت[٢].

### ٢٧- شەرەفبەیانی

شەرەفبەیانی عەشیرەتێکی نیشتەجێن، دەکەونە دەشتەکانی باشووری سیروان و ناوچەی هۆرین و شێخان[٣]، ژمارەی خێزانەکانی لە ماوەی جەنگی یەکەمدا بە (٧٠٠) خێزان خەمڵێندراوە[٤]، بەلاّم سەرچاوەی دیکە لە ماوەی

---

[١] Mehemed Hurşid paşa, A.G.E, s. 227

[٢] سي. جي. ادموندز: المصدر السابق، ص ص٢٠١-٢٠٢

[٣] مێجەر سۆن: سلێمانی ناوچەیەك لەکوردستان ، ل ٨٨.

[٤] تقرير دائرة الحاكم المدني البريطاني في العراق، ص ص١١٧-١١٨.

دوای جەنگدا بە (١٠٠٠)ماڵ داینـاون[١]. لقـەکانی شـەرەفبەیانی بـەواتای تەواوی وشەکە بریتیین لە: عەزیز بەگی و ئەمیر خان بەگی، هەرچی لقـەکانی ترە ئەوا لە بنچینەدا کشتوکاڵکارەن، گرنگترینیـان (کـەورکی–کویرەکی)یـە کـە لـە هەرشـەل و بـەنبۆ (بـانیبی) دەژیـن و بەشـی سـەرەکی جـەنگاوەرەکان پێکـدەهێنن. هەرچـی (گێخـوارو نادرییـەکان)ە لـە زەهـاوەوە پـەڕیوەبوون[٢]. سنووری جوگرافییان: بە دیوی باشووردا ئـەو سێگۆشـەی دەکەوێتـە نێوان گردەکـانی شـەواڵدڕە، لـە رووی رۆژئـاواو بـاکوورەوە رووبـاری سـیروان، لـە رۆژهەڵاتەوە دۆڵی پشتەو شاخی (بەمۆ)یە[٣].

## ٢٨- کاکـــەیی

کاکەییـەکان لـەریزی عەشیرەتە نیشتەجیٚ و کشتوکاڵکارەکاندا دانـراون و ژمارەیـان بـەگوێرەی خەملاندنـەکان لـە مـاوەی جـەنگی یەکـەمی جیهانیـدا (١٥٠٠) خێزان بوون[٤]. کاکـەیی لـە بنەوانـەدا نـاوە بـۆ تایفەیـەکی ئـایینی[٥] نـەك ناسـنامەی عەشـیرەتێك، لەگـەڵ ئەوەشـدا لـە عەشـیرەتە کوردییـەکان جیاناکرێنـەوە، زۆر جـاریش بـەو شـوێن و ناوانـەوە ناسـراون کـە کۆیـان دەکاتەوە لەوانـە: هەفتـەغاری، قەرەحەسـەن، جولمـەکی، سـەی کـاکی، مـام و

---

[١] خاطرات علي اكبر خان سنجابي، ايل سنجابي و مجاهدت ملى ايران، تحرير و تحشية: كريم سنجابي.چ اول، تهران ١٣٨٠، ص١٩.

[٢] مێجەر ئی. بی. سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، ل ل ٨٠-٨١.

[٣] تقرير دائرة الحاكم المدني البريطاني في العراق، ص١١٧.

[٤] مێجەر سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، ل٧٤.

[٥] سي. جي. ادموندز: المصدر السابق، ص ١٦٨.

باوە[1]. گرنگترین بنەماڵەی سەیدەکان لە باشووری کوردستان دا بنەماڵەی ئیبراهیمییە، کە کۆنترین لقی کاکەییە.

گرنگترین مەڵبەندی نیشتەجێبوونی کاکەیی، ئەو کۆمەڵەیە کە لە نزیکەی (١٨) گونددا دەژین و کەوتۆنەتە سەنتەری ناحیەی تاووق لە لیوای کەرکوك، مێژووی جێگیربوونیان لەو ناوچەیە، دەگەڕێتەوە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم، کاتێ سەیدەکانیان (ڕۆستەم، خەلیل) زەوی زارەکانی (قەرەحەسەن، گل و تاووق)یان کڕی، دەستەی دووەمی کاکەیی لە سنووری عێراق –ئێراندا، لە نێوان (خانەقین و قەسری شیرین)دا دەژێن. دەستەی سێیەمی کاکەیی (٧) گوندەو کەوتۆتە هەردوو کەناری ڕووباری زێی گەورە. گوندی (هاوار)یش کە بە نزیکەی (١٣)کم کەتۆتە ڕۆژهەلاتی هەڵەبجە گرنگترین مەڵبەندی کاکەییە[2].

٢٩- داوودە

عەشیرەتێکی نیمچە کۆچەری و سەرقاڵی ئاژەڵداری و کشتوکاڵ بوون، ژمارەیان لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم لە نێوان (٣٥٠٠ بۆ ٤٠٠٠) ماڵ دانراوە[3]، لقەکانی بریتییە لە: شێخەوەند، پیرام وەند، کەرەم وەند، خەڵەف وەند، دیلانی، قەواڵی، بارنەوەری[4]. بەپێی شوێنی نیشتەجێبوونیان داودە

---

(١) عباس العزاوي: المصدر السابق، ص٩٥.

(٢) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: سي. جي. ادموندز: المصدر السابق، ص١٧٨-١٧٩.

(٣) فەیسەڵ دەباغ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٢. Naval Staff: Intelligence Department, op, cit, p.111. ئەمەی دواییان تەنها بە (٤٠٠٠) ماڵ خەملاندوونی، بەلاّم مێجەر سۆن بە (١٠٠٠) ماڵ خەملاندوونی، بڕوانە: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی باشوور، ل٤٥

(٤) مصطفی نەریمان: سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٥.

دەكرێن بە دوو بەشەوە، (داودەی كوێستان) ئەوانەی لە گوندەكانی ناو چیاو هەردەكانی رۆژهەڵاتی دوزخورماتوو ئەژین، وەك: قەڵخانلۆ، عەزیز قادر، توكن، تەپەچەرموو، دوڕاجی، زندانە، سماق، پەڵكانە، مازوغ. بەشی دووەمیان (داودەی گەرمیان) دەكەونە پێدەشتی رۆژئاوای دووز تا نزیك تاوغ (داقووق)، لە گوندەكانی: حەوتتەغار، ئیفتخار، ئەلبوو، سەڕاج، چەورگە، عەلی سەرای[1].

### ٣٠- زەنـــد

عەشیرەتێكی نیشتەجێ و كشتوكاڵكارن، پێش جەنگی یەكەمی جیهانی ژمارەیان (٦٠٠) ماڵ بووە[2]. لقەكانی بریتییە لە: تایەرخان، محەمەد ساڵح ئاغا، غەنی، عەلیان (ئەلیان)[3]، لەناوچەی (زەنگاباد)دا لە گوندەكانی: كۆكس، كوڵەجۆ، لالوبان، قوبە، هودەلی، ستابان، خورەمە...دەژێن[4]، بەشێكی تری عەشیرەتی زەند لەكوردستانی رۆژهەڵاتدا دەژێن، ژمارەیان لەكۆتاییەكانی سەدەی نۆزدەهەمدا بە نزیكەی (٤٠٠) خێزان خەملێندراوە، لە گوندەكانی: ماچكە، ئاڵێ پینەك، قەڵا پۆلا، نیشتەجێبوون[5].سنووری جوگرافی زەند لە باكوورەوە گردی كوشك، لای رۆژئاواوە عەشیرەتی

---

[1] سەرچاوەی پێشوو، ل ٩٥.

[2] مێجەر ئی. بی. سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەكانی كوردستانی خواروو، ل ل٩٢-٩٣.

[3] محمد مردوخی كوردستانی: سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٥.

[4] تقرير دائرة الحاكم المدني البريطاني في العراق، ص١٤٥.

[5] میرزا شكرالله سنندجی"فخر الكتاب": هۆزو تیرەو تایفەی كورد لە كوردستانی ئەردەڵان، و. ئەنوەر سوڵتانی، چاپخانەی شڤان، سلیمانی ٢٠٠٦، ل ل ٨٨-٩١.

پالأنی، بەدیوی رۆژهەلأتدا رووباری سیروان، لە رۆژهەلأتیشەوە پێدەشتی دەوروبەری کفری[1].

## ٣١- قەرەولـووس

بە گوێرەی سەرژمێری ساڵی (١٩١٧) بریتی بوون لە (١٦٥٠) کەس[2]. لە ساڵأنی دواتردا (مەردوخی)یش بە (٢٠٠٠) ماڵ داینـاون، لـە لقـەکانی: گـەش، کـاتیون (قـەیتوون)، نەفتـچی، کاکەوەنـد، چـارماوەندی، گاسـواری (گاوسـواری)[3]. سـنووری جـوگرافیی قـەرەولووس: لـە بـاکوورەوە بەرزاییـەکانی دامێنـی چـیایی ئـەبی نـەفت تـا سـنووری ئێـران، لـە باشووریشەوە تەنگی سۆمار، لە رۆژهەلأتـەوە سنووری ئێران، ئەبی نەفت[4]. عەشیرەتێکی نیشتەنین، سەرقاڵی کشتوکاڵو مەڕداریو نەوت کاری بوون کە بە باری گوێدرێژ دەیانگواستەوە[5].

## ٣٢- دەلـۆ

ژمارەیـان بـە پێـی خەملأندنـەکان لـە مـاوەی جـەنگی یەکـەمی جیهانیـدا نزیکەی (٦٠٠) ماڵێك بوون[6] لە لقەکانی: کاش، چامڕیزی، پەنجانگوشتی

---

(١) مێجەر ئی. بی. سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، ل٩٣.

(٢) هەمان سەرچاوە، ل٧٧.

(٣) محمد مردوخی کردستانی: سەرچاوەی پێشوو، ل١١٣.

(٤) مێجەر ئی. بی. سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، ل٧٧.

(٥) هەمان سەرچاوە، ل٧٧.

(٦) تقرير دائرة الحاكم المدني البريطاني في العراق، ص٤٦.

(پێنج ئەنگوشتی)، سەلیم وەیسی، کارێزی، تەرکەوەند[1]، لقی حوکمڕانی سەرەکییان بریتیە لە چامرێزی[2]، سنووری جوگرافیی دەلۆ:

سنوورەکانی (چامرێزیو پەنجانگوشتیو سەلیم وەیسی)، لە باکوورو رۆژئاواوە جۆباری قۆجە جابان، لە باشووریشەوە جەبەل خوشك (کوش)، ئیبراهیم خانو حەیدەرەکەڵ دوو لە گوندەکانی سەرقەلاّ، لە سنووری (خانەقین)یش ئەم گوندانە لە خۆدەگرن: کانیبز، پەلکانە، کانی ماسی، ناوداومان، مستە، تەپەی سەوز[3].

### ٣٣- سوورەمێری

عەشیرەتێکی نیشتەجێی کشتوکاڵکارەن، پێکهاتوون لە (٢٢٥) ماڵ[4]. لە لقەکانی: توتك، عەنتەر، ئاینە، مامەجان، کەڵهوڕی[5]. ناوچەی جوگرافی ئەم عەشیرەتە بەم شێوە بووە: لقەکانی عەنتەر نەبێ لە نێوان شارەبانو ئەبو جیسرەدا دەژێن، ئەوانی دیکە تێکرا لە گوندەکانی دەوروبەری (خانەقین)دان[6].

---

[1] محمد مردوخ کردستانی: سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٢.

[2] مێجەر ئی. بی. سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، ل٤٧.

[3] هەمان سەرچاوە، ل٤٥-٤٦.

[4] هەمان سەرچاوە، ل٨٣.

[5] محمد مردوخ کردستانی: سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٨.

[6] مێجەر ئی. بی. سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، ل٨٣.

### ٣٤- شێخ بزێنی

عەشـیرەتێکی نیمـچە نیـشتەجیٚو کـشتوکاڵکارو شـوانکارەن، ژمارەیـان بـەپێی خەملاٚنـدنی مـارك سـایکس (٤٠٠٠) خێـزانن[١]، سەرچـاوەی تـر لـە مـاوەی جـەنگی یەکـەمی جیهانیـدا بـە (٦٠٠) مـاڵ داینـاون[٢].لـە رۆژگـاری عوسمانیدا شێخ بزێنی لە نێوان قەزای کۆیسنجەق و چەمچەماڵ و سـەنتەری قەزای کەرکوکدا دابەش بووبوو [٣].

پێدەچیٚ شێخ بزێنی لە بنەڕەتدا خەڵکی کوردستانی باکوور بن[٤]. (مـارك سایکس) ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کـە (٤٥٠) ماڵیـان، دوو تـا سـیٚ گونـدیان لـە نزیك ئەرزەرووم‌دا هەیەو لـەویٚ نیشتەجێن، هـەروەها (١٢٠) خێزانـی تریـان لەنزیك (بویاباد) لە ئەنادۆڵ کۆچەرین [٥].

### ٣٥- کۆمەڵەی عەشیرەتەکانی هەورامان

هەورامییـەکان عەشـیرەتێکی نیـشتەجێن، لـە بنەڕەتـدا لـە (دوو) پـۆل پێکدێن، هـەورامانی تـەخت لقەکانی بریتییـە لـە (حەسـەن سـانی[٦]، بەهرام بەگی، موستەفا سانی)[٧]،و هەورامانی لەهۆن کە"باباجانی"یـشی پێدەڵێن،

---

[١] بڕوانە: القبائل الکردیة....، ص٣٧.

[٢] مێجەر ئی. بی. سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، ل٧٩.

[٣]سي. جي، ادموندز: المصدر السابق، ص ص٤١-٤٢.

[٤]بڕوانە: زرار صدیق توفیق: المصدر السابق، ص٤٠.

[٥] بڕوانە: القبائل الکردیة.....، ص ص٣٧-٩٠-١٠٢.

[٦](سان) کورتکراوەی وشەی (سوڵتانە)، کە نازناوێکە لەسیستمی دەرەبەگایەتی سەفەویدا دەبەخشرایە ئەو سەرۆکانەی کە لە ئاستێکی دیاریکراودا بوو. بڕوانە: سي. جي. ادموندز، المصدر السابق، ص١٤٠.

[٧] سي. جي. ادموندز: المصدر السابق، ص١٤٠.

له لقەکانی (کاکۆی، قوبادی، تاوەگۆزی، یەباخلی)یە، بەشی زۆری ئەم دوو لقە سەرەکییە دەکەوێتە نێو خاکی ئێران[1]و ئەوانی دیکەیان دەکەونە چوارچێوەی سنووری عوسمانی و هەردوو لق لەژێر فەرمانی فەرمانڕەوایی جیاوازدا دەژێن[2]، بەڵام لە کاتی تەنگانەدا یەکدەگرن و دەبنە دەستێك[3].

ژمارەی هەورامییەکان لە هەردوو دیوی ئێران و عوسمانیدا، تێکرا بەپێی هەڵسەنگاندنی محەحەد ئەمین زەکی لە بیستەکانی سەدەی بیستەمدا بە (٢٠) هەزار کەس خەملێندراون[4].

٣٦- غەوارە

عەشیرەتێکی تەواو شوانکارو نیمچە ڕەوەندن، ساڵنامەی ویلایەتی موسڵ بۆ ساڵی(١٣٣٠ك) کە بە (ئایل غوارە) ئاماژەی بۆ کردوون، بەم شێوەی خوارەوە ئاماژەی بۆ لقەکانی و ژمارەی ماڵ و سنووری جوگرافیان کردووە:

ئیسماعیل عوزێری: (٣٠٠)ماڵ، لە هاوینان لە قەزای بازیان و پاشتریش دەڕۆن بۆ لەوەڕگە هاوینەییەکان. کاوانی: (١٠٠) ماڵ، بە گشتی لە پێدەشتەکانی نزیك سلێمانی نیشتەجێن.

کافرۆشی: (٥٠یا٦٠) ماڵێك دەبن، لە زستانان لە کەناری رووباری تانجەرۆی نزیك سلێمانی دەژێن. شینکی: (٤٥) ماڵێك دەبن و لە قەزای

---

[1] محەمەد ئەمین زەکی: تاریخی سلێمانی وەڵاتی، ل ١٤٥.

[2] مێجەر سۆن: سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان، ل ٩١.

[3] علي اكبر كردستاني، المصدر السابق، ص٥٦.

[4]محەمەد ئەمین زەکی: خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان، ل٢٤٢. عەلی ئەکبەر کوردستانی ساڵی (١٨٩١) تەنها هەورامانی (لەهۆن)ی بە (٤٠٠٠) کەس خەملاندووە. بڕوانە: علي اكبر كردستاني: المصدر السابق، ص٥٧.

بازیانـدا دەژێـن. کرمـزە: (٥٠) مـاڵێکن‌و هەمیـشە لـە نێـوان سـورداش‌و دەوروبـەری سـلێمانیدا ژیـان دەگـوزەرێنن. مەندمیـدەر: (١٠٠)مـاڵێکن، هەمیـشە لـە نێـوان ناحیـەی سـورداش‌و دەوروبـەری سـلێمانیدا ژیـان دەگـوزەرێنن. سـۆفیان: (٣٠-٤٠) مـاڵێکن‌و لـە زسـتانان لـە کـەنارەکانی تانجەڕۆ دەژێن‌و پاشتر دەڕۆن بۆ لەوەڕگە هاوینەییەکان. هەرچی لقەکانی (جنکی‌و ئاغا سوری)یە لە زستانان لە کەناری رووباری تانجەڕۆ دەژێن‌و لە بەهارو هاوینیشدا لەگەڵ جافدا کۆچدەکەن[1].

لـە عەشـیرەتەکانی تـری باشـووری کوردسـتان: پـالآنی، رۆژبـەیانی، جـەباری، سـاڵەیی (صـالحی)، لـەیلانی، خـەیلانی، گـل، زراری، هـەرووتی، باڵـەك، تلیـشانی، بیبـانی، گـاخوار (گـاخۆری)، گێـژ، ئۆمـەرمل (ئۆمـەر بـل)، فەیلی، خورە، شیوەکەڵ (سیوەیل)، ئۆرەمار، شێخ بزێنی (گۆران).

---

[1] سالنامت ولایت موصل: ١٣٣٠ه، ص ص ٢٢٨-٢٢٩.

# سێیەم:

## باسی یەکەم/

سیاسەتی عوسمانییەکان بەرامبەر بە عەشیرەتەکان
١٨٦٩-١٨٨٠

## باسی دووەم/

- پان ئیسلامیزمو کاریگەری لەسەر سیاسەتی عوسمانی بەرامبەر عەشیرەتەکان
-عوسمانییەکانو بنەماڵەی شێخانی ئایینی
-سوارە نانیزامییەکانی حەمیدیو عەشیرەتەکان
- سیاسەتی عوسمانی بەرامبەر کۆمەڵە عەشیرەتەکانی یەزیدی

## باسی سێیەم/

هەڵوێستی عوسمانی لە ناکۆکی نێوان عەشیرەتەکان

## باسی یەکەم/

## سیاسەتی عوسمانیەکان بەرامبەر بە عشیرەتەکان

## ١٨٦٩-١٨٨٠

دوای داڕووخـــانی میرایەتییـــەکانی کـــوردو گێڕانـــەوەی فـــەرمانڕەوایی ناوەندی بۆ ناوچەکە، پرسی عەشیرەتەکان گەورەترین ئەو پرسانەبوو کە ڕووبەرووی کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمـانی بۆوە. وەك پێشتر ئاماژەمـان بـۆ کـرد فـەرمانڕەوایی ناوەنـدی وێـڕای ئـەوەی کۆمەڵگـەی کـوردی زێـتر لەبەریەك هەڵوەشاندەوە، نائارامییە عەشیرەتییەکانی هێنایە گۆڕێ، کە بۆ خۆی نیشانەی ڕەتکردنەوەی دەسەلأتی ناوەندیو ئەو بۆشاییە سیاسییە بـوو، کـە لـە هـەناوی کۆمەڵگـەی نێـوبراودا دروسـتبوو. لـەم چوارچێوەدا پەلامارو یاخیبوونی عەشیرەتی هەمەوەند دژ بە عوسمانییـەکان لـە مـاوەی شەسـتەکانی سـەدەی نۆزدەهەمـدا، لەشکرکێـشی هەورامییـەکان بـۆ سـەر سنووری فارس لـە سـاڵی (١٨٦٥)دا، (بەشـداری عەشـیرەتەکانی بادینـان لـە شۆڕشەکەی (یەزدان شێر)دا لە ناوەڕاستەکانی سـەدەی نۆزدەهەمـدا، ڕەنگـە باشترین نموونەی ئەو ڕەتکردنەوەیە بێت. لە بەرامبـەر ئـەم پرسـە حکومـەت ئەگەرچی بـە گوتـەی "سـتیڤن هیمسلی لۆنگریـك" چەندین نەخشەو پلانـی دانـابوو، بـەلأم عەقڵیـەتی تـورکی هەمیـشە تاکـەکانی عەشـیرەتەکانی وەك کۆمـــەڵێك کێـــویو دڕنـــدە دەبینـــی، کـــە پیـــشەیان تـــەنها دژایـــەتیکردنو خەریککردنی حکومەت بوو"[(١)].

---

[(١)] بـۆ زانیـاری زیـاتر لـەمبارەوە بڕوانـە: اربعـة قـرون مـن تـاريخ العـراق الحـديث، ص ص٣٤٦-٣٥٧.

لە ساڵی (١٨٦٩)دا (مەدحەت پاشا)[1] کرایە والی بەغداد، لە (٣٠) نیسانی هەمان ساڵدا لە (سەرای) دوای خوێندنەوەی فرمانی دەستبەکاربوونی ڕاستەوخۆ ئاهەنگ سازدرا، والی وتاری خۆی[2] پێشکەش بە ئامادەبووان کردو تیایدا هێڵی گشتی سیاسەتو بەرنامەی ئاشکرای خۆی خستەڕوو، یەکێك لەو خاڵانەی ناڕاستەوخۆ ئاماژەی بۆ کرد، یاخیبوونو هەڵگەڕانەوە عەشیرەتییەکان بوو، ئەوەی لە یادەوەری بەرپرسانی عوسمانیدا لە عێراقدا ڕۆحی عەشیرەتیی زاڵەو هەمیشە عەشیرەتەکان بۆ دژایەتیکردنی حکومەت لە هەل دەگەڕێن[3]. دواتر ئەم وێنایە (مەدحەت پاشا)ی خستەسەر ئەو بڕوایەی (بە تایبەت لە سەرەتای فەرمانڕەواکردنییەوە) لە میانی چاو ترساندنو هێزەوە نەبێت، عەشیرەتەکان ئارام نابنەوە[4].

---

[1] مەدحەت پاشا(١٨٢٢-١٨٨٥): دەرکەوتووترین سیاسی و ڕیفۆرمیست بوو لە دەوڵەتی عوسمانیدا، مێژوونووسان ناویان ناوە (باوکی ڕیفۆرم)، بەدەست والأبوونێکی تایبەتەوە کرایە والی بەغداد، لەوانە پێدانی بەرپرسیارێتی فەرماندەیی سوپای شەشەمی عوسمانی کە سنووری چالاکییەکانی وێرای ویلایەتی بەغداد، هەردوو ویلایەتی موسڵ و بەسرەی دەگرتەوە، هەر بۆیە ناوی (والی عێراق)یان لێنرا، دوو جار پۆستی (صدر الاعظم)ی دراوەتێ، ساڵی ١٨٨٣ دوورخرایەوە بۆ شاری تایف تا مردن لەوێ ماوەتەوە. سیار کوکب الجمیل، تکوین العرب الحدیث ١٥١٦-١٩١٦، الموصل، ١٩٩١، ص٣٦٥.

[2] بۆ دەقی تەواوی وتارەکەی مەدحەت پاشا بڕوانە: عباس العزاوي: تاريخ العراق بين احتلالين، ج٧، ص ص١٨٦-١٩٠.

[3] علي الوردي: لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث، ج٢، مطبعة الارشاد، بغداد ١٩٧١، ص ص٢٣٧-٢٣٨.

[4] سليمان فائق: تاريخ المنتفق، ت. محمد خلوصي الناصري، بغداد ١٩٦١، ص ص٦٣-٦٥.

(مەدحەت پاشا) بۆخۆی هەر زوو پێش دەستبەکاربوونی لە ویلایەتی نویَ لە کاتی تێپەڕبوون بە شاری (موسڵ)دا، ڕووداوی کوشتنی دوو (گۆشتفرۆش)ی موسڵمانی لە نێو ئێزیدیەکانی (شەنگال)دا کردە بەهانە بۆ جێبەجێکردنی بەرنامەکانی بەرامبەر بەعەشیرەتەکان، وەختایەك بە ناوی داواکردنی بکوژەکانەوە هێزی لە (موسڵ و ماردین و شارەزوور) کۆکردەوە و بە چەند تۆپێکەوە بە سەرکردایەتی (ئەحمەد بەگ) و موتەسەریفی لیوای موسڵ (ضیاء پاشا) ڕەوانەی (شەنگال)ی کردن، هەر زوو ئەم سوپایە ئێزیدیەکانی ملکەچ بە داواکارییەکانی حکومەت کرد، لەوانە: بە دەستەوەدانی بکوژەکان و ناچارکردنی ژمارەیەك لە ئێزیدییەکان بۆ چوونە نێو ڕیزی سوپای نیزامیی، دانەوەی سامانی دەوڵەت، ئەوەی کە لە ئەستۆیاندا بوو، بۆ ئەوەی حکومەتیش بتوانێت باشتر ئەو ناوچە ئاڵۆزە کۆنترۆڵ بکات، مەدحەت پاشا هێزێکی سەربازی هەمیشەیی لە (تەلەعفەر)دا جێگیرکرد[1].

لە ساڵی (١٨٧٢)یشدا مەدحەت پاشا گەیشتە ئەو بڕوایەی کە کاتی ئەوە هاتووە سنوورێك بۆ ئەو دۆخە ناسروشتییە دابنرێت، کە تیایدا ئێزیدییەکانی سنجار لە ڕاژەی سەربازی دەبەخشرێت، بۆ ئەو مەبەستە کۆلۆنێل (محەمەد تاهیر بەگ)ی سەرۆکی دەستەی ئەرکانی سوپای بەغداد بە شێوەیەکی کاتی بەرزکرایەوە بۆ پلەی فیلد مارشاڵ و بۆ سەرژمێریکردنی سەرجەمی ئەو نێرانەی ڕاژەی سەربازی دەیانگرێتەوە لە ناوچەکە، ڕەوانەی موسڵ کران[2]. لە ئاست کێشەی داواکردنەوەی ئێزیدییەکان بۆ ڕاژەی

---

[1] عباس العزاوي: تاريخ العراق بين احتلالين، ج٧، ص ص ٢٠١-٢٠٢.

[2] جون س. گیست: تاريخ اليزيديين، ت. عماد جميل مزوري، الدار العربية للموسوعات، ط١، بيروت ٢٠٠٦، ص٢٧٥.

سەربازیی کۆمەڵێك لە پیاوماقوڵانی ئێزیدی سکاڵانامەیەکیان ئاراستەی بەرپرسانی دەوڵەتی عوسمانی کرد لە ئەستەنبوڵو بە (١٤) خاڵ پرەنسیپەکانی ئایینی خۆیان ڕوونکردەوە، جەختیان لەوە کردۆتەوە کە سیستمی ئاینییان بەربەستە لە ئەنجامدانی ڕاژەی سەربازی[١].

ئەم سکاڵانامەیە کە بەگشتی بە (تکاخوازییەکەی ساڵی ١٨٧٢) ناسراوە، بە زمانەکانی عەرەبی و تورکی و فەرەنسی نوسراوەتەوەو تێیدا بۆ یەکەم جار ئەو ڕێساو ڕەفتارانەی لە ئاینی ئێزیدی دا پێویستن، ئاشکراکرانو (میر حوسێنو شێخ ناسر)و پانزەی تر لە شێخو سەرۆکەکانی ئێزیدی مۆری خۆیان لەسەر داناو لە ئاداری ساڵی (١٨٧٣)دا ناردیان بۆ (ڕەئوف پاشا) کە لە دوای مەدحەت پاشا کرایە والی بەغداد. دەسەڵاتدارە موسڵمانەکانی موسڵ ناوەرۆکی سکاڵانامەکەیان ڕەتکردەوە، بەڵام لە کۆتایدا مەبەستی خۆی بەدیهێنا، چونکە عوسمانییەکان لە دەورووبەری ساڵی (١٨٧٥) ڕەزامەندی خۆیان لەسەر داواکارییەکە پیشاندا، دووپاتیان کردەوە کە ئێزیدیەکان ڕاژەی سەربازی نایانگرێتەوە[٢]، بەڵام پێویست بوو

---

[١] میهرداد ئیزەدی: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٥٩. بۆ خوێندنەوەی دەقی تەواوی ئەم سکاڵانامەیە بڕوانە: ئەنستانس ماری کەرمەلی: سەرچاوەی پێشوو، ل ل١٦٩-١٧٤; عبدالرزاق الحسني: اليزيديون في حاضرهم و ماضيهم، ص ص١٠١-١٠٤.

[٢] جون س. گيست: المصدر السابق، ص٢٧٦.

(ئۆبنهایم) هێما بۆ ئەوە دەکات کە ئێزیدییەکان ساڵی ١٢٨٩ك=١٨٧٢ یاداشتەکەیان پێشکەش بە (محەمەد تاهیر بەگ) کردووە کە حکومەتی عوسمانی ڕەوانەی موسڵی کردبوو. بڕوانە: ماكس فرايهر فون اوبنهايم: من البحر المتوسط الى العراق و الخليج عبر حوران والبادية السورية وبلاد الرافدين، ت.محمود كبيبو، لندن، شركة دار الوراق للنشر، ٢٠٠٩، ج٢، ص١٨٤.

له بری ئەوە هاوشێوەی گەله ناموسڵمانەکانی تری ناو دەوڵەتی عوسمانی پارەیەکی دیایکراو بدەن.

چەند مانگێك پاش دەستبەکاربوونی یەکەم کێشه کە بەرەوڕووی مەدحەت پاشا بۆوە، کێشەی پەلاماری عەشیرەتی هەمەوەند بوو بۆ سلێمانیو دەوروبەرییو بە تایبەتیش ڕێگەی کەرکوك–سلێمانی بە دنەو هاندانی حاکمی زەهاو (مەلیك نیازخان)، بە جۆرێك ڕێگەی ڕۆژهەڵاتی کەرکوك بە تەواوی لەژێر حوکمی هەمەوەندەکاندا بوو نەوەك عوسمانی، لە مانگی ئابی ساڵی (١٨٦٩)دا هەمەوەندەکان چەندین گوندیان لە دەوروبەری کەرکوك وێرانکردو چەندین جار سوپای عوسمانییان تێکشکاند[١]، مەدحەت پاشا هێزێکی تایبەتی کە (٥٠٠) چەرکەس دەبوون، بردە سەریان، ئەم هێزە لە نزیك دوانزە ئیمام (نزیك کفری) لە لایەن هەمەوەندەکانەوە تێکشکا. هەوڵدانێکی دیکەی تورکەکان لە خانەقین ڕووبەڕووی هەمان چارەنووس بۆوە[٢].

پێویستە بوترێ هەمەوەندەکان پێش هاتنی (مەدحەت پاشا) بەچەند ساڵێك، دوای ناکۆکیو شەڕێکی درێژخایەن لەگەڵ نامق پاشای والی بەغدادا بۆ (زەهاو)ی ژێر دەسەڵاتی ئێران کشانەوە. بۆیە لە سەروبەندی دەستبەکاربوونی (مەدحەت)دا لە گەرمەی چالاکیو پەلامارەکانیاندا بوون بۆ سەر ناوچە سنوورییەکان، هەر لەو ماوەیەدا (٢٠٠) سوارەیان لە تۆڵەی کوشتنی (بەچە ئەمین)ی سەرۆکی لقێکی (هەمەوەند)دا، لە دەوروبەری قزڵڕەبات (سەعدیە) پەلاماری عەشیرەتی (ڕەبیعە)یان داو (١١) کەسیان لێکوشتن، شایەنی هێمابۆکردنە عەشیرەتی نێوبراو بۆ پەلاماردانی

[١] نەجاتی عەبدوللا: ئیمپراتۆریا، سنوور و خێڵ، ل١١٥.
[٢] مێجەر ئی.بی سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی...، ل٥٤.

هەمەوەندەکان پێشتر هاوکاری حکومەتیان کردبوو. (مەدحەت پاشا) بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەمەوەند سەرجەم ڕێگەکانیان تاقیکردەوە، لەوانە درووستکردنی پێگەو قەلاَ لەسەر سنوورو ڕێرەوە سەرەکییەکانو دانانی هێز تێیدا بۆ ڕێگەگرتن لە هێرشەکانیانو بەکارهێنانی عەشیرەتەکانی عەرەب بۆ لێدانیان[1]، وەك چۆن عەشیرەتەکانی کوردی بۆ لێدانی عەشیرەتەکانی عەرەب بەکاردەهێنا[2].

وەك دیارە پرسی هەمەوەندەکان کاربەدەستانی عوسمانی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردبوو، ئاڵوگۆڕکردنی نامەو نامەکاری لەگەڵ ئێراندا لە بارەیانەوە کاربەدەستەکانی ناوچەکەی هەراسانو دۆسیەکەشیان پڕ لە نوسراو کردبوو[3]. ئەمە وایکرد (مەدحەت پاشا) هەلی سەفەرەکەی ناسرەددین شا (١٨٤٨-١٨٩٦)ی قاجاری[4]بۆ شوێنە پیرۆزەکان لە عێراق لە سەرەتای ساڵی (١٨٧٠)دا بقۆزێتەوە تا سەرنجی (شا) بۆ پرسی هەمەوەندەکان ڕابکێشێتو تکای لێبکات وەکو تاوانبار ڕادەستی دەسەلآتدارانی عوسمانییان بکاتەوە، سەرەتا (شا) ڕازی بوو، فەرمانی توندی بۆ (مەلیك نیازخان) نارد تا دەستبەجێ نزیکەی (٢٨٠) پیاویان لێبگرن، بەلاَم دواتر

---

[1] عباس العزاوي: تاريخ العراق بين احتلالين، ج٧، ص ص٢١١-٢٣٠.

[2] عبدالعزيز سليَمان نوار: تاريخ العراق الحديث، ص٣٦٨.

[3] نەجاتی عەبدوللاَ: ئیمپراتۆریا، سنوور و خێڵ، ل١١٦

[4] ناسرەددین شای ئێران لە (٢٣ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٨٧٠) بە خۆی دارودەستەیەکی زۆرو زەوەندەوە (١٠هەزار کەس) سەردانی عێراقی کرد و بۆ سەردانی شوێنە پیرۆزەکان سێ مانگ مایەوە، ساڵەکەی نەهاتی و گرانی بوو، مەدحەت پاشای والی بەغداد بەدەست خواردن پێدانیانەوە تووش بووبوو بۆ ئەو مەبەستە (٣٠) هەزار لیرەی سەرف کرد، بێگومان ئەوە پارەیەکی زۆر بووە بۆ ئەو ڕۆژگارە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: عباس العزاوي: تاريخ العراق بين احتلالين، ج٧، ص ص ٢٧١-٢٧٢.

دەستەی وەزیرانی شاو کارمەندە فەرمییەکانی ئێران، بە تایبەت (موشیر ئەلدەولە)و باڵوێزی ئێران لە دەوڵەتی عوسمانی قایل نەبوون ئەو کارە بکرێت، گوایە ئەوە کارێکە لە شانوشکۆی دەوڵەتی ئێران کەمدەکاتەوە[1].

لەڕاستیدا کێشەکانی سنووری نێوان دەوڵەتی عوسمانی_ ئێران هێشتا یەکالاً نەکرابۆوە، ناوچەی (قوتوور) کە ئێران بە موڵکی خۆی دەزانی هێشتا سوپای عوسمانی لێبوو، ناوچەی شارەزوور کە پێشتر ناڕاستەوخۆ لە لایەن ئێرانەوە بەڕێوەدەچوو، دەستی ئێرانی تێدا نەمابوو، بەم شێوەیە ئێران نەیدەویست کاغەزێکی گرنگی فشاری وەکو (هەمەوەند) لە دەستبدات. پاشتر لە خانەقین لیژنەیەکی عوسمانی– ئێرانی هاوبەش بۆ ئەم مەبەستە پێکهات، کە پێکهاتبوون لە: لایەنی عوسمانی مەدحەت پاشاو کامل پاشا، لایەنی ئێرانیش (موشیر ئەلدەولە)، لە کۆتایدا لەسەر ئەوە ڕێککەوتن عەشیرەتی هەمەوەندو (٢٠) کەس لە بندەستەکانی بەدەستەوە بدەن، لەگەڵ گەرەنتی ژیانیان بە دوورخستنەوەیان بۆ سنووری روسیا، بەڵام دواجار ئێرانییەکان چاویان لە جێبەجێکردنی ئەم ڕێککەوتنە نوقاند[2]. لەڕاستیدا وەڵامی ئەم چاو نوقاندنە لە چوارچێوەی ئەو سیاسەتەدا دەبینینەوە، کە هەردوو دەوڵەتی عوسمانیو ئێرانی دەمێ ساڵ بوو عەشیرەتەکانی کوردیان وەك کاغەزێکی فشار بۆ یەکالاکردنەوەی کێشەکانیان لەگەڵ یەکتر بەکاردەهێنا، هەر لەو ماوەیەدا جگە لە هەمەوەند وڵاتی ئێران پشتگیری عەشیرەتی (سنجاوی)یان دژ بە عوسمانییەکان دەکرد، عوسمانییەکانیش

---

[1] نەجاتی عەبدوللا: ئیمپراتۆریا، سنوور و خێڵ، ل ل١١٦–١١٧.

[2] هەمان سەرچاوە: ل ل١١٧–١١٨.

**پاڵپشتی عەشیرەتەکانی هەورامانیان دژ بە ئێران دەکرد[1]. بەهەرحاڵ تا کۆتایی ویلایەتەکەی مەدحەت پاشا لە ناوەڕاستەکانی ساڵی (١٨٧٢) گرژیو ئاڵۆزی نێوان هەمەوەندو حکومەت درێژەی هەبوو.**

**لە چوارچێوەی سیاسەتەکانی (مەدحەت پاشا) بەرامبەر تێکڕای عەشیرەتەکانی عێراق، ڕەنگە (سیستمی تاپۆ)[2] سەرنجڕاکێشترینیان بێت، هەرچەندە لە ڕواڵەتدا ئەم سیاسەتە هەوڵدانێکی نوێی دەوڵەت بوو، بۆ چارەسەرکردنی پرسو کێشەی عەشیرەتەکانو دانانی سنوورێك بۆ هەڵگەڕانەوەکانیانو نیشتەجێکردنیان بە مەبەستی ئاسانکردنی پرۆسەی باج وەرگرتنو ئەنجامدانی پرۆسەی سەربازگیری، بەڵام لە ناوەڕۆکدا بەشێك بوو لەو سیاسەتە گشتییەی دەسەڵاتی عوسمانی کە ئامانجی کۆتاییپێهێنانی عەشیرەتو کۆنفیدراسیۆنە عەشیرەتییەکان بوو[3]. بەو**

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل ١١٤ ; عباس العزاوي: تاريخ العراق بين احتلالين، ج٧، ص ص٢١٢-٢١٥.

بۆ زانیاری زیاتر لە سەر ناکۆکی ئێران و عەشیرەتەکانی هەورامان و پەنابردنیان بۆ عوسمانییەکان بڕوانە: علی اكبر كردستاني ، المصدر السابق، ص ص١٥٥-١٦٤.

[2] دەوڵەتی عوسمانی سەبارەت بە شێوەی بەڕێوەبردنی زەوی و زارەکان چەندین یاساو ڕێنمایی دەرکرد لەوانە یاسای زەوی و زاری ساڵی ١٨٥٨، هەروەها سیستمی بەخشینی زەوی زار بە تاپۆ لە ساڵی ١٨٦٤، هەر ئەو ساڵەش لەم ڕووەوە کۆمەڵێك ڕینمایی دەرکردووە، بەڵام تا ڕۆژگاری ویلایەتی (مەدحەت پاشا) نەتوانرا لە عێراقدا جێبەجێبکرێت. لە کۆتاییدا نێوبراو توانی زەوی زارەکان بخاتە بندەستی حکومەت و بۆ ئەو مەبەستەش لە سەرەتای ساڵی (١٨٧١) فەرمانی دەرکرد. بۆ زانیاری زیاتر لەمبارەوە بڕوانە: عماد احمد الجواهري: تاريخ مشكلة الاراضي في العراق ١٩١٤-١٩٣٢م، بغداد ١٩٧٨، ص ص٣٢-٣٨.

[3] ستيڤن هيمسلي لونكريك: المصدر السابق، ص ص٣٦٧-٣٧٤ .

ئومێـدەی ڕۆڵـەی عەشـیرەتەکان بکاتـە خـاوەن زەوی‌و زارێـك، کـە یاسـا سـنوورەکەی دەستنیـشاندەکات‌و لـەو میانـەوە بیانکاتـە خـەڵکانێکی کـشتوکاڵکارو نـاکۆکی نێوانیـان لەسـەر زەوی‌و زار کۆتـایی پێبێنێـت‌و دەوڵـەت جێگـەی ئاغـاو گـەورەی عەشـیرەتەکان بگرێتـەوە، بـەو چەشـنە ڕۆڵەکانی عەشیرەت ڕاستەوخۆ بەرامبەر دەوڵەت بەرپرس دەبن نەك ئاغاو گەورەی عەشیرەت، لە کۆتایشدا داهاتی گشتی دەوڵەت‌و پانتای زەوییە کشتوکاڵییەکان بەرزدەبێتەوە، هەر لەو چوارچێوەدا مەدحەت پاشا نازناوی فەرمی وەك پاشاو بەگی بەخشییە گەورەی عەشیرەتەکان، وەك کارمەندی میری تەماشای دەکردن [1].

هەرچەندە مەدحەت پاشا لە جێبەجێکردنی سیاسەتی تاپۆدا لە یەککاتدا ئاسـانکاری‌و ناچارکردنیـشی لەگـەڵ عەشـیرەتە (بەتایبـەت عەرەبیـەکان) بـەکاردەهێنا[2]. بـەڵام دوو بەربەسـتی گـەورە کـۆی پرۆسـەی تاپۆیـان بـە ناتەواوی هێشتەوە، یەکەم: نەزانی‌و بەرتیلخواردنی مووچەخۆرانی تاپۆ، دووەم: بایەخنەدانی خەڵك‌و کەڵك وەرنەگرتن لە دۆخی نوێ. لەڕاستیدا خەڵکانێکی زۆر بەچاوی گومانەوە لە نیازو مەبەستی حکومەتیان دەڕوانی، ترس لە سەربازگیری‌و بەرەنجامەکانی نیشتەجێکردن بووە مایەی ئەوەی زۆرێـك لـە سـەرۆك عەشـیرەتەکان دوورە پـەرێز لێـی بوەسـتن[3]. دەرەنجـام خەڵکانێکی کەم هەلەکەیان قۆستەوە، کارکردن بە سیستمی تاپۆ بۆ وێنە

---

[1] غسان العطية: العراق نشاة الدولة، دار السلام، لندن، ١٩٨٨، ص٤٥. هشام سوادي هاشم، تاريخ العرب الحديث (١٥١٦-١٩١٨) من الفتح العثماني الى نهاية الحرب العالمية الاولى، ط٢، دار الفكر، عمان، ٢٠١٠، ص٩٤.

[2] عماد احمد الجواهري: المصدر السابق، ص٣٥.

[3] ستيڤن هيمسلي لونكريك: المصدر السابق، ص٣٦٩ .

لەناوچەکانی باشووری کوردستاندا خانەدانەکانی شارو ئاغاکانو هەندێ لە شێخانی عەشیرەتەکان بوونە خاوەن زۆرینەی زەویو زارەکان، لەڕاستیدا سوودمەندی ڕاستەقینە ئەمان بوون، کە بەکەڵك وەرگرتن لە جێبەجێکردنی یاسای زەویو زار توانیان بەسەر ئەو جوتیارانەی کشتوکاڵیان لە زەوییەکاندا دەکرد بازبدەنو قەواڵەی زەویو زارێکی پانو بەرین وەرگرن[1]. بەو چەشنە هەندێ لە گوندەکانی زاخۆو ئاکرێو زێبار کەوتە دەستی موڵکدارەکان، پاشتر ڕاپۆرتی بریتانییەکان نێوەکانی ئاشکراکردنو سەرجەمیان ئاغاو کوێخاو شێخانو دەسەڵاتدارەکانی تری ناوچەکەبوون.[2] هەر لە چوارچێوەی ئەو سیستمە نوێیەدا بوو شێخانی بەرزنجە توانیان لە ناوچەی سلێمانی زەویو زارێکی زۆر بەنێوی خۆیانەوە تۆمار بکەن[3]. هەروەها بە سوود وەرگرتن لە یاسای تاپۆ، مەحموود پاشای جاف توانی چەندین پارچە زەوی بکڕێت، لەوانە تەواوی (قزلڕەبات) کە پاش ئەوەی حکومەت خستییە مەزادەوە، بە (دە هەزارو پێنچ سەد) لیرەی ئاڵتوونی کڕی[4]، هەروەها چەندین ناوچەی بەرفراوانی لە پێدەشتی شێروانەو ناوچەی پێباز (پێوان)ی بەرین بە نرخێکی گونجاو لە دەوڵەت کڕی[5].

---

[1] غسان العطية: المصدر السابق، ص٤٦ ; مارتین ڤان برونەسن، سەرچاوەی پێشوو،ب٢، ل٧ ; ابراهيم خليل العلاف، تاريخ الموصل الحديث دراسات و مقالات، الموصل، ٢٠٠٧، ص١٣

[2] ابراهيم خليل العلاف: المصدر السابق، ص١٥.

[3] عثمان علي: المصدر السابق، ص١٨٧.

[4] حەسەن فەهمی بەگی جاف: مێژووی هۆزی جاف و مەحمود پاشای جاف، ئومید ئاشنا. ب. ش، ب.س، ل٤٠.

[5] مكرم الطالباني: ابراهيم خان ثائر من كردستان، مطبعة اسعد، بغداد، ١٩٧١، ص٣٣.

لــە ســالآنی ١٨٨٠و ١٨٩٢، بــە دوو فــەرمانی ســولْتانی کــارکردن بــە سیــستمی تــاپۆ لــە ناوچــەکانی باشــوورو ناوەڕاســتی عــیراق ڕاگــیرا، بــە پێچەوانەوە بەخشینی زەوی بەم سیستمە لە ناوچەکانی باکوور (باشووری کوردستان) بەردەوام بوو، ئەمەش وایکرد بەراورد بەشوێنەکانی تـر ڕێـژەی زۆری زەوی دابەشــکراو بــە تــاپۆ لــە باشــووری کوردســتان زۆرتربێــت[1]. شایەنی هێما بۆکردنـە خـودی سـولْتان عەبدولحەمید خـۆی یـەکێك بـوو لـە گەورەترین سوودمەنەکان لە سیستمی تاپۆ، وێڕای ناوچەگەلێکی فراوان لـە باشـترین زەوی‌و زارەکـانی ناوەڕاسـت‌و خـوارووی عێـراق، زەوی‌و زارێکـی پان‌و بەرینی لە نێوان (زێی بچووك‌و زێی گـەورە)و ناوچـەی (بەکرەجۆ) لـە سـلێمانی [2]و خـاکێکی زۆر لـە مـەخموورو کەنـدیناوا لـە هـەولێر[3]و گونـد گەلێکی زۆر لە قەزای ئاکرێ بە ناوی سولْتانەوە تۆمارکرابوون[4].

---

[1] غسان العطية: المصدر السابق، ص٤٧.

[2] عماد احمد الجواهري: المصدر السابق، ص٤٣.

[3] بە گویرەی راپۆرتی نوسینگەی حاکمی بریتانی لە عێراق ئیبراهیم ئاغای سەرۆکی عەشیرەتی دزەیی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا بە توندی دژی تۆمارکردنی زەوی زارەکانی مەخمور و کەندیناوە بە نێوی سولْتان عەبدولحەمیدی دووەم وەستایەوە و سەرجەم ئەوانەی بۆ سەرپەرشتیکردنی موڵکە سونییەکان (موڵکەکانی سولْتان) نێردرابوون لە ناوچەکە دەرکرد، حکومەتی عوسمانیش دەستبەجێ هەڵمەتێکی سەربازی نارده سەر ئیبراهیم ئاغا، دوای چەند شەڕێکی پچڕ پچڕ ئیبراهیم ئاغا بە ناچاری لە گەڵ سەرجەم ئاغاکانی دزەیی دا پەنایان بۆ عەشیرەتە عەرەبییەکانی ناوچەکە برد، لە کۆتایشدا دزەییەکان داوایان لە سولْتان کرد بیانبەخشێت و ئەویش داواکەی هەموارکردن و ڕێگەی پێدان بگەڕێنەوە سەر زەوی و زارارە تۆمارکراوەکان بە ناوی موڵکە سونییەکانەوە. بۆ زیاتر بڕوانە: تقرير دائرة الحاكم المدني البريطاني في العراق، ص ص٥٠ –٥٢.

[4] بۆ زانینی زیاتر لەوبارەوە بڕوانە: عبدالفتاح علي البوتاني: المصدر السابق، ص ص ١٢١–١٢٥.

پێچەوانەی دەقی یاسای زەوی‌و زاری عوسمانی ساڵی ١٨٥٨، کە نابێت گوندەکان بە ناوی تاکە کەسەوە تۆماربکرێت، حکومەتی عوسمانی چاوپۆشی دەکردو بە شێوەی تایبەت زەوی‌و گوندەکانی کوردیان بە ناوی ئاغاو کوێخاکانی موسڵ‌و کەرکوک‌و سلێمانی تۆماردەکرد، بەلای هەندێ توێژەر ئەم چاوپۆشیکردنە پەیوەندی بە ئارەزووی حکومەتەوە هەبوو لە جێگیرکردنی ئارامی‌و ئاسایش لەو ناوچانە[1]. بە دیوێکی تریشدا بەخشینی زەوی بە ئاغاو خانەدانەکانی شار پەیوەندی بە ناڕوونی قەواڵەکانەوە هەبوو کە بڕە زەوی بەخشراوی دەستنیشان نەکردبوو، لە هەمان کاتدا دەزگایەکی کارگێڕی لێهاتوو نەبوو بتوانێت مافی موڵکداری زەوی‌و زارەکان بسەلمێنێت، دواتر سەرجەم ئەو هۆکارانە بوونە هۆی ئەوەی ئاغاو شێخ‌و خانەدانەکانی شار زەوەی‌و زاری زیاد وەرگرن[2] و پرۆسەی تاپۆ بە مەبەستی کڕینی زەوی لە جووتیاران‌و تۆمارکردنی بەناوی خۆیانەوە قۆرخبکەن[3]. بەم چەشنە زەوی‌و زارە کشتوکاڵییەکان کەوتە دەست چینێکی ئەرستۆکراتی فیوداڵ‌و لە ناوچەکەدا چینێکی مڵکداری کشتوکاڵی پان‌و بەرین دەرکەوتن کە خۆیان لە بەگ‌و ئاغاو سەرۆک عەشیرەتەکاندا دەبینییەوە[4].

---

[1] دورين وارنر: الارض و الفقر في الشرق الاوسط، ت. حسن احمد السلمان، ط١، القاهرة ١٩٥٠، ص١٧٧.

بەندی هەشتەمی یاساکە دەڵێت: (موڵکی تەواوی گوندێك، یاخود شارێك ناتوانرێت تێکڕا لەسەر تەواوی دانیشتوانی، یاخود لەسەر یەك دوانێکیان تاپۆبکرێت و هەر یەکەو بەشی خۆی بۆ جودابکرێتەوە) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مارتین ڤان برۆنەسن: سەرچاوەی پێشوو، ب٢، ل ل٧٣-٧٧.

[2] ابراهيم خليل العلاف: المصدر السابق، ص١٣.

[3] عثمان علي: المصدر السابق، ص١٨٧.

[4] دورين وارنر: المصدر السابق، ص١٧٨.

دوای کۆتـایی دەورانـی حـوکمڕانی (مەدحـەت پاشـا) پرسـی هەمەوەنـد ئاقـــارێکی جیـــاوازتری بـــەخۆوە بینـــی، والی نـــویێ ڕەئـــوف پاشـــا (حـوزەیرانی١٨٧٢-٢١ی ئایـاری١٨٧٣) ڕێگەیـەکی نـوێی بـۆ مامەڵـەکردن لەگەڵیانـدا هەڵبـژارد، ئـەویش ڕێگـەی گفتوگـۆو ڕاکێـشان بـوو کـە تیایـدا سەرکەوتوو بوو، چونکە لەو ڕێگەیەوە توانی سەرۆکی هەمەوەند قایل بکات بـچنە بەغـدادو لـەوێ لەگـەڵ دەسـەڵاتداران گەیـشتنە ئـەو ڕێککەوتنـەی کـە هەمەوەندەکان بچنەوە بازیانو تیایدا نیشتەجێ ببنـەوە[1]. وێـڕای ئـەوەش حکومەت تەنها بە ناو دەسەڵاتی بە سەریاندا هـەبوو، ئـەمانیش متمانـەیان نەبوو، بۆیە لە میانی ڕێکخستنێکی جاسووسکارانەوە لـە نـاو ناوەنـدەکانی حکومەتدا، هەمیشە چاودێری جموجۆڵەکانی سوپایان کردووە[2].

کاتێـك جـەنگی روسـی-عوسمـانی (١٨٧٧-١٨٧٨)[3] هەڵگیرسـا، وەك سیاســەتی هەمیــشەییان عوسمانییــەکانو (رووســیا)ش بــۆ ڕاکێــشانی عەشـیرەتە جـەنگاوەرو زۆرو زەوەنـدەکانی کـورد هەریـەك بـەلای خۆیـدا

---

[1] هنـري فيلـد: جنـوب كردسـتان دراسـة انثروبولوجيـة، ت. جـرجيس فـتح الله، ط١، اربيل٢٠٠١، ص٥٣.

[2] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ژاك ڕیتۆرێ: سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٦.

[3] ئەم جەنگە کە بەجەنگی (٩٣)ناسراوە، چونکە بەپێی ڕۆژمێری ڕۆمی ڕێکـەوتی سالْ (١٢٩٣ك) کـردووە، لـە(٢٤ی (نیسانی ١٨٧٧)دا دەسـتی پێکـردووە و لـە (٣١ی کـانوونی دووەمـی ١٨٧٨) دا بـەدۆڕانی عوسمانییـەکان و لەدەسـتدانی ناوچـەگەلێکی فـراوان لـە بـەلقان و شـوێنگەلێکی زۆری تـر کۆتایهـات، بەچەشـنێك (صـەفوەت پاشـا)ی وەزیـری دەرەوەی عوسمـــانی (پێـــشەکییەکانی ڕێککـــەوتن)ی دوای جـــەنگی لەگـــەڵ رووس بەگریانـەوە ئیمزاکـردووە. بـۆ زانیـاری زیـاتر بڕوانـە: عمـر فـاروق يلمـاز: الـسلطان عبدالحميـد خـان الثـاني المفـتي عليـة دراسـة مـن خـلال الوثـائق، دار نـشر عثمـانلي، اسطنبول ١٩٩٩،ص ص٥٤-٧٤.

تــەواوی تواناكــانی خۆیــان بــەكارهێنا. ســوڵتان عەبدولحەمیــدی دووەم (١٨٧٦-١٩٠٩) بـۆ ئـەوەی پـشتیوانی تێكـڕای موسـڵمانان بـەلای خۆیـدا ڕابكێشێت، بە فرمانێكی شاهانەی تایبـەتی بـانگی (جیهـاد)ی داو نـاوی لـە خۆی نا (غازی) [1] لەو پێنـاوەدا بۆ بەشداریپێكردنیان دژ بە (كـافران)و بۆ گرتێبـەردانی دەمـارگیری ئـاینی كـوردان هـەموو ڕێگەیـەكی گرتەبـەر [2]. لـەم سـۆنگەوە بەشـێكی زۆری عەشـیرەتەكانی كـورد (لەوانـە هەمەوەنـد) لـەژێر دروشمی ئالأی (جیهاد)دا شـان بەشانی عوسمانییـەكان دژ بە (ڕووسیا)ی كافر جەنگان [3]. هەمەوەندەكان كە وەك سوارەیەكی نـانیزامی بەشداربوون، ڕۆڵێكی بەرچاویان لـە جـەنگی نێوبراودا هـەبوو، وەك پاداشـتێكیش بۆ ئـەم بەشـداریكردنە زەویو زارێكـی فراوانیـان لـە ناوچـەی بازیـانو چەمـچەماڵ پێبەخـشراوە [4]، قەشــە (ژاك ڕیتــۆریٚ) كــە بــۆ خــۆی لــەو ڕۆژگــارەدا لــە كوردسـتان بـووەو دوای هاتنـەوەیان لـە جـەنگ بەناوچـەكەیاندا تێپـەڕیوە، دەڵێـت: هەمەوەنـد " لـە كـاتی جـەنگی تـوركی-ڕووسـی لەسـەر شـێوەی گرووپـی ژمـارە زۆر، بـە حەماسـەتێك بەشـداری شـەڕەكە بـوون، كـە ئێمـە

---

[1] واتە موجاهیدی ڕێگەی باوەرو ئایین.

[2] ن. ا. خـالفین: المـصدر الـسابق، ص٦٩. محەمـەد حەمـەباقی، شۆڕشـی شـێخ عوبێدوللأی نەهری ١٨٨٠ لە بەڵگەنامەكانی قاجاری دا، موكریـانی، چ١، هـەولیر ٢٠٠٠، ل ٥٨. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ڕۆڵی كورد لـەم جەنگەدا بڕوانـە: عەبـدوللأ عـەلیاوەیی، كوردستان لـە سـەردەمی دەوڵـەتی عوسمـانی دا لـە ناوەراسـتی سـەدەی نۆزدەهەمـەوە تـا جەنگی یەكەمی جیهانی، چ٢، كتێبخانەی ئاوێر، ٢٠٠٤، ل ل٦٠-٦٥

[3] نەجاتی عەبدوللأ: ئیمپراتۆریا، سنوور و خێڵ، ل ١١٩.

[4] باسیل نیكیتین: المصدر السابق، ص ١٩٨.

باوەڕمـان نـەدەكرد، پاشـان كاتێـك چـەكیان بەردەسـتكەوت و چـەكداربوون بەچەك و جبەخانەكانیانەوە ڕایانكرد"[1].

بەگوێرەی تێبینییەكانی (سۆن)، پێش چوونە جەنگی (١٨٧٧-١٨٧٨) هەمەوەندەكان تەنها دەمانچەو ڕمیان هـەبووە، بـەڵام دوای بەشـداریكردن لـە جەنگەكـە، لـە قـەوقازەوە بـە چـەكی (ڕووسـی)یـەوە گەڕانـەوەو دوای ئـەوە ڕمـەكانیان فڕێـدا[2]. بەدەسـتهێنانی چـەكی نـوێ وێـڕای ئـەوەی متمانـەی زیـاتری پێبەخـشین بەرامبـەر بـە عوسمانییـەكان[3]، توانـای جـەنگیانی

---

[1] بڕوانە: گەشتنامەی مسیۆنێرێك بۆ ناوچەكانی كەركوك و سلێمانی ساڵی ١٨٧٨، ل ل ٣٧-٣٨.

[2] مێجەر ئی. بی. سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی...، ل٥٤ ; هنری فیلد: المصدر السابق، ص٥٣.

[3] (ژاك ڕیتـۆریێ) كـە بەچـاوی خـۆی ئـەم چـەكانەی لای هەمەوەنـدەكان بینیـوە لـە گەشتنامەكەی ساڵی (١٨٧٨)دا، دەڵێت: "مـن بـە چاوی خۆم بینیومـە ئـەو ڕۆژەی بـە چەمـچەماڵ دا تێپـەڕبووم، هەمەوەنـدەكان هێنـدە زۆر بـەبوونی ئەفسەرەكان(مەبەسـت ئەفـسەری توركـە كـەدوای گرتنـی تەتـەری ئینگلیـزی "تـاران"لەلایـەن هەمەوەنـدەوە دەمودەسـت بـە سـەدانیان هاتبوونـە ئـەوێ) سـەغڵەت نـەدەبوون، ئـەو ڕۆژەیـان ئاغـای هۆزەكە ئاهەنگی زەماوەندی ژنی نوێی دەگێڕا، بۆ شـەرافەتمەندكردنی دوو یا سێسەد سوارە لـە هەموولایـەكی هۆزەكـەوە هاتبوونـە چەمچەماڵ، ئێوارە هـەموویان لـەو شوێنە كۆببوونەوە كە ئەفسەرەكان خێوەتیان هەڵدابوو، بەرامبـەر بـە خێوەتـەكانیان لەبەرچاوی ئەو لەشكرە حەپەساوەدا بۆ ماوەی زیاتر لـە (سێ كاتژمێر) شاییەكی هـەرە بەشـان و شكۆیان سازكرد، هـەموویان تـا تـەوقی سـەریان چەكداربوون، ڕم لـە مشت، شمشێر بـە لاتەنیـشت، خەنجـەر و دەمانـچە بـە پـشتێن، تفـەنگ لەشـان، شـتێكی نارەحـەت بـوو بەتایبـەت بـۆ لەشـكرەكە، چـونكە هـەموویان پـڕ چـەك بـوون بـە دەمانـچەی هـەژدە گولەخۆری و چەكی سوپایی، ئەمانە چۆن توانیویانە ئەو چەكە قەدەغانە بەردەستبخەن كەتەنها لە ناو دەبۆی دەوڵەتدا هەیە؟!" بڕوانە: گەشتنامەی مسیۆنێرێك، ل٣٧.

بــەهێزترکردو ســنووری پــەلامارەکانیانی فراوانترکــرد، هەردوابــەدوای بەدەسـتهێنانی چـەکی نـوێ لـە ئاکـامی قوڵبوونـەوەی کێـشەیەك لـە نێـوان خۆیـانو زەنگەنـەدا، لەگـەڵ سـوپایەکی گـەورەی عوسمـانی پاڵپـشت بـە عەشیرەتەکانی زەندو پالانی و چەند سوارەیەکی تاڵەبانی و باجەلان، کە بۆ پـشتیوانیکردن لـە زەنگەنـە کەوتبوونـە جەنگـەوە، هەمەوەنـد بالادەسـتانە سەرکەوتن[1]. بۆ ساڵێ دواتریش (شوباتی ۱۸۷۹)دا دەستی هەمەوەندی گەیانـدە سـامەڕا[2]و لـە ئۆکتۆبـەری هـەمان سـاڵدا چـوونە نێـو شارۆچـکەی

---

[1] هنري فیلد: المصدر السابق، ص٥٣. لە برگـەکانی دادێت ئامـاژە بۆ نـاوەرۆکی ئـەم ناکۆکییە دەکەین.

[2] عباس العزاوي: تاریخ العراق بین احتلالین، ج٨، ص٥٤.

گەڕۆك و توێژەرە ئەوروپییەکان کە لە ساڵانی دواتردا ڕێکەوتی ناوچەکەیان کردووە، بالادەستی هەمەوەند لەو دەوروبەرە دەسەلمێنن، بەگوێرەی گـەڕۆکی ئـەڵمانی (بـارۆن ئیـدوارد نۆڵـدە) لـە هەشـتاکانی سـەدەی نۆزدەهەمـدا هەمەوەنـدەکان هاتوچـۆی نێـوان (بەغداد و موسڵ)یان گرتووە و چەکدارەکانیان سوودیان لە تاشە بەردە زەبەلاحەکانی چیای (حەمرین) وەك سەنگەر و پاڵپشتێك وەرگرتووە. بڕوانە: گەشتێك بە عەرەبستان و کوردسـتان و ...، ل٩. هـەروەها توێـژەری ئـەڵمانی بـەناوبانگ (ئۆبنهـایم) لـە کـاتی قسەکردنیدا دەربارەی مەترسی گەشتکردنی دەریایی لە موسڵەوە بۆ بەغداد، دەڵێت "هەرچەندە باری ئاسایشی سەر ڕووبارەکە زۆر باشتربووە.....لەگەڵ ئەوەشدا ساڵی ۱۸۹۱ گەڕیـدەی فەرەنـسی (کومـت دی شـولییە) بـە ڕێکـەوتێکی سـەیر لـە پـەلامارێکی هەمەوەندەکان کە کەمێك لەسەرووی (تکریت)ەوە کردبوویانە سەری دەرچووبوو، هەر لە پێش چاویدا دەستەیەکی (چەتە) کە پێکهاتبوون لە (٧٥) سوارە دەست بەسەر چەند بەلەمێکدا دەگرن و خاوەنەکانی دەکوژن، هەرچی ئەوە توانی خۆی بگەیەنێتە کەناری ڕۆژئاوای ڕووبارەکە و لەنیوەشەودا بە سوودوەرگرتن لە ڕەشەباو باران توانی لەو گەرووە بپەڕێتەوە کە لەژێر کۆنترۆڵ و چاودێری (چەتەکان) دا بوو". اوبنهایم: المصدر السابق، ص٢٣٥.

قـەرەداغو قایمقامەکـەیان کوشـت[1].لـە باشـووری کوردسـتان دا بێجگـە لـە هەمەوەنـد، شـێخانی (بەرزنجـە)ش لـەژێر نـاوی جیهـاددا بـە لەشـکرێکی بەرچـاوەوە بەشـداری جـەنگی نێوبراویـان کـردووە، کاتێـك (حـاجی کاکـە ئەحمـەدی شـێخ) هێزێکـی گونجـاوی لـە موریـدانو لایـەنگرانی خـۆی سـازو ئامادەکردو بە سەرکردایەتی شـێخ سـەعیدی کوڕەزای ڕەوانـەی جەنگەکـەی کرد[2].

دوای بڕانەوەی جەنگو ئاکامەکانی کە بوونە هـۆی سـەرهەڵدانی چـەندین کێـشەی جۆراوجـۆری سیاسـیو ئـابووریو کۆمەڵایـەتی، لەوانـە: کێـشەی ئەرمـەن، بەرزبوونـەوەی بـاج، تێکـچوونی شـیرازەی یاسـاو ئاسـایش، بلاوبوونەوەی برسێتیو نەخۆشیو هـەژاری، دەرەنجام تێکڕا ئەمانـە بوونـە مایەی بێزاری خەڵكو ئیدی یاخیبوونو ڕاپەڕین زۆر ناوچەی کوردستـانی بندەسـتی عوسمـانی گرتـەوە، لەوانـە راپـەڕینی کـوڕانی بـەدرخان (پـایزی ساڵی ١٨٧٨ز)و ڕاپـەڕینی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری (١٨٧٩-١٨٨٠). بۆ بەشـداریکردنی بزوتنەوەکـەی کـوڕانی بـەدرخان لـە هـەموو لایـەکی کوردسـتانەوە دەسـتە دەسـتە کـوردی چـەکدار ڕوویـان تێکـرد. جگـە لـە رزگـارکردنی شـاری جـەزیرەو چۆلەمێرگو مـاردین لـە کوردسـتانی بـاکوور،

[1] پاشـکۆی ڕاپـۆرتی ژمـارە ١٤٩، هەڵبژاردەیـەك لـە بروسـکەیێکی جێگـری کونـسوڵی فرەنسا لـە موسڵ بە مێژووی ٦ی ئۆکتۆبەری ١٨٧٩، لـە: نـەجاتی عەبـدوڵلا: شۆڕشـی شـێخ عوبەیـدوڵڵای نـەهری لەبەڵگەنامـەکانی فەڕەنسیدا ١٨٧٩-١٨٨٢، مەکتـەبی بـیرو هوشیاری، سلیمانی ٢٠٠٤، ل٦٦.

[2] محەمەد ئەمین زەکی: تاریخی سلێمانی وە وڵاتی، ل١٦٣.

طـاهیر احمـد حـویزی لـە کتێبەکەیـدا دەڵێـت: گـەلێك لـە گـەورەکانی کـورد چـوونە ئـەم جەنگە، لە شاری کۆیەش (حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلی و شێخ کەریمی بەرزنجەی کۆیی) بەشداربوون. بڕوانە کتێبەکەی: مێژووی کۆیە یا کۆیسنجاق، ب١، ١٩٦٢، ل١١٤.

**هـەردوو شارۆچـكەی (زاخـۆو ئامێـدی)یـش لـە باشـووری كوردسـتان رزگـاركراون[1]. بـەڵام تـا ئێـستا سەرچـاوەكان ئاماژەیـان بـۆ باڕسـتی راستەقینەی بەشداریكردن یا دژایەتیكردنی چەندین عەشیرەتی گـەورەی ناوچەكە لەوانە: دۆسكی، سلیڤانی، سندی، زێبار...هتد نەكردووە.**

**كاردانەوەی دەسەڵاتدارانی عوسمانی بەرامبەر بەشداربووانی بزاڤەكە لە خەڵكی ڕەشۆك قورس و پڕ توندوتیژی بوو، پێچەوانەی ئەوە لە سەرۆك عەشیرەتو سەركردە لۆكاڵییەكانیان نەپرسی، تەنها (عوسمانو حسێن) كە سەرانی شۆڕش بوون، دوورخستەوە بۆ دەرەوەی كوردستان. وەك هەمیشە سیاسەتیان عوسمانییەكان لەو رۆژگارەدا كاریان بە سەرۆك عەشیرەتەكان هەبوو، دەیانویست وەك فشارێك بەرامبەر ئێران بەكاریان بهێننو لە ڕێگەی ئەوانەوە هاوكاری چینێكی فراوانی خەڵك بۆخۆیان دەستەبەربكەن[2]. وێـڕای سیاسـەتی بـەكارهێنانیان دژ بەیـەكتر وەك (تروتێـر-Trotter)ی كۆنـسوڵی گـشتی بـەریتانی لـە كوردسـتانی عوسمـانی كـە هاورۆژگـاری ڕاپەڕینەكـەی شـێخ عوبێـدوڵلا بـووە ئامـاژەی بـۆ كـردووە كـە دەڵێـت: "سیاسەتی حكومەتی عوسمانی هەمیشە بە گژاكردنی عەشیرەتێك دژ بە یەكێكیتر بووە، ئەو شۆڕشانەی كوردستانیش كە لە دوو ساڵی رابردوودا ڕوویانداوە، لە هەموو حاڵەتێكدا بەیارمەتی سەرۆك عەشیرەتی تری سەر بە دەوڵەت سەركوتكراون"[3].**

---

[1] **محەمەد حەمە باقی: سەرچاوەی پێشوو، ل٧٤. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەم بزافە بڕوانە: عەبدوللا عەلیاوەی: سەرچاوەی پێشوو، ل ل٦٧-٦٨.**

[2] **ن.ا. خالفین: المصدر السابق، ص٧٩.**

[3] **وەدیـع جویـدە: شۆڕشـی شـێخ عوبەیـدوللای نـەهری(١٨٨٠) لـە بەڵگەنامـەكانی ئینگلیزی و ئەمریكایی دا، و. محەمەد حەمە باقی، دەزگای ئاراس، هەولێر ٢٠٠٧، ل٤٢.**

هێشتا ڕاپەڕینەکەی کوڕانی بەدرخان بە تەواوی کۆتایی پێنەهاتبوو (شێخ عوبێدوللای نەهری)ی دەرکەوت. هەر دوابەدوای جەنگ کە شێخ بۆخۆی شان بەشانی عوسمانی ڕۆڵی تیاگێڕابوو، بۆ ڕوبەڕوبوونەوە لەگەڵ (عوسمانی و ئێران) بەخۆکەوت، لەو پێناوەدا بۆ ڕێکخستن و کۆکردنەوەی سەرۆك عەشیرەت و بەگزادەو پیاوانی ئایینی کورد چەندین نامەو بانگەوازی دۆستانەی بۆ ناردن[1] بۆ ئەوەی پێکەوە خەباتیان یەکبخەن و لە یەکتر نزیکببنەوەو یەکبگرن[2].

وەك لە بەڵگەنامە فەرەنسییەکاندا دەردەکەوێت، ناوچەکانی باشوورو ڕۆژهەلاتی کوردستان کە زۆر لەژێر کاریگەریی شێخدا بوون، یەکەمین ناوچەکان بوون وەلامی ئەم دەست لە پشتدانەیان دایەوە، بەڵگەنامەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن هەر لە یەکەمین ڕۆژەکانی مانگی حوزەیرانی ساڵی (١٨٧٩)وە بزاڤەکە لە نێو عەشیرەتەکانی نێوان دەربەندی زابی گەورە، لە ڕۆژهەلاتی چیای (کاردۆخ)و ناو قەزای (ئامێدی)و (ئاکرێ) کە سەر بە (ویلایەتی موسڵ)ن دەستپێکردووەو لەو کاتەوە شۆڕش بە بەرفراوانیەکی زۆرەوە خوارووی ڕۆژهەلات بە ئاراستەی (ڕەواندووز) تا (کەرکوك)ی گرتۆتەوە[3].

---

[1] ن.ا. خالفین: المصدر السابق، ص ص٧٩و٨٥. محەمەد حەمە باقی: شۆڕشی شێخ عوبێدوللای نەهری ١٨٨٠ لە بەڵگەنامەکانی قاجاری دا، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٤. بۆ زانیاری زیاتریش لەسەر بزاڤەکە بڕوانە: عەبدوللا عەلیاوەی، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٥.

[2] محەمەد حەمە باقی: شۆڕشی شێخ عوبێدوللای نەهری ١٨٨٠ لە بەڵگەنامەکانی قاجاری دا سەرچاوەی پێشوو، ل٧٤. عەبدوللا عەلیاوەی، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٥.

[3] نەجاتی عەبدوڵلا: شۆڕشی شێخ عوبێدوڵلای نەهری لەبەڵگەنامەکانی فەرەنسیدا ١٨٧٩-١٨٨٢، ل ل٤٢و٤٧.

وەك دەردەكەوێت یەكەمین پێكدادانەكانی شۆڕش لە ناوچەی (بەرواری ژێری)و لە (ڕەواندوون) ڕوویانداوە، لەنێو (موسڵ)یشدا باسی ئەوە هەبووە كە شێخ عوبێدوڵلا، (عەبدوللاَ ئاغا)ی بەگی (زێبار)ی بۆ لای خۆی ڕاكێشابێتو هانیدابێت بۆ ئەوەی بە هێرشێكی لە ناكاو (ئامێدی) بگرێت، بۆ ئەوەی بیكاتە بارەگای خۆی، كە هەواڵی شۆڕش گەیشتە موسڵ (فەیزی پاشا)ی والی بە ناڕەحەت شاری جێهێشت تابچێتە كەركوك، بۆ ئەوەی ئەگەر بكرێت لەوێوە بكەوێتە گفتوگۆو سازشكردن لەگەڵ شێخ عوبێدوڵلادا، لە دۆخێكدا ئەگەر سەرینەگرت ئەوا هەوڵبدات بە بەڵێنو پیلانی ئاسایی ژمارەیەكی هەرچی زۆرترە لە ئەندامە سەرەكییەكانی لە شۆڕش دابڕێت[1].

پێدەچێ گفتوگۆكان كە نزیكەی مانگێكی خایاندووە (١٥ی حوزەیران تا ١٥ی تەمووز) بەرەنجامێكی قایلكارانەی بەدەستەوە نەدابێت، چونكە هەر لە یەكەم ڕۆژەكانی مانگی تەموزی ساڵی (١٨٧٩) فەرمان بۆ سەركردایەتی سەربازی موسڵ دەرچووە تا بە بەتالیۆنێكی سەربازییەوە (٤٥٠ سەرباز) بەرەو ناوچە ڕاپەڕیوەكان بەڕێبكەون، بۆ ئەو مەبەستە میر لیوا (ئەدهەم پاشا) بە (٢) لەشكری پیادە (١٦٠) سەربازو یەك بەشی تۆپخانەی چیای موسڵ بەرەو ئامێدی چووە. (ئەدهەم پاشا) لە ئامێدی كە دەبیستێت (عەلی بەگ ئاغا)ی سەرۆك عەشیرەتی (نێروە) پەیوەندی بە شۆڕشەوە كردووە، دەموودەست داوای هێزی زیاد لە موتەسەڕیفی موسڵ دەكات. هەر ئەم

---

[1] نەجاتی عەبدوڵلاَ: شۆڕشی شێخ عوبێدوڵلای نەهری لەبەڵگەنامەكانی فەرەنسیدا ١٨٧٩-١٨٨٢، ل ل٤٧-٤٨.

لەشکرە لە سەرەتاکانی ئابدا لە پێکدادانێکدا لەگەڵ شۆڕشگێڕانی کورد تێکدەشکێت و (٤٠) کەسیان لێ دەکوژرێ"[1].

والی موسڵ بە تەواوی لە بەرامبەر شۆڕشەکە کە تا دەهات گەورەتر دەبوو، بە ناچاری ترسناکی بارودۆخەکەی خستە بەردەم حکومەتی عوسمانی، کە هەواڵەکانی شۆڕش نیگەرانییەکی زۆری تیا دروستکردبوو. بۆیە خێرا فەرمانی بۆ والی بەغداد دەرکرد، بە خۆی و لیوایەکی گەڕۆکی چوار بەتالیۆنییەوە پەیوەندی بە (موسڵ)ەوە بکات، لە هەمانکاتدا تیپێکی سوارە لە ئۆردووی موسڵ و یەك بەتالیۆنی پیادە لە جەزیرەوە بەرێکران بۆ پێوەندیکردن بە ئەدهەم پاشا لە (ئامێدی)، دواجار (سامیح پاشا)ی کۆنە سەرکردەی سوپای ئەرزەرۆم بۆ لەشکرکێشی بۆ سەر کوردستان وەکو فەرمانەدەی ئیمپراتۆریی دانراو فەرمانی پێدرا هاوڕێ لەگەڵ میر ئالاتی (رەجەب پاشا)و کۆمەکێکی زۆر لە لایەن ئۆردووی سوڵتانەوە بچنە موسڵ. بەڵام حکومەتی عوسمانی کە زانی شێخ عوبێدوڵلا شۆڕشەکەی تا کۆتایی سەرماو سۆڵەی زستان دوادەخات، فەرمانەکانی پێشوتری ڕاگرت [2].

هەر لەو ماوەیەدا (٢٥-٢٦ی ئابی ١٨٧٩) بۆ جاری دووەم سوپاکەی (ئەدهەم پاشا) لە هەوڵێکیدا بۆ جێهێشتنی (ئامێدی)و چوون بەرەو (بەرواری باڵا)، نزیك بە (ڕێکان) لەگەڵ سوپای شۆڕشگێڕان بە

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل٤٨. خالفین ئاماژەی بۆ پێکدادانەکە کردووە، بەڵام دەڵێت شەڕەکە لەمانگی ئەیلوولدا ڕوویداو. سەرچاوەی باسەکەشی بەڵگەنامەکانی ئەرشیفی وەزارەتی دەرەوەی (روسیا)یە. بڕوانە: الصراع على كردستان، ص٨٠.

[2] نەجاتی عەبدوڵلا: شۆڕشی شێخ عوبێدوڵلای نەهری لەبەڵگەنامەکانی فەرەنسیدا ١٨٧٩-١٨٨٢، ل٥٠.

سەرکردایەتی (شێخ عەبدولقادر)و (عەلی ئاغا)ی بەگی نێروە شەڕ پەرپابوو، سوپای عوسمانی پاش لە دەستدانی (٤٥ یا ٥٠) کوژراو بریندارو دیلبوونی تیپێك بە هەموو ئەفسەرەکانییەوە شەڕەکەیان دۆڕان[١].

دوابەدوای ئەو سەرکەوتنانە، (شێخ عوبێدوڵڵا) بە نوسراوێك داواکاریو مەرجەکانی بۆ ڕاگرتنی نائارامی ناوچەکە نارد بۆ (فەیزی پاشا)ی والی موسڵ. کە بریتیبوون لەم سێ خاڵە:

-حکومەتی عوسمانی دانبنێت بە سەربەخۆیی کوردستاندا.

-خودی شێخ وەك سەرۆکی پشتاوپشتی هەرێمە دانپێدانراوەکە دەستنیشانبکرێت.

-تەنها پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی ئەوەبێت کە سەرانەی ساڵانە بدەن[٢].

---

[١] نەجاتی عەبدوڵڵا: شۆڕشی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری لەبەڵگەنامەکانی فەرەنسیدا ١٨٧٩-١٨٨٢، ل٥١. بەڵگەنامەکانی ئینگلیز ئاماژەیان بۆ ئەم شەڕە کردووە، بەلاَم لایەنی (عوسمانی)یان وەك سەرکەوتووی شەرەکە خستۆتەروو. بڕوانە: وەدیع جویدە، شۆرشی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری (١٨٨٠) لە بەڵگەنامەکانی ئینگلیزی و ئەمریکایی دا، ل ل٥٠-٥١. عثمان علی، المصدر السابق، ص ص٦٨-٦٩.

[٢] نەجاتی عەبدوڵڵا: شۆڕشی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری لەبەڵگەنامەکانی فەڕەنسیدا ١٨٧٩-١٨٨٢، ل ل٥١-٥٢.

وەك دیارە ئەم داواکاریانە سەربەخۆیی تەواوەتی ناگەیەنێت، لەم ڕووەوە دەنگی خۆم دەخەمە پاڵ (د.نەجاتی عەبدوڵلا) کەدەڵێت: ئامانجە سیاسییەکانی یەکەمین شۆڕشی شێخ دژ بە بابیعالی ١٨٧٩ زیاتر ئۆتۆنۆمییەکی هاوشێوەی بولگارەکان بووە، وەك لەوەی سەربەخۆیی تەواوەتی بێت. بەشێوەیەك کوردستان وەکو هەرێمێکی ئۆتۆنۆمی عوسمانی هەر تەنها لەرووی دانی سەرانەیەکی ساڵانەوە بە حکومەتی ناوەندی ببەسترێتەوە. بەلاَم دوای تێکشکانی راپەڕینی یەکەمی، یەکگرتنەوەی کوردستان و درووستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بەزەقی لەنامەو گفتوگۆکانی شێخدا دەردەکەوێت بڕوانە: لە رووخانی میرنشینەکانەوە بۆ دەسەلاَتی شێخەکان: سەرەتایێك بۆ لە

ئەو داواكارییانە لە لایەن (فەیزی پاشا)ی والی (موسڵ)ەوە لە سەرەتاكانی مانگی ئەیلوولدا ڕەوانەی ئەستەنبوڵ كرا، وێڕای چەند زانیارییەك لەسەر شۆڕشگێڕەكان، كە ئاماژە بۆ ئەوە دەكەن سوپاكەی شێخ عوبێدوڵلا نزیكەی (١٥٠٠٠) چەكدارەو بە چاكترین چەكەكانی مارتینی (Martini)و وینشستەر (Wenchester)چەكدارن كە بە زۆری لە ماوەی جەنگی رووسی- توركی (١٨٧٧-١٨٧٨)دا بە دەستیانهێناوە، سوپاكە تەواو پڕ ئازووقەن‌و پێدەچێت نەستووریەكانیش بڕیاریان دابێت بۆ پرسی هاوبەش هەنگاو هەڵگرن[1]. هاوكات بە ناردنی داواكارییەكانی شێخ بۆ ئەستەنبوڵ والی موسڵ دوو كەسایەتی كورد، یەكێكیان لە (كەركوك)و ئەوی تریان لە (سلێمانی)یەوە وەك نوێنەر ڕەوانەی لای (شێخ عوبێدوڵلا) كرد تا ئاگاداری بكەنەوەو هەوڵبدەن بۆ ئەوەی بڕیاربداتو خۆبەدەستەوە بدات، بەلاّم هەوڵەكانیان سەرینەگرت[2].

هەرچی حكومەتی عوسمانییە كە هەواڵەكانی والی (موسڵ)یان پێگەیشت، بڕیاریاندا كار بە فەرمانەكانی پێشووتری خۆیان بكەنەوە. بۆیە (سامیح پاشا) دەمودەست بە ڕێكەوت بۆ كوردستان، هەرچی (ڕەجەب پاشا)یە ئەوا ئەركی نوێی پێسپێردرا، بڕیاربوو وەك سەرۆكی فەرمانده‌ی

---

دایكبوونی هۆشیاری نەتەوایەتی، لە چوارچێوەی كتێبی: شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری لە بەڵگەنامەكانی فەرەنسیدا ١٨٧٩-١٨٨٢، ل٢٩ .

(١) هەمان سەرچاوە، ل٥٢.

(٢) نەجاتی عەبدوڵلاّ: شۆرشی شێخ عوبێدوڵلای نەهری لەبەڵگەنامەكانی فەڕەنسیدا ١٨٧٩-١٨٨٢، ل٦٥.

گشتی سوپای شەشەمی عوسمانی بچێتە بەغداد[1]. لەو چوارچێوەدا لە سەرەتای تشرینی یەکەمی (١٨٧٩)دا هێزێك کە پێکهاتبوو لە (٣٠٠) سەرباز لە (جەزیرە)وە بۆ (ئامێدی) بەڕێکەوتن، هەرچی (سامیح پاشا)یە بە(١٠٠٠) سەربازەوە لە (وان)ەوە چوو بۆ (موسڵ) [2].

وەك لە بەڵگەنامەکاندا دیارە، هاتنی ئەو هێزانە دوادەکەوێت و ئەوکات وەرزی سەرماو سۆڵە دێت و بەفر دەست بە بارین دەکات، لە دۆخێکی واشدا "تورکەکان بێتوانان لەوەی بتوانن تاکۆتایی زستان بە شێوەیەکی سەربازی هیچ کارێك ئەنجام بدەن"، هەرچی "کوردەکانیشە شوێنەکانی خۆیان پاراستووەو لە تەواوی زستاندا بێدەنگ دەبن" لەگەڵ ئەوەشدا لایەنە ناکۆکەکان بێدەنگ نەبوون، هەرچی عوسمانییەکانە "سیاسەتی بانگهێشتکردنێکی پڕ فشاریان لە ئاست سەرانی شۆرش و سەرۆك عەشیرەتەکاندا پەیڕەودەکرد، خودی شێخ بێگومان و دوودڵی بەرگەی ئەم سیاسەتەی گرتووە" بەڵام (سێ) لە سەرۆك عەشیرەتەکانی کورد وەك بەرەنجامێك بۆ ئەم سیاسەتە لە (تشرینی یەکەمی ١٨٧٩)دا پشتیان لە

---

[1] نەجاتی عەبدوڵڵا: شۆرشی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری لەبەڵگەنامەکانی فەرەنسیدا ١٨٧٩-١٨٨٢، ل٥٣.

لە چوارچێوەی ڕێکخستنەوەو چاکسازیکردن لەنێو سوپادا، ساڵی (١٨٤٨) عوسمانییەکان سوپای وڵاتەکەیان لە (پێنج) لەشکرەوە کرد بە (شەش) لەشکر، و ناوی (لەشکری شەشەمی سوڵتانی)یان لێنا، (بەغداد) کرایە بارەگای لەشکری نوێ، سنووری چالاکییەکانیشی تێکڕای خاکی (عێراقی ئەمڕۆی) دەگرتەوە، بە ئەیالەتی (موسڵ)ەوە کە ئەوکات سەربەخۆ بوو. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: جمیل موسی النجار: المصدر السابق، ص ص ٢٧٩-٣٠٨.

[2] نەجاتی عەبدوڵڵا، شۆرشی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری لەبەڵگەنامەکانی فەرەنسیدا ١٨٧٩-١٨٨. ل٦٧.

شۆڕش کرد[1]. هەر لەو ماوەیەدا میر لیوا (شەعبان پاشا) بەخۆیو سێ بەتالیۆنەوە چووەتە سەر ڕەواندوز، دوای ئەوەی خەڵکە ڕاپەڕیوەکەی سەرکوت کردووە، (یەحیا بەگ) ناوێکی کە سەر بە کۆنە فیوداڵیتەی ناوچەکە بووە گرتووەو و ڕەوانەی (بەغداد)ی کردووە[2]، بە دیوێکی تریشدا بەڵگەنامەکان باس لەوە دەکەن کە ژمارەیەکی زۆری سەربازی کورد سوپای عوسمانیان جێهێشتووەو داویانەتە پاڵ شۆڕشگێڕان، لەشکرێکی پیادەشیان دوای ئەوەی لە لایەن شۆڕشگێرانەوە گەمارۆدراون خۆیان بەدەستەوەدابوو، پاش چەککردنیان هێسترەکانیان لێوەرگرتوونو خۆیان ڕەوانەی (موسڵ) کردونەتەوە[3].

جێی سەرنجو تێبینییە کە بەڵگەنامەو سەرچاوەکان ئاماژە بۆ بەشداری یا دژایەتیکرنی زۆرێکی تر لە عەشیرەتە گەورەو جەنگاوەرەکانی کوردستانی باشوور لە شۆڕشەکەی (شێخ عوبێدوڵلا) ناکەن لەوانە: خۆشناو، دزەیی، جاف[4]، هەمەوەند...هتد. تەنها ئاماژەیەك ئەوەیە لە کاتی ئامادەکارییو کۆبوونەوەکانی (شێخ)دا بۆ شۆڕش لە تەمووزی ساڵی (١٨٨٠)دا، (کلایتون)ی جێگری کۆنسوڵی ئینگلیز کە سەردانی (نەهری) کردووە، لەوێ چاوی بە نوێنەرە جیاجیاکانی کوردستان کەوتووە، لەو

---

[1] هەمان سەرچاوە. ل ل٦٩- ٧٠.

[2] هەمان سەرچاوە. ل٦٦.

[3] هەمان سەرچاوە. ل ل٦٩- ٧٠.

[4] جەلیلی جەلیل ئاماژەیەکی خێرا بۆ بەشداریکردنی عەشیرەتی جاف بە(٥٠٠٠ ) تفەنگەوە دەکات لە ڕاپەرینی ساڵێ (١٨٨٠)دا. بەڵام بە بڕوای ئێمە زێدەڕۆی لەو ژمارەیەدا هەیە و بە هۆی کوژرانی محەمەد پاشای سەرۆکی جافیشەوە لەو ساڵەدا (١٨٨٠) پێناچێت ئەم هاوپەیمانێتیە هیچی لێ سەوزبووبێت. بڕوانە: کتێبەکەی: ڕاپەڕینی کوردەکان لە ساڵی ١٨٨٠، و. کاوس قەفتان، بەغداد، ١٩٨٧، ل١٢٥.

چوارچێوەشـدا ئامـاژەی بـۆ: سـەرۆکە کوردەکـانی: (سـلێمانی، ئامێـدی، هەورامان) کردووە[1]. کە وەك زانراوە ئەوانە لەو (٢٢٠) کەسایەتییانە بوون کـە سەرچـاوەکان ئاماژەیـان بـۆ کـردوون، گوایـە بـەدەم بانگەوازەکـەی (شـێخ)ەوە چـوونو لـەو ماوەیـەدا بـۆ دانـانی بەرنامـەی شـۆڕش بەشـداری کۆبوونـەوەکانیان کـردووە، ئـەو کۆبوونەوانـەی یەکێتییـەکی لـە نێـوان عەشیرەتە کوردەکاندا لێکەوتـەوە، کـە بـە (یـەکێتی کـوردان) ناسـراوە[2]. لـەم ڕووەوە سەرنجێکی خێرا بۆ نەخشەو پلانە سەرەتاییەکانی شۆڕش کە لە قۆناغی یەکەمدا بۆ ڕزگارکردنی کوردستان دانرابوو و لەبەر چەند هۆیەك جێبـەجێ نـەکرا، ئـەوە دەردەخـات لـە کـۆی سـێ بـەرە، (دووانیـان) بـۆ ڕزگارکردنی ناوچەکانی باشووری کوردستان دانرابوون[3]. کە ئەمەش بە بـــڕوای ئێمـــە ئامـــادەگی بـــەرفراوانی عەشـــیرەتەکانی ناوچـــەکەو پشتگیریکردنیان لە شۆڕش دەسەلمێنێت.

[1] محەمەد حەمە باقی، شۆڕشی شێخ عوبێدوڵڵای نەهری ١٨٨٠ لە بەڵگەنامەکانی قاجـاری دا، ل٧٧. عبـدالرؤوف سـنو، النزعـات الكيانيـة الاسـلامية فـی الدولـة العثمانية١٨٧٧-١٨٨١: بلاد الشام، الحجاز، كردستان، البانيا، بيروت، بيسان للنشر والتوزيع، ١٩٩٨، ص١٢٤.

[2] ن.ا. خالفين، المصدر السابق، ص٨٦.

[3] بـەرەی یەکـەم: (محەمـەد سـدیق)ی کـوڕە گـەورەی شـێخ تیایـدا سـەرکردایەتی عەشیرەتەکانی (مەنگوڕ و مامش) بکات، بۆ گرتنی (ڕەواندوز) و لەوێشەوە پەلاماری (بەغداد) بدەن. بەرەی دووەم: (شێخ عەبدولقادر)ی کوڕی دووەمی شێخ سەرکردایەتی بکات بۆ گرتنی ئامێدی و موسڵ. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ن.ا.خالفين، المصدر السابق، ص٨٦.

نامـەکانی شـێخ عوبێـدوڵلا بـۆ (محەمـەد ئاغـا)ی ئـاکۆو (مامەنـد ئاغـا)ی پیران[1] لە بتوێن‌و بەرنامەی بۆ سەردانی ڕواندوز بـە مەبەسـتی دیـدەنیکردن لەگـەڵ عەشـیرەتە کۆچـەرییەکانی ناوچـەکەو سـەردانی شـێخ عەبـدولقادرو لایـەنگرەکانی بـۆ لای سـەرۆك عەشـیرەتەکانی ناوچـەی: پـشدەر، بیتـوێن، کۆیـە، ڕەوانـدوزو هـەولێر، ئاوڕدانەوەیـەکی نـوێی شـێخ عوبێـدوڵلاّ بـوو لـە عەشـــیرەتەکانی کوردســـتانی باشـــوور لـــە چوارچـــێوەی ســـەرلەنوێ بەســـەرکردنەوەو ڕێکخـــستنەوەی کوردانـــدا بـــۆ ئەرك‌وچـــالاکییەکانی ئایندەی[2].

---

[1] بـۆ خوێندنـەوەی دەقـی نامـەکان بڕوانـە: محەمـەد حەمـە بـاقی، شۆڕشـی شـێخ عوبێدوللاّی نەهری ١٨٨٠ لە بەڵگەنامەکانی قاجاری دا ، ل ل ٢٣٣-٢٣٨.

[2] هەمان سەرچاوە، ل ل ٢٣٣-٢٣٨.

## باسی دووەم/

## سیاسەتی پان ئیسلامیزمی[1] دەوڵەتی عوسمانیو کاریگەری لەسەر عەشیرەتەکان:

ئـەو بارودۆخـە ناهـەموارەی لـە رۆژگـاری "سـوڵتان عەبدولحەمیـدی دووەم"دا دەوڵـەتی عوسمـانی پیاتێپـەڕی، سـوڵتانی هانـدا بانگەشـە بـۆ یـەکێتی ئیـسلامی بکـات، کـە وەك باشـترین رێگەچـارە بـۆ نەخۆشـییەکانی سـەڵتەنەت تەماشـای دەکـردو وەك پـەرژینێك کـە دەوڵـەت لـە چـاوتێ بڕینـەکانی رۆژئـاوا بـۆ دابڕینـی ناوچـەگەلێکی فراوانـی خاکەکـەی دەپارێزێ. لەم پێناوەدا یەکخستنی هێزە ئیسلامیەکانو پێویستی کارکردن بـۆ ڕووبەڕووبوونـەوەی دەوڵەتـە ئەوروپیـەکانی کـردە ئامـانجی خـۆی، چـونکە بۆچوونی وابوو جەنگی خاچ دروشمەکان دژ بەدەوڵـەتی عوسمـانی درێـژەی هەیەو بەردەوامـە، پێویستە لـە میانـەی چەمکی پـان ئیسلامیزمەوە رەگـەزە

[1] زاراوەی پـان ئیـسلامیزم (Pan-Islamism) وەك هێمایـەك بـۆ ئـەو چـەمك و سیاسەتانەی بانگەشە دەکەن بۆ یەکخستنەوەی دنیای ئیسلام، لە هەفتاکانی سەدەی نۆزدەهەمـەوە بـەکارهاتووە، جمـال الـدین الافغـاني (١٨٣٩-١٨٩٧) لـە بیرمەنـدە بەرایییەکانی ئەم بوارەن، بەڵام ئەوەی هەوڵیدا بیخاتە بواری جێبەجێکردنەوە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم بوو. بۆ زیاتر بڕوانە:
Azmi Özcan: Pan-Islamism:Indian Muslims, the Ottomans and Britain 1877-1924,Leiden-Brill-1977, pp.23-24;
محمد عبدالرحمن یونس العبیدي: السلطان عبدالحمید الثاني و الجامعة الاسلامیة ١٨٧٦-١٩٠٩، رسالة ماجستیر-کلیة التربیة، جامعة الموصل، ٢٠٠٠، ص ص٣٤-٤٠.

جۆراوجۆرەكانی دەوڵەتی عوسمانی یەكبخرێت[1]. سوڵتان دوورتر چوو كاتێك داوای دەكرد پێویستە كاریگەریی ئەم یەكێتییە تێكڕای موسڵمانەكانی گۆی زەوی لە خۆبگرێت و لەڕووی مەعنەوییەوە بەخەلافەتەوە گرێبدرێن[2]، چونكە بڕوای وابوو موسڵمانەكانی جیهان شۆڕبونەوەیەكی سرووشتی موسڵمانەكانی دەوڵەتی عوسمانین[3].

جێبەجێكردنی بیروباوەڕەكانی بزاڤی پانئیسلامیزم لە نێوخۆدا مانای دەرنەچوونی دەگەیاند لە سنووری یاساكانی ئیسلام و ئەلتەرناتیڤێك بوو بۆ چارەسەرە ڕیفۆرمكاریی و دەستوورییەكان، ئەوانەی لەو ڕۆژگارەدا دەخرانەڕوو، لە دەرەوەشدا واتای گردبوونەوەی موسڵمانانی دەگەیاند لە دەوری خەلافەت، ئیدی بەچاوپۆشین لە ڕەگەزو ناسیۆن، بەو پێیەی خەلافەت ئەو هێزەیە دەوڵەتی عوسمانی و دونیای ئیسلام پێكەوە گرێدەدات و ئیسلام و موسڵمانان لە چاوتێبڕینی ئەورووپا دەپارێزێت[4].

ڕواڵەتەكانی بزاڤی پانئیسلامیزم لەزۆر سیاسەت و هەنگاوی دەرەكی و نێوخۆیدا دەركەوتن، یەكێك لە ڕواڵەتەكانی لە ئاستی دەرەوە، پتەوكردنی پەیوەندییەكان بوو لەگەڵ سەرجەم موسڵمانان لە جیهاندا، "سوڵتان

---

(1) السلطان عبدالحمید: مذكرات السلطان عبدالحمید، ت. محمد حرب، ط٣، دار القلم، دمشق ١٩٩١، ص٢٣-٢٦.

(2) عمر فاروق یلماز: المصدر السابق، ص٢٣٣ ; محمد عبدالرحمن یونس العبیدي، المصدر السابق، ص٢٧.

(3) محمد حرب: سوڵتان عبدالحمیدی دووەم، دوا سوڵتانە گەورەكەی عوسمانی، و.ئیبراهیم ئەحمەد شوان، چ١، هەولێر ٢٠٠٤، ل٦٥.

(4) محمد انیس: الدولة العثمانیة والشرق العربي ١٥١٤-١٩١٤، القاهرة، د.ت، ص ص١٤٥، ٢٣٨ ; محمد عبدالرحمن یونس العبیدي: المصدر السابق، ص٢٩.

عەبدولحەمید" هەمیشە لە میانی ناردنی نێردراوی تایبەتییەوە بۆ وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی دوورو ئەفریقیا هەوڵی داوە یەکێتی و هاوکاری ئیسلامی لەژێر سێبەری خەلافەتدا بەدیبهێنێت. وەك خەلیفەیەکی موسڵمانانیش نێردراوی خۆی ئاراستەی هیند، چین، جاوا، ئاسیای نێوەندو ئەفریقیا کردووە، هەمیشە ئەوەی بیردەخستنەوە بوونی خەلیفەیەك بتوانێت تێکڕای موسڵمانان لە ڕووی مەعنەوییەوە پێکەوە گرێبدات کارێکی پێویستە[1]. لە ئاستی نێوخۆیشدا ڕەنگە بەرچاوترین و مەزنترین دەستکەوتەکانی عەبدولحەمید بۆ پاڵپشتکردنی بزاڤی پانئیسلامیزم دامەزراندنی هێڵی ئاسنیی حیجاز[2] بێت کە لە نێوان ساڵی (١٩٠١و١٩٠٨) وە لە ڕێگەی بەشداری خۆبەخشەوە لە پێناوی ڕاژەی حەجکردن بۆ مەککە ئەنجامدرا[3]. بەلاّم ڕواڵەتەکانی ئەم بزاڤە لە کاریگەریدا بۆسەر سیاسەتی عوسمانی لە ئاست عەشیرەتەکان کە بابەتی باسەکەی ئێمەیە، لەم تەوەرانەی خوارەوە ڕووندەکەینەوە:

---

[1] عمر فاروق یلماز: المصدر السابق، ص ص ١٢٧-١٢٨.

[2] هێڵی ئاسنیی حیجاز: پرۆژەیەکی گەورەو ستراتیژی و خەونی دێرینەی سوڵتان عەبدولحەمید بوو، ئەم هێڵە دیمەشقی بە ئەستەنبوڵەوە دەبەستەوە، ئامانجی پرۆژەکەش بەستنەوەی ناوچە جیاوازەکانی عوسمانی بوو بە ئەستەنبوڵ و دۆزینەوەی ئامرازێکی گواستنەوەی هاوچەرخانە کە سەرجەم حاجیان و موسڵمانانی ناوچەکە لێی سوودمەندبن، لەبارەی گرنگی ئاینی و ئابووری و سەربازی و هزری ئەم پرۆژەوە بڕوانە: محمد سهیل طقوش، تاریخ العثمانین من قیام الدولة الی الانقلاب علی الخلافة، دار النفائس، بیروت ٢٠٠٨، ص ص٤٨٨-٤٨٩. محمد حرب: سەرچاوەی پێشوو، ل ل١٦٤-١٧٢.

[3] ئیریك جەی زورجەر: مێژووی هاوچەرخی تورکیا، و. یاسین سەردەشتی، چاپخانەی سیڤار، سلیمانی ٢٠٠٩، ل١٣٨. محمد سهیل طقوش: المصدر السابق، ص٤٨٨.

## یەکەم:

## عوسمانییەکان و بنەماڵەی شێخانی تەریقەت

سۆفیزم لە دیارترین فاکتە بزوێنەرەکانی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەوڵەتی عوسمانی بوو، هەژموونی قووڵ و بەرفراوانی تەریقەتەکان لەسەر دەوڵەت و کۆمەڵگە تێکڕا سروشتێکی سۆفیگەرانەی تایبەتی بەکۆی ژیان بەخشیبوو، کە لە نەریت و ڕێورەسمەکاندا بە روونی ڕەنگیدابووەوە[1]. تەریقەتەکان بەگشتی لە سەردەمی عوسمانیدا خزمەتی گەورەیان پێشکەش بە دەوڵەت کردووە، هاوکارو یاریدەدەری (سوڵتان عەبدولحەمید)یش بوون لە جێبەجێکردنی سیاسەتی پانئیسلامیزمدا[2]. ئەمەش وایکرد لە رۆژگاری سوڵتانی نێوبراودا شێخەکانی تەریقەت پێگەو بایەخی تایبەتیان پێبدرێت، چونکە مسۆگەرکردنی پشتیوانی ئەوان و نزیکردنەوەیان لە دەوڵەت واتای مسۆگەرکردنی لایەنگرو مریدەکانیان لە خوێندکارانی قوتابخانە ئاینییەکان و تەنانەت خەڵکی ڕەشۆك دەگەیاند[3]. وێڕای ئەوە شێخانی تەریقەت دەیانتوانی لە ململانێکاندا ڕۆڵی نێوانکارو نێوبژیوان بگێڕن، کە

---

[1] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: جە عفەر عەلی: سۆفیزم و کاریگەری لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی گەلی کورددا، مەڵبەندی کوردۆلۆژی، چ١، سلێمانی ٢٠٠٨، ل٨٢، محمد زكي البرواري: الكرد و الدولة العثمانية، موقف علماء كردستان من الخلافة العثمانية فى عهد السلطان عبدالحميد الثاني، دار الزمان، ض١، دمشق ٢٠٠٩، ص٣٨٣

[2] عمر فاروق يلماز: المصدر السابق، ص٢٣٥.

[3] علي الوردي: لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث، ج٣، مطبعة الارشاد، بغداد ١٩٧٣، ص٢٤ ; حنا بطاطو، العراق. الطبقات الاجتماعية و الحركات الثورية من العهد العثماني حتى قيام الجمهورية، ت. عفيف الرزاز، الكتاب الاول، منشورات فرصاد، تهران ٢٠٠٥، ص١٩٩.

ئەوەش کێش‌و بەهای سیاسییان زێتردەکات[1]. لەم سۆنگەیەوە کارێکی سروشتی بوو (سوڵتان عەبدولحەمید) سیاسەتی کرانەوەو هاریکاری لەگەڵ ئەو سەرکردایەتییە تەقلیدییانە پەیڕەوبکات، کە لە دوای داڕووخانی میرایەتییەکانەوە لە تێکڕای کوردستان دەرکەوتن، لەوانە بنەماڵەی شێخانی تەریقەت کەتەنها لایەنێك بوون لەو رۆژگارەدا بتوانن خەڵکی لە دەوری خۆیان کۆبکەنەوەو ناوەندەکانی تەریقەت‌و تەکییەکان بکەن بە سەنتەرێکی گرنگی گەورەکردنی هێزو دەسەڵاتی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و ئابووری خۆیان[2]، لەوانە شێخانی شەمدینان، ئەوانەی توانیان لە سایەی شێخ عوبەیدوڵلادا دەست بەسەر هەرێمێکی فراواندا بگرن، کە پێشتر لەژێر دەسەڵاتی میرەکانی بۆتان‌و بادینان‌و هەکاری‌و ئەردەڵاندا بوون، هەروەها شێخەکانی بەرزنجی کە بەدوای میرەکانی باباندا هاتن‌و شێخەکانی بارزانیش کە دەسەڵات‌و پێگەی خۆیان بەسەر بەشەکانی میرنشینی هەکاری‌و بادینانـدا چەسپاند، شێخانی دیکە هەبوون کە لە رووی دەسەڵات‌و شکۆمەندی‌و رێزەوە لەوانیتر کەمتر نەبوون، لەوانە شێخە قادرییەکانی بریفکانی‌و نەقشبەندییەکانی بامەڕنێ لە ناوچەی بادینان[3].

لێرەوە لە چوارچێوەی سیاسەتی پان ئیسلامیزم‌و لەسەر بناغەی توندوتۆڵکردنی پەیوەندی لەگەڵ زاناو شێخانی تەریقەتە سۆفیگەرییەکان، سوڵتان عەبدولحەمید دوای بڵاوبوونەوەی نێوبانگی (حاجی کاکە ئەحمەدی شێخ) وەك مورشیدێکی تەریقەت، بانگهێشتیکرد بۆ ئەستەموول، بەڵام کاکە

---

[1] Maria T.Oshea. op. cit. p77.

[2] مارتن فان برۆنسەن: سەرچاوەی پێشوو، ب٢، ل ١٥٣-١٥٤; جەعفەر عەلی: سەرچاوەی پێشوو، ل٨٩.

[3] وەدیع جوەیدە: سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٠.

ئەحمەدی شێخ نەیتوانی بڕوات، بۆیە لە جێگەی خۆی سەید محەمەدی موفتی نارد[1]، وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکرد کاتێك جەنگی عوسمانی – روسی (١٨٧٧-١٨٧٨) هەڵگیرسا لەژێر ناوی جیهاددا (حاجی کاکە ئەحمەدی شێخ) هێزێکی گونجاوی لە موریدانو لایەنگرانی خۆی سازو ئامادەکردو بە سەرکردایەتی (شێخ سەعید)ی کوڕەزای ڕەوانەی جەنگەکە کرد، کە بێگومان دەتوانین بڵێین ئەمە یەکەم بەشداریکردنی شێخانی بەرزنجەیە لە چالاکی سیاسی، چالاکییەك کە پایەکەی لەسەر پێگەو نێوبانگی ئایینی وەستابوو، دواتریش ئەم بەشداریکردنە بووە هۆی بەرەودان بە دەسەڵاتی سیاسیو ئابووری بنەماڵەکە لە سلێمانیو دەوروبەری[2]، هەروەها پتەوکردنی پەیوەندییەکانی نێوانی خودی (شێخ سەعید)و (سوڵتان عەبدولحەمید) بە تایبەت پاش بانگهێشتکردنی بۆ ئەستەموول (١٩٠١)، لە ماوەی مانەوەیدا لەوێ، (سوڵتان عەبدولحەمید) وەك هەمیشە نەریتی نزیکبوونەوە لە شێخانی تەریقەتە سۆفیگەرییەکان، شێخی بە دەستو پێوەندەکانی خۆی ناساندو شیفرەی نهێنی تایبەتی خۆیشی پێدا، بۆئەوەی لە کاتی پێویستدا بتوانێت بەتەلگراف پەیوەندی پێوەبکات[3] ئەمەش بێگومان ڕادەی توندوتۆڵی پەیوەندییەکانی سوڵتانو بنەماڵەی ساداتی بەرزنجە نیشاندەدەن، هەر لەو چوارچێوەدا وەك لە سەرچاوەکاندا هاتووە، لەو ماوەیەدا گوایە یەکێك لە کوڕەکانی سوڵتان

---

[1] محەمەد ئەمین زەکی: تاریخی سلێمانی وە ولاتی، ل١٦٣.

[2] عثمان علي، المصدر السابق: ص١٨٧; عبدالرحمن ادريس صالَح البياتي: الشيخ محمود الحفيد البرزنجي و النفوذ البريطاني في كردستان العراق عام ١٩٢٥، ط١،دار الحكمة، لندن ٢٠٠٥، ص ٣٩.

[3] ڕەفیق حیلمی: یاداشت، چ٣، سلیمانی ٢٠٠٣، ل ل٣٣-٣٤ ; عثمان على، المصدر السابق، ص١٨٦.

عەبدولحەمید نەخۆش کەوتووەو بە نزاو پاڕانەوەی (شێخ سەعید) چاك بووەتەوە. وێڕای ئەوەی سوڵتان هەمیشە هەستی بە مەترسی هەڕەشەو کوشتن کردووە، بۆیە ئەو (گولەبەند)ەی هەڵگرتووە کە (شیخ سەعید) پێیبەخشیوە[1]، ڕێکەوت وابووە لە پەلامارێکی کوشتن ڕزگاری بووە، کە گروپێك ئەرمەنی لە میانەی تەقاندنەوەی بۆمبێکەوە لە ساڵی ١٩٠٥ دا ئەنجامیاندابوو، بەبڕوای سوڵتان بە هۆی (گوللەبەند)ەکەوە تیانەچووە[2]. بەهەرحاڵ (شێخ سەعید) چەند ساڵێك لە ئەستەنبوڵ مایەوە، لەو ماوەیەدا کاریگەریی زۆری لەسەر سوڵتان هەبووە[3]. ئەو کاریگەرییە بووە سەرچاوەی دەسەڵاتێکی سیاسی گەورە بۆی، نەك تەنها لە لیوای سلێمانی، بەڵکو لە تێکڕای ویلایەتی موسڵدا، بۆ وێنە لەو ماوەیەدا کە لە ئەستەنبوڵ بوو لەسەر داخوازی تایبەتی شێخ سەعید، سوڵتان لە (شێخ نوری)و (شێخ نوور محەمەد)ی ئامۆزای خۆشبوو[4]. هەر لەو ماوەیەدا توانی نازناوی پاشایەتی بۆ (حاجی محەمەد سابونچی) ئەندامی ئەنجومەنی سەرۆکایەتیی

[1] بە گوێرەی سەرچاوەی دیکە، پاش ئەوەی سوڵتان عەبدولحەمید (کاکە ئەحمەدی شێخ) بانگهێشت دەکات کە بۆ سەردانی بچێتە ئەستەنبوڵ، ناتوانێت بڕوات و (موفتی سلێمانی) لە جێگەی خۆی دەنێرێت، لەگەڵیشیدا گولەبەندێك و نوسراوێکی ئامۆژگاری بۆ ناردووە. بۆ زانیاری زیاتر لەمبارەوە بڕوانە: سي.جي. ادموندز: المصدر السابق، ص٧٤. درك كينان، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣.

[2] عثمان علي: المصدر السابق، ص١٨٧. محمد طاهر العمري، تاريخ مقدرات العراق السياسية، مج ٣، مطبعة دار السلام، بغداد ١٩٢٥، ص١١٨.

[3] مەیجەر سۆن: سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان، ل١٦٦.

[4] لەو ماوەدا هەردوو شێخی نێوبراو بە هۆی ناکۆکییەکانیانەوە لەگەڵ (حاجی ئاغای ئەترووشی) و دواتر ئاکامەکانی ئەو ناکۆکییە، لە لایەن دەسەڵاتدارانی عوسمانییەوە لە موسڵ ڕووبەڕووی گرتن و لێپرسینەوە بوونەوە. بۆ زیاتر بڕوانە:
Gökhan Çetinsaya: op. cit, p85.

شارەوانیی موسڵ وەربگرێت، لە لیوای سلێمانیشدا راپۆرتەکانی ئینگلیزو عوسمانی وەك (حاكمێكی بیٚ ركابەر بۆ ماوەیەكی زۆر) ئامارژەیان بۆ كردووە. هاوكات لەگەڵ ئەم پێگە سیاسییەدا هێزی ئابووری بنەماڵەی سادات هەمیشە لە هەڵكشاندا بووە، چونكە سوڵتان بەرامبەر پشتگیریان لە دەسەڵاتەكەی بە شێوەی بەخشش گوندی كشتوكاڵی سەر بەدەوڵەتی پێدەدان[1]. كۆی ئەو گوندانەی شێخانو بنەماڵەی سادات بوون بە خاوەنی بەگوێرەی سەرچاوەیەك گەیشتۆتە (٦٠) گوند[2]، وێڕای ئەوە سوڵتان یارمەتییەكی ساڵانەی بۆ تەكیەی قادری تەرخانكرد، بۆ (شێخ سەعید)یش مانگانەیەك بە بڕی (٤٠) هەزار لیرەی زێڕ، زەویو موڵكانەكانیشی لە باجو سەرانە بەخشرابوون، بەم چەشنە بنەماڵەی سادات بوون بە بنەماڵەیەكی ئەرستۆكرات، سەرباری ئەوەی بۆخۆیان بنەماڵەیەكی ئایینی گەورەبوون[3].

---

[1] عثمان علي: المصدر السابق، ص١٨٧.

[2] محمد طاهر العمري: المصدر السابق، ص١١٩

[3] عثمان علي: المصدر السابق، ص١٨٧.

دووەم:

## سوارە نانیزامی حەمیدیو عەشیرەتەکان

یەکێك لە بەرچاوترین رووداوەکانی سەردەمی سوڵتان عەبدولحمید دامەزراندنی یەکەکانی سوارەی نانیزامی بوو لە رۆڵەی عەشیرەتەکانی کورد لە سەرەتای ساڵی (١٨٩٠)دا، کە وەك رێزێك لە سوڵتانی نێوبراو ناوی سوارەی حەمیدی لێنرا [1]. پێکهاتەی ئەم لەشکرە پەلاماردەرە، کە لە بنەڕەتدا بەشێك بوو لە سیاسەتی پان ئیسلامیستی سوڵتان[2]، لەسەر شێوەی سوپای کەزاخی رووسی دامەزرابوو[3]. چونکە سەرکردایەتی سەربازی ئەو وڵاتە لە چوارچێوەی پێکەوەنانی گروپگەلی غەیرە نیزامی لە کوردەکانو سوودوەرگرتن لە تواناکانیان لە ساڵی ١٨٧٨ دا (١٣) گروپی سوارەی پێکەوەنا کە هەریەکەیان لە (١٠٠ ) جەنگاوەر پێکهاتبوون[4] و ناویان لێنابوون (لەشکری قۆزاقی)[5].

---

[1] جلیلی جلیل وآخرون: الحركة الكردية فی العصر الحديث، ت. عبدي حاجي، دار الرازي، ط١، بيروت، ١٩٩٢، ص٤٣.

[2] کەمال بورکای، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٢٠.

[3] ئیریك جەی زۆرجەر، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٥.

[4] خالید موراد چەتوێیڤ، مێژووی پەیوەندییەکانی رووسیا و کورد: لێکۆڵینەوە و بەڵگەنامە، و. نەجاتی عەبدوڵلا، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٦٤.

[5] عەبدوڵڵا عەلیاوەیی، سەرچاوەی پێشوو، ل١١٩.

بێگومان سوود وەرگرتن لە توانای کوردان لە رووسیا مێژوویەکی لەوە دێرین تری هەیەو دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی(١٧٢٥)، لەو کاتە بەدواوە رووسەکان بۆ جەنگە زۆر و زەوەندەکانیان لەگەڵ ئێران و عوسمانی بەشێوەی جۆراوجۆر سوودیان لە توانای عەشیرەتەکانی کورد وەرگرتووە. لەوانە جەنگەکانی (١٨٠٤-١٨١٣ و ١٨٢٦-١٨٢٨) لەگەڵ ئێران و جەنگەکانی (١٨٢٨-١٨٢٩ و ١٨٥٣-١٨٥٦ و ١٨٧٧-١٨٧٨) لەگەڵ

وەك لـە سەرچاوەیەكی بەڵگەنامەیـدا هـاتووە، بیرۆكـەی دامەزرانـدنی ئـەم لەشكرە دوای كۆنگرەی بەرلین[1] لە ساڵی (١٨٧٩)دا بووە، لـەو ماوەیـەدا لـە چوارچـێوەی نامەگۆڕینـەوەكانی سـوڵتان عەبدولحەمیـدی دووەمـدا لەگـەڵ ڕۆژئاوا، سەبارەت بە بەڕێوەچوونی ڕەوتی ریفۆرمەكان لە ناوچەی (ئەرمەن) نـشینەكاندا، سـەرقاڵبوون بـە درووسـتكردنی لەشـكرێك لـە كوردەكـان كـە خودی دەوڵەت خۆی سەرپەرشتیدەكات، ئاماژەی بۆكراوە، گوایـە سـوڵتانی نێوبراو ویستوویەتی ڕۆژئاواییەكان قایلبكات كە تەنیا بەو تاكتیكە دەكرێ بەر بە شۆڕشەكانی كورد بگیرێ[2].

عوسمانییەكان پاش شۆڕشی شێخ عوبێدوڵڵای نـەهری، لـە چوارچێوەی پێداچوونەوە بـە سیاسـەتەكانیانداو گـۆڕینی فـۆرمی مامەڵـەكردنی خۆیـان

---

عوسمانییەكان. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: خالید موراد چەتوێیف: سەرچاوەی پێشوو، ل ل١٣-٦٩ ; فاضل رسول: كردستان والسیاسة السوفیتیة في الشرق الاوسط، ت. غسان نعسان، سلیمانیة ٢٠٠٨، ص ص١٢٧-١٣٠.

[1] نـاڕەزایی وڵاتـە ئەوروپییـەكان لـە بڕیارەكـانی كـۆنگرەی سـان ئیـستیڤانۆ (ئـازاری ١٨٧٨) سەبارەت بە وڵاتانی بەلقان، زەمینەی بۆ بەستنی كۆنگرەی بـەرلین (حوزەیرانی ١٨٧٨) خۆشـكرد، بـەو مەبەسـتەی لـە كـۆنگرەی نوێـدا وڵاتـانی ئـەوروپی (بریتانیـا، ڕووسیا، ئەڵمانیا، نەمسا) بەتایبـەت، بتـوانن سـەرلەنوێ پەیوەندییـەكانی خۆیـان لەگـەڵ دەوڵەتی عوسمانی ڕوو لە شكستدا ڕێكبخەنەوە. بەگوێرەی مادەی (٦١) ئـەم كۆنگرەیـە، دەبوو دوڵەتی عوسمانی بەبێ دواكەوتن چاكسازی و ڕیفۆرم لەو هەرێمانەدا ئەنجامبدات كە ئەرمەنەكانی تێدا دەژین و لە پەلامارەكانی كورد و چەركەس بیانپارێزێ. بۆ زیـاتر لـە بارەوەو خوێندنەوەی تەواوی خاڵەكانی پەیماننامەكە بڕوانە: محمـد فریـد بك المحـامي: المصدر السابق، ص ص٦٧٩-٦٩٧.

[2] كەمال بوركای: سەرچاوەی پێشوو، ل٤٢٠.

لەگـەڵ کـورد[1]، فـەرمانیان ئاڕاسـتەی دەسـەڵاتدارە لۆکاڵییـەکان کـرد کـە خۆیـان لـە سـەرۆك عەشـیرەتەکان نزیکبکەنـەوە، پاشـتر ئـەم سیاسـەتە لـە چالاکیەکانی (ئەدهەم پاشا)ی والی (هەکاری)دا بەزەقی ڕەنگیدابۆوە، کاتێك بۆ نزیکبوونەوە لە سەرۆك عەشیرەتە رەوەندەکانی کورد هەموو ڕیگەکانی تـاقیکردەوە، لەوانـە سـازدانی کۆبوونـەوەی نهێنـی لەگـەڵ کەسـایەتییە بەرچاوەکانیان و دابەشـکردنی چـەکێکی زۆر بەسـەریاندا، کـە هەڵبـەت بـەم کارە نیازخوازبووە لەشکرێکی گەورە لە کوردەکان درووستبکات، بۆ ئـەوەی هەمیشە لەژێر فەرمانـەکانی حکومەتدا بن، دواتـر بەپێشنیاری ئـەم والییـە، (نـورەڵلا)ی خزمـی شـێخ عوبێـدوڵلا کرایـە (سـەرۆکی کـوردان)ی ناوچـەی هەکاری و بەڕێوبەری ئەو خوێندنگەی کە بڕیاربوو لە (باشقەلاٌ) بکرێتەوە[2].

بەلاٌم سیاسەتی نوێی (سوڵتان عەبدولحەمید) لـە دەیـەی کۆتـایی سـەدەی نۆزدەهەمدا بەتـەواوی ڕەهەندەکانییـەوە دەرکـەوت[3] کاتێك لـە سـەرەتاکانی ئـەو دەیـەدا لـە رۆژنامەکانـدا ڕاگەیانـدنێکی فـەرمی دەوڵـەت سـەبارەت بـە دامەزراندنی تیپە سەربازییە کوردییەکان بلاٌوکرایەوە[4].

هاوکـات لەگـەڵ بلاٌوکردنـەوەی ئـەو ڕاگەیاندنـەدا، بـۆ ڕاکێـشانی هەرچـی زۆرتری عەشیرەتی کوردە بۆ نێـو ریزەکـانی لەشـکری نـوێ، خـودی سـوڵتان لەگەڵ زانایانی ئاینیدا بانگەوازێکی تایبەتیان ئاراستەی کوردەکان کرد، تا

---

[1] پ. ی. ئەڤیر یانوف: کورد لـە جـەنگی روسیا لەگـەڵ ئیران و تورکیادا، و.ئەفراسـیاو هەورامی، مەکتەبی بیرو هۆشیاری، سلیمانی ٢٠٠٤، ل ل٢٥٣-٢٥٥.

[2] ن. ا. خالفين: المصدر السابق، ص٩٨.

[3] المصدر نفسه، ص٩٨.

[4] م. س. لازاريف: المسالة الكردية، ص٩٠.

داوایـان لێبکـەن بـچنە نێـو ریزەکـانی لەشـکری نـوێ، کـە بـەبڕوای ئـەوان ئامـــانجی پارێزگاریکردنـــە لـــە ئیـــسلامو کەرامـــەتی موســـڵمانانو بەشداریکردنیان لە ریزەکانیدا جیهادێکی پیرۆزە، هەر لەو چوارچێوەدا لە زستانی ساڵی (١٨٩١) لە ئەستەنبوڵ کۆنگرەیەکی بەرفراوان بۆ کوردان بەسترا، زانایانی ئاینیو سەرۆك عەشیرەتەکانو پیاوماقوڵان ئامادەی بوون، سـوڵتان دیـداری لەگـەڵ سـازدانو ئەرکـەکانیان بەرامبـەر بـە بیروبـاوەری ئیسلامو وڵاتەکەیان کە لەژێر هەڕەشەی دوژمناندا بوو، وەبیرهێنانەوە[١] .

ئامادەبووانی ئەم کۆنگرەیە نزیکەی (چوار هەفتە) لە ئەستەنبوڵ مانەوە، لـەو ماوەیـەدا دەوڵـەت بـە گـەرمی پێـشوازیو میوانـداری لێکـردن، خـودی سوڵتان لەو ماوەیەدا دووجار چاوی بە ئامادەبووان کەوت، بەو ئومێدەی کوردەکان بەتەواوەتی بەلای خۆیدا ڕابکێشێتو بیانباتە نێو ڕیزەکانی ئەم لەشـکرەوە پاداشـتو نیـشانەو دیـاری بـە نرخـی پێبەخـشین، ئـەوانیش بەڵێنیان دا بە سوڵتان، بە گوێرەی توانا تیپ پێکبهێنن، هەندێك لەوانە زێـــدەڕۆییانکردو لـــە گەڕانـــەوەدا بـــۆ ناوچـــەکانی خۆیـــان نـــەیانتوانی بەڵێنەکانیان جێبەجێبکەن[٢] .

بـۆ هانـدانی سـەرۆك عەشـیرەتەکانی کـوردو قـایلبوون بـە بیرۆکـەی پێکهێنانی سوارەی حەمیدی، لێپرسراوە گەورەکانی دەوڵەت چەندین جار

---

(5) Steven Duguid:" The Politics of Unity. The Hamidian Policy in Eastern Anatolia",
Middle Eastern Studies, No,9, 1973, pp. 137-140. لە: عثمان علي، المصدر السابق، ص١٢٣.

(٢) پ. ی. ئـەڤیر یـانوف: سەرچـاوەی پێـشوو ل ل ٢٦٢-٢٦٣ ; کـەمال بورکـای: سەرچاوەی پێشوو، ل ل٤٢٤-٢٢٦.

سـەردانی ناوچـە کوردنـشینەکانیان کـرد[1] ئەوانەشـی کـە دەچـوونە ریزەکانییـەوە، دەوڵـەت دەسـتکەوتی جۆراوجـۆری پێـشکەش دەکـردن، بـۆ وێنە باجی (دەیەك و گـودە) نـەبێت لـە زۆرێك لـە باجەکانی تـر دەبەخشران، هـەروەها کێڵگـەی بەکارنـەهێنراوی مـیری پێـدەدان[2] و لـە کـردەی سەربازگیریش دەبەخشران[3]، وێڕای چاونوقاندن لـە زۆرێك لـەو جـەردەیی و تالأنکارییانـەی کـە پێـی هەڵدەسـتان[4]، بەشـداربووانی سـوارەی حەمیـدی ملکەچی دادگای مەدەنی نەدەبوون، تەنها بۆ ڕووداوگـەلێکی بەرچاو ئەوسا دادگـای بـەرزی نیزامـی دەیتـوانی سـزایان بەسـەردا بسەپێنی[5]، بـۆ تونـد گرێـدانی رۆڵـەکانی سـەرۆك عەشـیرەتەکانیش بـە خەلافـەت و دەوڵـەتی عوسمانییەوە و بۆ ئەوەی لەژێر چاودێری و سەرپەرشتی (سـەرای)دا بن، لـە ئەسـتەنبوڵ سـاڵی (١٨٩٢) خوێندنگـەی عەشـیرەتی (عـشیرت مکتبلـی) بـۆ منداڵانی سەرۆك عەشیرەتەکان کردەوە[6].

---

[1] کمـال مظهـر احمـد: کردسـتان فـی سـنوات الحـرب العالمیـة الاولی، ت. محمـد المـلا عبدالکریم، ط٢، بغداد ١٩٨٤، ص٨٦.

[2] عثمان علي: المصدر السابق، ص١٢٣.

[3] دیڤید مەکداول: سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٦.

[4] مارتن فان برۆنسەن: سەرچاوەی پێشوو،ب٢، ل ٨٠ ; کەمال بۆرقای، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٢٧.

[5] کمال بورکای: سەرچاوەی پێشوو، ل٤٢٦.بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی دەستکەوتەکانی سوارەی حەمیدی بڕوانە: ماجد محمد زاخویی: الفرسان الحمیدیة، ط١، مطبعة خانی، اربیل ٢٠٠٨، ص ص٨٧-٩٠.

[6] عمر فاروق یلماز: المصدر السابق، ص٢٧٢. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەم خوێندگانە بڕوانە:
Bayram Kodaman, Sultan II. Abdulhamid Devri Doğu Anadolu Politikasi, Ankara, 1987, ss. 67-80.

سەبارەت بە ئامانجە سیاسی و سەربازییەکانی (سوڵتان عەبدولحەمید) لە پێکهێنانیدا بۆ (سوارەی حەمیدی)، ڕاڤەی جیاوازو دژبەیەك کراوە، کەسانێك بڕوایان وایە ئەم کارە بەرهەمی سیاسەتێکە بۆ تێکشکاندنی هێزی کوردو سوودوەرگرتن لە ناکۆکی نێوانیان و بۆ هێنانەدی بارودۆخێك کە عەشیرەتەکانی تێدا زۆر بەئەستەم بتوانن دژ بە حکومەت یەکبکەون[1]، کەسانی تر دەڵێن بۆ بە یەدەککردنی هێزی عەشیرەتەکانە وەك لەشکرێکی ئامادە، و هێشتنەوەی هەژموونی سوڵتان لەسەریان و لێدانی بزاڤی نەتەوەیی گەلانی ناتورك لەوانە خودی کوردەکان هاتۆتەکایە[2]. هەندێکیش وەك کاردانەوە یا زەبر وەشاندن لە بزاڤی جوداخوازانەی ئەرمەنییەکان تەماشایان کردووە[3] یا دوورتر لەوە وەك بەربەستێکی سەربازی تۆکمە بەرامبەر بە (رووس) و ئامرازێکی دوژمنکارانە دژ بە (ئێران)[4]، هەندێك پاڵنەری دامەزراندنی ئەم یەکانە دەگێڕنەوە بۆ گومانی سوڵتان لە سوپای

---

لە ١٨٩٠/٩/٢١دا فەرمان بۆ کردنەوەی ئەو خوێندنگانە دەرچوو، بەڵام دەستپێکردنی خوێندن لە ساڵی ئاماژەبۆکراودا بوو لەسەرەوە. بۆ زیاتر لەبارەی ئەم خویندنگەیە بڕوانە: عەبدوڵڵا عەلیاوەیی، سەرچاوەی پێشوو، ل ل١٢٤–١٢٧; ماجد محمد زاخویی: المصدر السابق، ص٩١–٩٦.

[1]مێجەر نوئێل: سەرنجدانێکی بارودۆخی کورد، ئا. عبدالرقیب یوسف، و. سدیق سالح، چاپخانەی ئۆفسێتی سەرکەوتن، سلێمانی ٢٠٠١، ل٥٠.

[2] کمال مظهر احمد: المصدر السابق، ص٨٤ ; مارتن فان برۆنسەن: سەرچاوەی پێشوو، ب١، ل٨٠.

[3]عمر فاروق یلماز: المصدر السابق، ص٢٧٥ ; موجتەبا بورزووی: بارودۆخی سیاسی کوردستان ١٨٨٠–١٩٤٦، و.نازناز محەمەد عبدالقادر و ئەوانی تر، دەزگای موکریانی، چ١، هەولیر٢٠٠٥، ل ل ١٢٣–١٢٤ ; ارشاك سافراستیان، المصدر السابق، ص١٣٢ ; ئێریك جەی زۆرجەر: سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٥.

[4] جلیل جلیلي وآخرون، الحرکة الکردیة، ص٤٤.

نیزامی، كه پێی وابوو سوارەكان دەبنە ڕەگەزێكی دژ یا بەرەنگار بۆ هەر بزاڤێك كە سوپا پێی هەڵبستی"[1] یا دەیگێڕنەوە بۆ هەستكردنی سوڵتان بە ڕاستگۆییو دڵسۆزی كوردو ئەو توانا بەهێزەی پێی دەناسرێتەوە[2]

خودی (سوڵتان عەبدولحەمید)یش بۆخۆی لە یاداشتەكانیدا بەم چەشنە ئاماژەی بۆ پاڵنەرە (ئاشكراكانی) ئەم تیپانە كردووە كە دەڵێت: **"ئەگەر لەگەڵ ڕووس دا جەنگ بەرپابێت، ئەوا تیپە چاك ڕاهێنراوەكانی كوردان دەتوانن خزمەتی گەورە پێشكەش بكەن، وێڕای بیرۆكەی گوێڕایەڵبوون كە پێی گۆشدەكراین، سوودێكی زۆرمان پێدەبەخشێت، ئەو پلە سەربازییەش كە داومانە بە سەرۆكەكانیان دەبێتە مایەی خۆهەڵكێشانو شانازییان، ئیدی بۆ هەندێك دیسپلینو لایەندۆستی هەوڵو كۆشش دەكەن"**[3].

وێڕای ڕاستی ئەو بۆچوونو ڕاڤەكردنە جیاوازانەی سەرەوە، بەڵام وەك یەكێك لە توێژەرەكان دەڵێت: دەبێت لەو بناغەوە لەهۆی دامەزراندنی سوارەی حەمیدی بڕواندرێت، وەكو دەرفەتبەخشینێك بە كوردو هاندانیان بۆ پشتگیریكردنی خەلیفەو وەك ئامرازێكی كاریگەریش تا لە ڕێگەیەوە خۆرهەلأتی ئەنادۆل لە ژێر هەژموونی پۆلیسیدا بمێنێتەوە[4].یا بۆ ڕێكخستنی عەشیرەتە نائارامو سەركێشەكان بە شێویەكی باشو كەڵك

(3) Stanford Shaw and Ezal K. Shaw, History of The Ottoman Empire and Modern Turkey, vol.2, Cambridg, 1977, p. 426. لەجرجیس فتح الله: المصدر السابق، ص ٥٠ .

(٢) عثمان علي: المصدر السابق، ص١٢٥.

(٣) مذكراتي السياسية (١٨٩١-١٩٠٩)، ت. مؤسسة الرسالة، ط٢، بيروت ١٩٧٩، ص٣٣.

(٤) مارتن فان برۆنسەن: سەرچاوەی پێشوو، ب٢، ل٨٠.

وەرگرتن لە توانا جەنگییەکانیانو درووستکردنی جۆرێك لە پەیوەندیی مەعنەوی لە نێوان خۆیو کوردەکاندا[1].

ڕەنگە تێبینییەکانی (ك.ب.ئیڤانۆف-K.B.Ivanov) کۆنسوڵی رووس لە (بەسرە) لە ماوەی دامەزراندنی سوارەی حەمیدی دا، بۆ تێگەیشتن لە سیاسەتی ڕاستەقینەی تورك لە ئاست عەشیرەتەکانی کورد بەگشتی کۆمەکی زیاترمان بکات، کە دەڵێت:"کاتێك کوردان ملکەچبوون ڕەتدەکەنەوە، ئەوا تورکەکان پێش هەموو شتێك ئەو پرۆسەیە بە خودی کوردان خۆیان دەسپێرن، بێگومان بە تیپەکان یان عەشیرەتی تر، لەدۆخێکدا ئەمانیش ڕەتیان بکردایەتەوە، ئەوا تورکەکان ناکۆکییە خوێناوییە یەکالأنەکراوەکانی نێوان عەشرەتەکان زیندوو دەکەنەوە، یا ناکۆکی لە نێوان گەورەکانیاندا دروستدەکەن لە میانی بەخشینی پلەی بەرز بە یەکێکیانو نزمڕاگرتنی پلەو پێگەی ئەوانیدیکە، ئەگەر ئەوانە بێسوود بوو، ئەوا نائارامانە چاوەڕێی وەرزی زستان دەکەن، ئەوکات سەرماو سۆڵە کوردەکان ناچاردەکات لە پاوانو لەوەڕگاکانەوە بگەڕێنەوە نێو گوندەکانیان، ئەوجا تورکەکان بێ هیچ ناڕەحەتییەك سزای خۆیانیان بەسەردا دەسەپێنن..."[2].

---

[1] حەسەن ئەرفەع: کوردەکان لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی و سیاسی، و. سامان عەبدوڵلا، چ١، سلێمانی ٢٠٠٩، ل ل٥٣-٥٤.

[2] م. س. لازاریف: المسالة الکردیة، ص ص٩٢-٩٣.

بواری بەشداریپێکردنی جەنگی یۆنان (١٨٩٧)[١] و کوشتاری ئەرمەنی لێدەرکەیت، سیاسەتی نوێی سوڵتانو دەسەلاّتدارانی تورك لە پێکهێنانیاندا بۆ سوارەکانی حەمیدی، بەو جۆرەی چاوەڕواندەکرا بەرێوەنەچوو[٢]، سەرباری ئەو پروپاگەندە زۆرەی کە لەسەر دڵرفێنیو خۆشی بارودۆخی ڕاژەکردن لە ریزەکانی حەمیدییەدا دەکرا، تەنها بەشێکی کەم لە عەشیرەتەکانی کورد لە چاو ئەو هەموو عەشیرەتە زۆرانەی کوردستان، بە هانای بانگەوازەکەی سوڵتانەوە چوون،کە لە کۆی (٥١) عەشیرەتی گەورەی کورد، تەنها ناوی (١٣)یان هاتووە کە بەشداریان کردووە، [٣].

عەشیرەتەکانی کوردستانی باشوور وەك سەرچاوەکان ئاماژەی بۆ دەکەن لە ئاست پێکهێنانی سوارەی حەمیدی دا نەرێ بووەو زۆرینەی هەرە زۆریان بەشداریان تێیدا نەکردووە. لەم ڕووەوە (پ.ی. ئەڤیر یانوف) ئاماژە بۆ ئەوەدەکات لە ویلایەتی موسڵدا کە چەندین عەشیرەتی مەزنی تێدا دەژی، لەوانە (جاف)و ڕەواندوزیەکان، (پشدەر) هیچیان بەشداری حەمیدی یان نەکردووەو تەواوی هەوڵەکانی عوسمانی بۆ ڕاکێشانیان شکستی هێناوە[٤]. کە بێگومان ئەوانە عەشیرەتگەلێکی سنووری بوونو بەهۆی

---

[١] ارشاك سافراستيان: المصدر السابق، ص١٣٣ ; م. س. لازاريف: المسالة الكردية، ص ٩٦.

[٢] جليلي جليل وآخرون: المصدر السابق، ص ص٤٥-٤٧ ; كمال مظهر احمد: المصدر السابق، ص٨٨.

[٣]پ. ی. ئەڤیر یانوف: سەرچاوەی پێشوو، ل ل ٢٦٨-٢٦٩ ; جليلي جليل وآخرون: المصدر السابق، ص ص٤٤; ن.لازاريف، مێژووی کوردستان، ل٢٥٩.

[٤] پ. ی. ئەڤیر یانوف: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧٢.

ڕەوەنـدی بوونیـان‌و چـوونیان بـۆ نێـو خـاکی ئێـران لـە کـاتی گـەرمیان‌و کوێـستان کردنـدا، لــە بنــچینەوە بیرۆکــەی چــوونە نێــو پێکهاتــەکانی (حەمیـدی)یـان ڕەتکردۆتـەوە[1]. پێدەچێت ئـەم ڕەتکردنەوەیـە هۆکارێـك بووبێــت بــۆ تێکــچوونی پەیوەندییــەکانی نێــوان ســەرۆکی جــاف‌و دەســەڵاتدارانی عوسمـانی لـە سـاڵی (١٨٩٢)دا، چـونکە لـەو سـاڵەدا وەك (لازاریــف) هێمــای بــۆ کــردووە ســەرۆکی عەشــیرەتی نێــوبراو لەگــەڵ دەســەڵاتدارانی عوسمانیـدا ڕێکنەکـەوتووە بۆیـە بـەو هۆیـەوە پەیوەنـدی هەردوولا تێکچووە [2].

(زەکـــی پاشـــا)ی ســـەرکردەی لـــە شـــکری چـــواری عوسمـــانی‌و سەرپەرشتیاری سوارەکان، لە (١٦ی نیسانی ١٨٩٢)دا لـە برووسکەیەك بۆ بابیعـالی، عەشـیرەتەکانی کوردسـتانی باشـوور دەخاتـە دەرەوەی سـنووری دەسەڵات‌و چالاکی لەشکرەکەی، جاری ئەوەش لێدەدات، ئەو عەشیرەتانەی کەوتوونەتە دەوروبەری موسڵ‌و جێ بایەخی سوڵتانن، بۆ بەشداریکردن لـە پێکهاتـەکانی حەمیدی خواستـی خۆیـان پیشانداوە، بەڵام ئەوانـە دەکەونـە دەرەوەی سنووری ڕاژەی خۆی‌و لەشکرەکەیەوە‌و هەر هەوڵ‌و تەقەللایەك بۆ پێکهێنانی تیپەکانی سوارە، لەوانە وەك لە بروسـکەکەدا هـاتووە، پێدەچێت ببێتــە سەرچــاوەی نــاڕەزایی‌و نیگــەرانی فەرمانــدە ســەربازییەکانی ئــەو سـنوورە، وێـڕای ئـەوەی **"خـەڵکی ناوچـەکە دژی دامەزرانـدنی پێکهاتـەی سوارەن‌و بێدەنگ نابن، پێناچێ ئێمەش بەهۆی دووری ناوچەکەوە بتوانین بەر بە نائارامییەکانیان بگرین، هەڵبەتە دەزانن زاتی ئەوەم نەکرد تیپەکانی**

---

[1] كمال مظهر احمد: المصدر السابق، ص٨٨.

[2] بڕوانە: المسألة الكردية، ص ١٢٢.

**حەمیدی لەوانە پێکبهێنم، لەم سۆنگەوە تیپەکانی حەمیدییەم لە پشدەرییەکانو عەشیرەتەکانی قەزای رانیە پێکنەهێنا"[1].**

بەگوێرەی (م.س.لازاریف) بارودۆخی هەندێك لە عەشیرەتەکانی کوردستانی باشوور لە ئاستێکی پشت بەخۆبەستوو و دابڕانی وادابوون لەگەڵ عوسمانییەکان، کە لە رووی پراکتیکیەوە لە دەوڵەتۆکەیەك دەچوون لەنێو دەوڵەتێکدا، لە ئاکامدا رەتکردنەوەی پێکهاتەکانی (سوارەی حەمیدی) لە ناوچەکانیاندا بوو بە بیانوویەك بۆ راپەڕین دژ بەهەژموونو دەسەلاتی عوسمانی، کە بەهێزترینیان ئەوەبوو لە (هاوینی ساڵی ١٨٩١) روویدا، پاشتر حکومەت ناچاربوو داواکاری خەڵکی راپەڕیوو جێبەجێبکات، کە بریتیبوون لە: بەخشینی راپەڕیوەکانو دانپێدانان بە دەستکەوتەکانی سەرۆك عەشیرەتەکانداو برینەوەی مووچە بۆیانو رێگەدان بە هەڵگرتنی چەكو تاپۆکردنی زەویو زاری نوێ لەسەر خەڵکی[2].

دوای پەلامارو فشارە یەك لە دوای یەکەکانی عوسمانی لە ساڵانی (١٨٩٢-١٨٩٣)، بۆ سەر ئێزیدیەکانی شەنگارو شێخان، بۆ ناچارکردنیان بۆ بوون بە موسڵمان[3]، لە ئاکامدا یەکێك لە سەرۆکەکانیان بە ناوی (حەسەن گەنجۆ) موسڵمان دەبێتو لەگەڵ پیاوەکانی عەشیرەتەکەیدا دەچێتە نێو ریزەکانی (سوارەی حەمیدی)یەوە، زۆری پێناچێت دەبێتە دەستە ڕاستی (ئیبراهیم پاشا)ی سەرۆکی بەهێزی عەشیرەتی میللی، کە

---

[1] وەرگیراوە لە: خلیل علي مراد (ترجمة)، مختارات من کتاب الموصل و کرکوك في الوثائق العثمانیة، بنکەی ژین، السلیمانیة ٢٠٠٥، ص٥٩

[2] م. س. لازاریف: المسالة الکردیة، ص ص٩٣-٩٤.

[3] لەبڕگەی دادێ بەدرێژی باس لەم هێرشانە دەکەین.

پێگەیەکی شایستەی لای سوڵتان عەبدولحەمید هەبووە[1]. لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی هەرەزۆری عەشیرەتەکانی ئێزیدی نەچوونە نێو پێکهاتەکانی (سوارەی حەمیدی)یەوە، چونکە ئەوەیان رەتکردەوە ببنە موسڵمان، کە یەکێك بوو لە مەرجەکان بۆ چوونە نێو پێکهاتەی نێوبراو.

لە چوارچێوەی بەشداریکردنی عەشیرەتەکانی کورددا لە پێکهاتەکانی سوارەی حەمیدیدا، سەرچاوەکان ئاماژە بۆ پێشوازیو بەشداری سەرۆکەکانی ئەترووشی دەکەن لە پێکهاتەی نێوبراودا[2]. لەم ڕووەوە سەرچاوەیەك ژمارەی تیپو ئەو لیوایە دەستنیشاندەکات، کە بەشداربووانی ئەم عەشیرەتە لە ڕیزەکانیدا ڕاژەیان کردووە. هێزەکانی سوارەی حەمیدی لە حەوت لیوا پێکهاتبوو، هەر لیوایەك بریتی بوو لە چەند تیپێك/فەوجێك، کە لەسەر بنچینەی دابەشبوونی عەشیرەتیی ڕێکخرابوو، هەر تیپێك ژمارەی تایبەت بەخۆی هەبوو، سەبارەت بە بەشداربوونی عەشیرەتی ئەترووشی، لە تیپی ژمارە (٥٠) ی سەر بە لیوای شەشەم بوون، کە بریتیبوو لە (٥) تیپ لە عەشیرەتەکانی: میللی، کاراکچی Karakci، تەی (طي)، میرانو ئەترووشی[3].

---

[1] جون س. كيست: المصدر السابق، ص٣١١. ماجد محمد زاخويي: المصدر السابق، ص ص٩٩-١٠٠.

[2] ستيڤن همسلي لونگريگ: العراق الحديث من سنة ١٩٠٠الى سنة ١٩٥٠، ج١، ت. سليم طه التكريتي،ط١، بغداد ١٩٨٨، ص٣٩.

[3] Bayram Kodaman: A.G.E, ss. 53-55.

## سێیەم:
## سیاسەتی عوسمانی بەرامبەر کۆمەڵە عەشیرەتە ئێزیدییەکان

یەکێك لە خاڵە ناکۆك‌و پڕ کێشەکانی نێوان دەسەلاَتدارانی عوسمانی‌و ئێزیدییەکان وەك پێشتر هێمامان بۆکرد مەسەلەی سەربازگیری بوو، (سەلجوق ئەکشین سومل) هێما بۆ ئەوەدەکات کە بەهۆی رەتکردنەوەی ڕاژەی سەربازییەوە لەنێو سوپای عوسمانیدا، حکومەت هەر لە ساڵی (١٨٤٢)وە گوشاری خستبووە سەر ئێزیدییەکان، بەلاَم (ستراتفورد کاننك)ی باڵوێزی بریتانیا لە ئەستەنبوڵ لە کێشەکەیاندا بووە نێوانکار، لە کۆتایدا حکومەتی عوسمانی لە ڕاژەی سەربازی بەخشینی[1]، ئەوەبوو جارێکی دیکە بۆ ئەنجامدانی راژەی سەربازی لە سەردەمی مەدحەت پاشادا یەخەیان گرتنەوە، ئەم جارەش لەسەر داخوازی کۆمەڵێك لە سەرۆکەکانی ئێزیدی، سەبارەت بە بەشدارینەکرنیان لەریزەکانی سوپادا، عوسمانییەکان لە ساڵی (١٨٧٥)دا ڕەزامەندیان پیشانداو بڕیاردرا لە بری ئەوە (بەدەل) بدەن. بەلاَم ئەم دۆخە درێژەی نەبوو، چونکە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم راژەنەکردنی سەربازیی ئێزیدیەکانی وەك بیدعە دەبینی، لای فەرماندە بالاَکانی سوپاش کارێکی نائاسایی بوو، بۆیە حکومەت بڕیاریدا وەك هەر هاولاَتییەکی ئاسایی ڕێساکانی سەربازگیری ناچاری ئێزیدیەکانیش بگرێتەوە، بڕیاری نوێ لە هەرێمەکانی دیکەی عوسمانی وەك :(حەلەب، دیاربەکر، وان) بێ هیچ گرفتێك جێبەجێکرا، بەلاَم جێبەجێکردنی لەنێو ئێزیدیەکانی کوردستانی باشووردا قورسبوو[2].

---

[1] Selçuk Akşin Somel: the Modernization of Puplic Education in Ottoman Empire 1839-1908, Leiden-Brill, 2001, p. 231.

[2] جون س. گیست: المصدر السابق، ص ص٢٩٥-٢٩٦.

دەسەڵاتدارانی عوسمانی بۆ ناچارکردنی ئێزیدییەکان بۆ بوون بە ئیسلام و سەپاندنی سەربازگیری بە سەریاندا، سیاسەتی ناکۆك و دژبەیەکی پەیڕەوکردووە، سەرەتا سیاسەتی توندوتیژیی و چاوشکاندنیان گرتەبەر، کاتێك بۆ ئەو مەبەستە حکومەتی ناوەندی (ئەیوب بەگ)ی سەرکردەو هێزە تایبەتەکەی نارده (شەنگال)، کە لە ئاکامدا بە ڕەفتارو تاوانە نامرۆڤانەکانی کۆمەڵە عەشیرەتەکانی ئێزیدی هەراسان و جاڕس کرد، لەم ڕووەوە زاناو شوێنەوارناسی بریتانی (وولیس بەدج) لە ئەیلولی ساڵی (١٨٩٠ز)دا بە بینین و بیستن، تاوانەکانی نێوبراوی تێبینیکردووە، قایمقامی (سنجار)یش پێشنیاری بۆ کردووە کە هەوڵ و کۆشش بخاتەگەڕ بۆ ئەوەی باڵوێزەکانی ئەوروپا و حکومەتی عوسمانی و والی موسڵ لەو تاوانانە ئاگاداربکاتەوە، ئەمیش بۆ ئەو مەبەستە نوسراوی تایبەتی ناردووە، بۆ (ویلیەم وایت)ی سەفیری بریتانی و پێشنیاری بۆ کردووە، کە ڕۆژنامەکانی بریتانیا و پەیامنێری ڕۆژنامەی تایمز لە ئەستەنبوڵ لەو تاوانانە ئاگاداربکرێنەوە[1].

وەك لە بەڵگەنامەیەکی عوسمانیشدا دەردەکەوێت، کە دەگەڕێتەوە سەرەتاکانی ساڵی (١٨٩١)، دەسەڵاتدارانی عوسمانی بۆ بڵاوکردنەوەی ڕێنماییەکانی ئاینی ئیسلام و موسڵمانکردنی کۆمەڵە عەشیرەتەکانی

---

[1] پاش مانگێك لە ڕێگەی کۆنسوڵی بریتانییەوە لە بەغداد بروسکەیەك بۆ (وولیس بەدج) هاتەوە، تیایدا هاتووە: "ئینگلتەرا وڵاتێکی دۆستی تورکیایە، هەروەها تورکیا وڵاتێکی دۆستی ئینگلتەرایە، پێویستە لەسەر هەرکەسێك کە لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی وا دۆستدا ڕاژەدەکات، هێرش نەکاتە سەر سیاسەتەکەی بەرامبەر ئێزیدییەکان". بۆ زیاتر بڕوانە: سیرو لیس بدج: رحلات الی العراق، ت. فؤاد جمیل، ج٢، ط١، مطبعة شفیق، بغداد ١٩٦٨، ص ص١١١-١١٥.

ئێزیدی، ئەمجارەیان پەنایان بۆ مامۆستایانو بانگهێشتکاران بردووە[١]، هاوکات بەم کارە وەك هەوڵێك بۆ ناچارکردنی ئێزیدیەکان بۆ گەڕانەوە بۆ نێو ئایینی ئیسلام[٢]، سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم لە بەهاری ساڵی (١٣٠٩ك/١٨٩١)دا نێردراوێك کە پێکهاتبوو لە ئەفسەرێكو دوو زانای ئاینی بە نامەیەکەوە ناردە لای سەرۆکی ئێزیدییەکان، ناوەڕۆکی نامەکە ئەوەبوو کە ئێزیدییەکان لە بنچینەدا موسڵمان بوونو پێویستە بگەڕێنەوە ناو ئایینی ئیسلام[٣]. نێردراوەکە بۆ موسڵمان بوونیان هیچی پێنەکرا، ئێزیدییەکانی ئاگادارکردەوە کە بۆ مانەوە لەسەر ئایینی خۆیان، پێویستە بێ دواکەوتن باجی بەدەل سەربازی دوو ساڵی پێشووتر کە نەدرابوو بدەن. بۆ ئەنجامدانی ئەم ڕاژەیە دەستبەجێ دەستەیەك سەرباز ئامادەبکەن بۆ هەرچی زووتر جێبەجێکردنی ئەم فەرمانە، کۆمەڵێك لە سەرۆکە ئێزیدییەکان بەندکران، بەڵام پاشتر بە کەفالەت ئازادکردن[٤].

هەر لەو چوارچێوەدا بۆ ئاگادارکردنەوەیان لە بڕیاری کۆتایی حکومەت لە بارەیانەوە، لە تەمووزی ساڵی (١٨٩١)دا، میرزا بەگو عەلی بەگی برایو چەندین کەسایەتی تری شێخانو گوندەکانی دەورووبەری بانگهێشتکران بۆ موسڵ، والی داوای لێکردن بۆ خۆیان لە بری ڕۆڵەکانی عەشیرەتەکانیان ڕاژەی سەربازی پێشکەش بکەن، ناڕەزایی دەربڕینیان بێ سوود بوو، لە

---

(1) T.C, Arşivler Genel Mudurluğu: Osmanli Arşive Dairesi, Musol-Kerkukile ilgili Arşiv Belgelri 1525-1919(Ankara-1993), s.532

(٢) بۆچوونی فەرمی دەوڵەتی عوسمانی وابوو، کە ئێزیدییەکان لە بنچینەدا موسڵمان بوون و هەڵگەڕاونەتەوە.

(٣) نسیبة عبدالعزیز عبدالله الحاج علاوي: الادارة العثمانیة فی الموصل١٨٧٩-١٩٠٨، رسالة ماجستیر، کلیة الآداب-جامعة الموصل، ٢٠٠٢، ص٢٧١.

(٤) جون س. گیست: المصدر السابق، ص٢٩٥.

ئاکامدا لە کۆی (٣٨) سەرۆك‌و کەسایەتی کە ئامادەببوون، (٢٢)یان کە میرزا بەگ‌و عەلی بەگی برای لە نێوانیاندا بوو، لەژێر فشاردا ناچارکران جلی سەربازی لەبەرکەن[١]، هاوکات لەو ماوەیەدا دەسەڵاتدارانی عوسمانی بۆ قایلکردنییان جۆرێك لە نەرم‌و نیانیان خستەڕوو، کاتێك بۆ ئامۆژگاریکردنیان (حاجی مەسعوود بەگ)ی موفتی دیاربەکری نارده لایان، بەڵام ئاکامێکی نەبوو[٢].

پاش ئەوەی نەتوانرا بە خوایشت یا بە ئاشتی، ئێزیدییەکان لە ئاینی خۆیان وەرگێڕدرێن، لە موسڵەوە نوسراو ئاراستەی حکومەت کرا، تیایدا ناردنی سەرکردەیەکی سوپای بە دەسەڵاتێکی نائاساییەوە بۆ سەرکوتکردنی ئێزیدییە (یاخیبووەکان) بە پێویست زانراوە[٣].

هاوکات بەم مەسەلەیە ناکۆکی‌و نائارامی عەشیرەتەکان لە ناوچەکەدا بە فراوانی سەری هەڵدابوو، لەوانە نائارامییەکانی هەمەوەندو پشدەر لە (کوردستانی باشوور)و شەممەر لە بیابانی سوریا، بۆ سەرکوتکردنی ئەوان‌و بە موسڵمانکردنی ئێزیدییەکان، حکومەتی عوسمانی لەسەر پێشنیاری (جەواد پاشا)ی سەدری ئەعزەم، فەریق (عومەر وەهبی پاشا)ی وەك فەرمانەدەی هێزێکی چاکساز (قوة اصلاحية) لە کۆتایی حوزەیرانی

---

[١] المصدر نفسه، ص٣٠٠ ; نسيبة عبدالعزيز الحاج علاوي: المصدر السابق، ص٢٧٢.

[٢] عبدالرزاق الحسني: اليزيديون فی حاضرهم و ماضيهم، ص١٢٤. عەبدوڵڵا عەلیاوەیی: سەرچاوەی پێشوو، ل٨١.

[٣] المصدر نفسه ، ص١٢٤.

(١٨٩٢ز) دەستنیشانکرد، ئەوە بوو نێوبراو بۆ راپەڕاندنی ئەرکەکانی لە سەرەتای مانگی تەمموزی هەمان ساڵدا گەیشتە موسڵ[1].

فەریق عومەر وەهبی پاشا دوای ماوەیەك لە هاتنی (١٩ی ئاب)، سەرۆك‌و کەسایەتییەکانی ئێزیدی بانگهێشتکرد بۆ موسڵ، لەگەڵ ئەوەی هۆکاری بانگهێشتکردنەکەیان نەدەزانی، بەڵام بە ناچاری‌و لە ترساندا ژمارەیەکی زۆر لە سەرۆك‌و کەسایەتییەکانیان ئامادەبوون، پاش کۆکردنەوەیان داوای لێکردن دەست لە ئاینی خۆیان هەڵبگرن، بەڵام هیچ کەسێکیان ئامادەییان نیشان نەدا، بۆیە فەرمانی لێدانیانی دەرکرد، سەربازەکان بە توندی فەرمانەکەیان جێبەجێکرد، ئەم رووداوە بێجگە لە برینداربوونی ژمارەیەکیان، (سێ) لە کەسایەتییەکانی ئێزیدی تێدا بوون بە قوربانی، هەرچی ئەوانی دیکە بوون لەژێر هەڕەشەو فشاردا بە ناچاری موسڵمانبوونی خۆیان نیشاندا[2]. فەریق عومەر وەهبی بە پەرۆشەوە بە برووسکەیەك هەواڵی موسڵمانبوونی (٢٠) هەزار ئێزیدی گەیاندە (سوڵتان عەبدولحەمید)و نازناوی (پاشا)ی بەخشیە میرزا بەگ‌و (بادی بەگ)ی[3] برای‌و میرێکی دیکەی ئێزیدی. لەگەڵ مانگانەیەکدا کە بڕەکەی (٢٠٠٠) قرشی عوسمانی بوو، هەرچی (عەلی بەگی برای میرزا بەگ)ە بە هۆی

---

[1] Gökhan Çetinsaya: Op.Cit, p79 ; نسيبة عبدالعزيز الحاج علاوي: المصدر السابق، ص٢٧٢.

[2] سليمان الصائغ: تاريخ الموصل، ج١، القاهره ١٩٢٣، ص ص٣١٨-٣١٩ ; عبدالرزاق الحسني: المصدر السابق، ص ١٤٣، عباس العزاوي: تاريخ العراق بين احتلالين، ج٨، ص ص١٤٣-١٤٤.

[3] الزوراء، العدد ١٥٢٢ فى ٣ صفر سنه (١٣١٠هـ-١٨٩٢ز). وەرگیراوە لە: عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين، ج٨، ص١٤٤.

موسڵمان نەبوونیەوە خرایە بەندیخانە[1]. بەڵام زۆری پێنەچوو ئێزیدیەکان لەگەڵ گەڕانەوەیاندا بۆ ناوچەکانی خۆیان چوونەوە سەر ئایینی خۆیان[2]. فەریق عومەر وەهبی وەك بڵێی لە کارەکەیدا سەرکەوتوو بووە، بۆ وتنەوەی وانەکانی ئاینی چەندین مامۆستای بۆ نێو ئێزیدیەکان هەنارد، ئەوانیش بواریان نەدان و دەریان کردن[3].

فەریق عومەر وەهبی لە (١٥ی ئەیلوول) بە پرۆسەیەکی نوێی سەربازی بۆ سەر گوندەکانی شێخان وەڵامی هەڵوێستی ئێزیدییەکانی دایەوە، کە بە سەرکردایەتی کوڕە گەنجەکەی (عاصم بەگ)و هاوڕێیەکەی جێبەجێکرا، لەم لەشکرکێشیەدا تاوانێکی زۆر لە هەتکردن، کوشتن، دزیو تاڵانکردنی سەروەتو سامانی خەڵكو سووتاندن ئەنجام درا، لەوانە سووتاندنی چەندین گوند بە (دانیشتوانەکانیەوە)، هەروەها سوتاندنی ئارامگەی شێخ عادی. وێڕای چوونەسەر شوێنە پیرۆزەکانی تری ئێزیدیو داگیرکردنی بنکەی میرەکەیان لە باعەدرە، چەندین هێمای ئاینی ئێزیدیان دزیو ناردیان بۆ (بەغداد)، لەوانە: پەیکەری تاووس برۆنزی، گاڵۆکێکی برۆنزی، پەرداخێکی برۆنزا، چەندین کەرەستەی پیرۆزی دیکەی لەو بابەتە[4]. ئەم

---

[1] جون س. گیست: المصدر السابق، ص٣٠٠ ; عدنان فرحان زيان: المصدر السابق، ص ص١٥٠-١٥١ ; نسيبة عبدالعزيز الحاج علاوي: المصدر السابق، ص٢٨٠.

[2] صديق الدملوجي: اليزيدية، ص٤٧٢.

[3] سليمان الصائغ، المصدر السابق، ج١، القاهره، ١٩٢٣، ص ص٣١٨-٣١٩ .

[4] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: جون س. گیست: المصدر السابق، ص٣٠٠ ; سليمان الصائغ: المصدر السابق، ص٣١٩ ; سعيد الديوه جي: اليزيدية (الموصل ١٩٧٢)، ص ص٢٢٨-٢٢٩. ئەم کەرەستە پیرۆزانەی ئێزیدیەکان لە یەکێك لە گەنجینەکانی سەر بە سوپای شەشەمی عوسمانیدا لە بەغداد پارێزرا، تا دوای کودەتای ١٩٠٨، ئەوجا

لەشكركێشیە (بەعشیقەو بەحزانی)یشی گرتەوە، وێڕای وێرانكردنی چەندین پەرستگەی پیرۆز لەو ناوچانەو قەدەغەكردنی وشەی (ئێزیدی)، سەربازەكانی عوسمانی كراسی گوندنشینەكانیان لە پێشەوە دادڕی، گوایە بۆ ئەوەی لە كراسی عەرەبەكان بچێت[1]. بۆ زیاتر ریسواكردنیشیان عوسمانییەكان ساڵی (١٨٩٣) خوێندنگەیەكی ئاینییان لە پەرستگای شێخ عودەی لە لالش كردەوەو (شێخ ئەمین ئەفەندی قەرەداغی)یان وەك مامۆستایەك لەسەر دامەزراند[2].

دوای ئەو رووداوانە، ئێزیدییەكان بۆ پاراستنیان پەنایان بۆ كۆنسۆلی فەرەنسی برد، بۆ ئەو مەبەستە نووسراوێكیان پێشكەش بە كۆنسۆلی فەرەنسی كرد لە موسڵ[3]. ئیدی دوای ئەوەی هەواڵی ستەمكارییەكان لە ڕێگەی نوێنەری وڵاتە ئەوروپییەكانەوە گەیشتە دەرباری عوسمانییەكان، لە كانونی یەكەمی ساڵی (١٨٩٢) عومەر وەهبی پاشا لایەن سوڵتان عەبدولحەمیدەوە بە برووسكەیەك لەكارخراو ناچار بە مانەوە كرا، تا بۆ لێكۆڵینەوە لە راستییەكان كۆمیتەیەك رەوانەی ناوچەكە دەكرێت، لە ئابی ساڵی (١٨٩٣)دا كۆمیتەی دەربار ڕاپۆرتی خۆی بەرزكردەوە، تیایدا (عومەر وەهبی پاشا)ی تاوانباركرد بەوەی سنووری دەسەڵاتی خۆی تێپەڕاندووە،

---

درایەوە ئێزیدییەكان. بڕوانە: جاسم محمد حسن: العراق فی العهد الحمیدی١٨٧٦-١٩٠٩، رسالة ماجستیر-كلیة الآداب-جامعة بغداد-١٩٧٥، ص١٠٣.

[1] جون س. گیست: المصدر السابق، ص٣٠٦.

[2] عبدالرزاق الحسني: الیزیدیون فی حاضرهم و ماضیهم، ص ١٤٣; كامران عبدالصمد الدوسكي، المصدر السابق، ص ص١١٥-١١٦ ; سعید خدیدة : (السلطان عبدالحمید الثاني وسیاسته تجاه الكرد الایزیدیة في الموصل)، مجلة لالش، العدد ١٢، دهوك ٢٠٠٠، ص٩٣.

[3] Selçuk Akşin Somel, Op.Cit, p. 231.

بۆیە لە ماوەی دوو هەفتەدا خانەنشین کرا[1]. هەواڵی لادانی عومەر وەهبی پاشا لەنێو ئێزیدییەکانی شەنگاردا بە ئاسوودەییەکی گەورەوە وەرگیرا، خەڵکی ستایشی (سوڵتان عەبدولحەمید)یان دەکردو بڕوایان وابوو پاش ئەوەی لە کردەوەکانی پەستبووە لە کاری خستووە[2].

دوای لادانی عومەر وەهبی پاشا، ئێزیدییەکان هەندێ هەنگاوی تۆڵەسەندنەوەیان دژ بەو عەشیرەتانە لە هەڵمەتەکەی تیمی نێوبراودا بەشداریانکردبوو دەستپێکرد، لەو نێوانەشدا پەلاماری کاروانە بازرگانییەکانیان دەدا، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی حکومەت ساڵی ١٨٩٥ بۆ سەرکوتکردنیان سەرلەنوێ هێزێك ڕەوانە بکات، لە ئاکامدا زیانێکی زۆریان لێکەوت[3].

سووربوونی حکومەتی عوسمانی لەسەر جێبەجێکردنی راژەی ناچاریو رەتکردنەوەی ئێزیدییەکان بۆ ئەو مەسەلەیە گرژیو ئاڵۆزییەکانی نێوان هەردوو لای درێژەپێدا، بەلاّم لە کۆتاییدا حکومەتی عوسمانی بۆ ئاسایکردنەوەی بارودۆخەکەو پەیوەندییەکانی لەگەڵ عەشیرەتەکانی ئێزیدیدا، هەندێ هەنگاوی نا، لەوانە قایلبوونیان بە روونکردنەوکانی والی موسڵ نوری پاشا (١٨٩٢-١٨٩٦)، کەپێشنیاری کردبوو چیتر دەست لە ئێزیدیەکان نەدرێو وەك جاران لە بری راژەی سەربازی بەدەل پارەیان لێوەربگیرێت، هەروەها والی نێوبراو ئەو خوێندنگە ئاینییەی هەڵوەشاندەوە، کە پێشتر عوسمانییەکان لە پەرستگای لالش دایمەزراندبوو[4].

---

[1] Gökhan Çetinsaya, Op.Cit, p.80.

[2] صديق الدملوجي: اليزيدية، ص٥٠٩ ;
جاسم محمد حسن: المصدر السابق،ص١٤٦.

[3] المصدر نفسه، ص٥١٠.

[4] جاسم محمد حسن، المصدر السابق، ص ١٤٦.

وێـڕای ئـەوەی ئـەم هەنگاوانـە بـەس نـەبوون بـۆ ئاسـاییکردنەوەی ئـەو گــرژیو ئاڵۆزییـــەی دەســـەڵاتدارانی عوسمـــانی بۆخۆیـــان بەرپرســـبوون لەدروستکردنیدا، لـە هەمانکاتـدا سیاسـەتێکی نـوێی دەوڵـەتی عوسمیانیـان بەرجەستە نەدەکرد، ئەمەش لەو هەڵویستانەدا دەردەکەوێت بەرامبەر (میرزا بەگ)ی میری ئێزیدی دەیاننواند، کـە کۆچـی دوایـی لـە سـاڵ (١٨٩٩) لـەژێر هەڕەشـەو بەهانـە جۆراجۆرەکـانی دەسـەڵاتدارانی عوسمانیـدا بـوو، لەوانـە: ناچـارکردنی بــە نوێکردنـــەوەی دڵــسۆزی بــۆ ئیــسلام، ئەگــەرنا مووچــە مانگانەکەی دەبڕدرێت، یا ناچارکردنی خودی خۆیو براکانی بۆ چوون بۆ شەنگال، بۆ کۆکردنەوەی باجەکان لە خەڵك. پاش ئەویش کە (عەلی بـەگ)ی برای ڕێگەدرا بە هەوڵو کۆششی کۆنسوڵی بریتانی لە تاراوگە بگەڕێتەوە لـە ساڵی (١٨٩٨)، کاتێك وەك میرێك بۆ ئێزیدییـەکان دانـرا، دەسـەڵاتیان تـەنها لە کاروبارە ئاینییەکاندا سنووردارکرد[1].

---

[1] جون س. گیست، المصدر السابق، ص ص ٣١٣-٣١٤.

## باسی سێیەم/
## هەڵوێستی عوسمانیەکان لە ناکۆکی نێوان عەشیرەتەکان

لە بەشی یەکەمی باسەکەدا ئاماژەمان بۆ هەڵوەشاندنەوەی میرایەتییە لۆکاڵیەکانی کوردو نەهێشتنی فەرمانڕەوایی میرەکان کرد بەدەستی عوسمانییەکان لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەم کردو وتمان ئەو گۆڕانە بنەڕەتییە لە سرووشتی سەرکردایەتی کورددا کۆمەڵگەی کوردی زیاتر لەبەریەك هەڵوەشاندەوە، چونکە ئیدارەی نوێ مۆرکێکی لاوازو پڕ گەندەڵی و بەرتیلخۆری هەبوو، ئاماژەمان بۆ ئەوەش کرد کە لەگەڵ ئەو شێوازە پڕ زەبروزەنگاوییەی عوسمانییەکان لە فەرمانڕەوایکردندا پیادەیان دەکرد، بەڵام نەیاندەتوانی بە کردارەکی ناوچەکانی کورد بهێنێتە نێو دەزگاکانی فەرمانڕەوایی تورکەوە، کە ئەمە بووە هۆی بێئاگایی عوسمانییەکان لە دۆخی ئیداری و سیاسی کوردو دەرکەوتنی جۆرێك لە بۆشایی ئەمنی لە ناوچەکەدا، لە ئاکامیشدا سەرهەڵدان و بلاوبوونەوەی نائارامی و گرژی و ناکۆکییە عەشیرەتییەکان، کە زۆر بە ئاشکرا لەملاو ئەولای کوردستان بەرچاو دەکەوتن، بە تایبەتیش دوای بڵاوبوونەوەی چەك بە گشتی و تفەنگی مارتینی بەتایبەتی، دواتریش پرسی ناکۆکی عەشیرەتیی بوو بە یەکێك لەو پرسە گرنگانەی لە دوو بەندی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا دەسەڵاتدارانی عوسمانی بەدەستییەوە تووشبوبوون.

عوسمانییەکان بۆ بەرەنگاربوونەوەی ناکۆکی و نائارامییە عەشیرەتییەکان، هەڵوێست و سیاسەتی جۆراوجۆریان گرتەبەر، لە ئاست هەندێکیاندا سیاسەتێکی پڕ زەبروزەنگ و دوژمنکارانەی پەیڕەودەکرد، یا

دەبوونە تەرەفگیری لایەنێك لە لایەنە ناكۆكەكان، كەچی لە ئاست هەندێكی تریانــدا چــاویان دەنوقانــد، یــا زۆر درەنــگ وەخــت دوای ئــاڵۆزبوونی ناكۆكییەكان ئاوڕی لێدەدایەوەو لایەنە ناكۆكەكانی لە ڕێگەی پێكهێنانی دەستە یا كۆمسیۆنێكەوە ئاشتدەكردەوە. لێرەدا هەوڵدەدەین بە چەند وێنەیەك هەندێ لەو نائارامیی و ناكۆكییانە بخەینەڕوو.

## - ناكۆكی نێوان زەنگەنەو هەمەوەند:

بە هۆی كوژرانی سەرۆكێكی هەمەوەندەوە بە دەستی زەنگەنە، ساڵی (١٨٧٨) ئەو دوو عەشیرەتە لە خانی ئیبراهیم خانچی دەستەویەخە بوونەوە، زەنگەنە كە تێكشكان، چوونە گوندی شێخ لەنگەر لە نێوان قەزای كەلارو ناحیەی كوڵەجۆ، دوای ئەوەی هەمەوەند شوێنیان كەوتن، زەنگەنە ناچاربوون داوای كۆمەك لە حكومەت بكەن[1].

حكومەتیش بۆ لێدانی هەمەوەند لە هەلێك دەگەڕا، هەروەها بۆ زیاتر قووڵكردنەوەی ناكۆكی نێوان ئەم عەشیرەتە سەركێشەو عەشیرەتەكانی دیكە دروستكردنی گرژیو ئاڵۆزیی درێژخایەن لە نێوانیانداو كەڵك لێوەرگرتنی لە ئایندەدا، ڕاستەوخۆ كەوتە پشتگیریكردنی زەنگەنە. بۆ ئەم مەبەستە هێزێك كە بریتیبوو لە: بەتالیونێك پیادە، (٦٠) سوارە، (٤٠) هێستر سوارو(٢) تۆپی سووكی چیایی بە سەركردایەتی (عەبدوڵلا ئەفەندی خانەقی)و لای خۆیەوە قایمقامی كفری (سەلاحیە) بە (٧٥٠) سوارو(٨٠) ژەندرمەی هێستر سوارەوە بە پشتیوانی عەشیرەتەكانی زەندو پالانیو چەند سوارەیەكی تاڵەبانیو باجەلان، پێكڕا لە شێخ لەنگەر كۆبوونەوە،

---

[1] محەممەد ئەمین زەكی: تاریخی سلێمانی وە ولاتی، ل١٤٠.

بەرئەنجام لە پەلامارێکی ناوەختدا هەمەوەندەکان سەرجەم ئەو هێزانەی تێکشکاند[1]. بەڵام حکومەت لەبری چارەسەر هێزی زیاتری کۆکردەوە کە بریتی بوو لە: (٨) بەتالیونی سوارەو یەك فەوجو نیو سوارەو یەك بەتالیۆن سوارەیی چیایی بە فەرماندەی (ئەدهەم پاشا) ڕەوانەی ناوچەکەی کرد، لە پێکدادانێکدا لە گۆپتەپپە (نزیك ناحیەی ئاغجەلەر)، هەمەوەندەکان گەمارۆی هێزەکەیان داو خودی ژێنێراڵ (ئەدهەم پاشا)یان بە دیلی گرت، بەرئەنجام دوای ئازادکردنی نێوبراو، هەمەوەندەکان لەگەڵ ماڵو منداڵەکانیان کشانەوە بۆ زەهاو لە نێو خاکی ئێران[2].

## -ناکۆکی نێوان لقی شاتریو پەلی سەرەکی جاف:

لە ساڵی (١٨٨٠) بە هۆی ناکۆکییەك لقێکی شاترییەکانی جاف بەسەرۆکایەتی (عەزیز شاوەیس)، (محەمەد پاشا)ی سەرۆکی لقەکانی (جاف)یان لە چیمەنی برایم سەمین نزیك کفری کوشت[3]. پاش ئەم ڕووداوە شاترییەکان هەڵاتنو پەنایان بردە بەر هەمەوەندەکان، کە ئەوکات لەژێر سەرکردایەتی جوامێری بنەماڵەی بەگزادەی هەمەوەنددا بوو، کاتێك فراکسیۆنی سەرەکی جافەکان داوایان لە هەمەوەند کرد شاتریەکانیان بەدەستەوە بدەن، داواکەیان رەتکرایەوە، بەرئەنجام لەنێوان جافو هەمەوەنددا نزیك گل (نزیك قادر کەرەم) شەڕێك بەرپابوو، جاف تێیدا

---

[1] هنری فيلد: المصدر السابق، ص٥٣.

[2]مێجەر ئی. بی. سون: چەند سەرنجێك دەربارەی...، ل ل٥٥-٥٦.

[3]بۆ زانینیی وردەکارییەکانی ئەم ناکۆکییە بڕوانە: حەسەن فەهمی جاف: سەرچاوەی پێشو، ٤١-٤٣. حەسەن جاف: "باوردتر لە رووداوە مێژووییەکان بکۆڵینەوە"، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژ. ١١٦ بەغداد، کانوونی یەکەم ١٩٨٧، ل ١٢٠.

شـكان[1]. لـەم ناكۆكییـەدا عوسمانییـەكان بـۆ دژایـەتیكردنی هەمەوەنـد پـشتگیری (جـاف)یـان كـرد[2] بـۆ ئـەو مەبەسـتە تـەقی پاشـای والی بەغـداد (١٨٨٠-١٨٨٧) سـوپایەكی بـۆ هاوكاریـان نـارد، بـەڵام دوای دوو مـانگ مانـەوە لـە ناوچـەكە هیـچیان پێنـەكرا، چـونكە شـاترییەكان و پێـشتریش هەمەوەنـد لـە سـنووری دەسـەڵاتی ئێرانـدا لـە (زەهـاو) جێگیربـوون[3]. جێـی تێبینـە هاوكـاریكردنی كاربەدەسـتانی عوسمـانی بـۆ عەشـیرەتی جـاف، لـە سـونگەی ئـەو گـرژیو ئاڵۆزییـە دێرینـەدا بـوو، كـە لەگـەڵ هەمەوەندەكانـدا هـەیانبوو، وێـڕای جێبـەجێكردنی ئامانجـەكانی دەوڵـەت كـە خـۆی لـە سیاسـەتی (پەرتكـەو زاڵبـە) دەبینییـەوە، كـە بـۆ پیـادەكردنی لـە بەرامبـەر عەشیرەتەكاندا، هەمیشە ناكۆكییەكانی دەقۆستەوە.

## -ناكۆكی نێوان بەرزنجییەكان و تاڵەبانییەكان:

وەك لـە ڕاپـۆرتێكی ئاسایـشی نـاوخۆیی هـەردوو ویلایـەتی بەغـدادو مووسـڵدا دەردەكـەوێت، كـە لـە (تـشرینی یەكـەمی ١٨٨٦)دا بـۆ حكومـەتی عوسمـانی بەرزكراوەتـەوە، لـە دەوروبـەری كـەركوك نـاكۆكی لـە نێـوان بەرزنجەییـەكان و تاڵەبانییەكانـدا سـەریهەڵداوە[4]، بـەگوێرەی ڕاپـۆرتێكی

---

[1] مێجەر ئی. بی. سون: چەند سەرنجێك دەربارەی...، ل٥٧.
بە گوێرەی گێڕانەوەی (كەریم بەگی فەتاح بەگ) پاش مانگێك لە ئامادەكاری وهێز كۆكردنەوەو دواكەوتنی تاوانباران، لەشكری جاف و هەمەوەند و شاترییەكانی كەرەم وەیسی لە "داڵەهۆ" كەوتنە شەڕەوە، لە ئاكامدا جافەكان تۆڵەی خۆیان سەندەوە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە تاریخی جاف، ل ل١٨٢-١٨٤.

[2] محمد زكي البرواري: المصدر السابق، ص٢٤٠.

[3] مێجەر ئی. بی. سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی...، ل٥٧ ; محەممەد ئەمین زەكی: تاریخی سلێمانی...، ل١٤٢.

[4] بڕوانە: دەقی راپۆرتەكە لە: خلیل علي مراد: المصدر السابق، ص٢٩.

(ئیسماعیل حەقی)ی کاربەدەستی چاکسازی کەرکوك، کە ساڵی دواتر (١٨٨٧) بەرزکراوەتە بۆ دەربار، هۆکاری ناکۆکی نێوان ئەم دوو بنەماڵە ئاینییە کوشتنی (عەبدولسەمەد تاڵەبانی) بووە بەدەستی بەرزنجەییەکان[١]. وێڕای دەستگیرکردنی (شێخ سەعید)و هاوڕێ دەستێوەگلاوەکانی لە لایەن دەسەلأتدارانی ویلایەتەوە (موسڵ)، بەلأم بەرزنجەییەکان بەردەوامبوون لە هێرشکردن بۆسەر تاڵەبانییەکان، لە کاتێکدا شێخ سەعیدو هاوڕێکانی هەوڵی ئازادبوونیان دەدا، (شێخ حەسەن) بە (٥٠٠) کەسەوە هێرشی کردە سەر (شێخ مەعروف) لە کەرکوك[٢].

وەك دەردەکەوێت، سوڵتان عەبدولحەمید ڕاوێژکارەکانی کە ئاگاداری وردەکارییەکانی ئەم دۆسیە بوون، خواستیان نەبوو هەڵوێستی توند لەم دوو بنەماڵە وەربگیرێت کە لە رووی ئاینییەوە کاریگەربوون، بەتایبەتیش بەرامبەر بنەماڵەی بەرزنجەییەکان کە پێگەیەکی تایبەتیان لای سوڵتان هەبوو، لەهەمان کاتیشدا بە جددی لە کێشەکەیان نەڕوانیو چارەسەرێکی گونجاوو بەپەلەیان بۆ نەدۆزییەوە[٣].

وەك لە بەڵگەنامەکاندا دەردەکەوێت، دوای ئاڵۆزبوونی کێشەکەو سەرهەڵدانەوەی ناکۆکییەکە لە ساڵی١٨٨٧ بابیعالی ڕای خۆی گۆڕیو کۆمیتەیەکی بە سەرۆکایەتی "ئیسماعیل حەقی پاشا" پێکهێناو ڕەوانەی کەرکوکی کرد، لەسەر ئەو بناغەیەی نێوبراو ئاگاداری بارودۆخی ناوچەکەو خەڵکەکەیەتی، ئاگاداریش کرایەوە لەگەڵ بەرزنجەییەکاندا بە هۆی ئەوەی

---

[١] المصدر نفسه، ص٣٨.

[٢] Gökhan Çetinsaya: Op.Cit, p76.

[٣] Ibid, pp76-77.

بنەماڵەیەکی بێگەردن (سلالة طاهرة) لەسەر بنەمای ماف و دادپەروەری تەواوەتی مامەڵە بکرێن و ئەم مەسەلەیە رەچاوبکات[1]، پاش گەیشتنیشی بۆ سزادانی تاوانبارەکان دادگایەکی سەربازی بەسەرۆکایەتی خۆی پێکبهێنێت[2]. بەرەنجام وەك لە ڕاپۆرتەکەیدا دەردەکەوێت کە بۆ حکومەتی عوسمانی بەرزکردۆتەوە، نێوبراو بە هۆی نائارامی ناوچەکەوە لەگەڵ گەیشتنیدا باری نائاسایی(الادارة العرفية) ڕاگەیاندووە، دوای لێکۆڵینەوەو پشکنینی کێشەکەو دەرکەوتنی ڕاستییەکان، بۆ بنەبڕکردنی کێشەکە، ئەوەی بەچارەسەر زانیوە تەنها ئەوانە سزابدرێن کە لە بناغەدا دەستیان لە ناکۆکی نێوان هەردوو بنەماڵەکەدا هەبووە، لەم سۆنگەوە دادگاکەی لەسەر کوشتنی (عەبدولسەمەد تاڵەبانی) بڕیاری (سێ) ساڵ بەندکردن بەکاری قورسەوە بۆ (سێ) کەس لە بەرزنجەییەکان دەرکرد. بە هۆی تێوەگلانیان لە پێکدادان و تەقەکردندا، هەمان سزای بۆ (دوو) کەس لە بەرزنجەییەکان و چواریتر لە تاڵەبانییەکان دەرکرد[3].

## -نائارامییەکانی هەمەوەند:

لە دوای ناکۆکی لەگەڵ جافەکاندا بەهۆی شاترییەکانی (کەرەم وەیسی)یەوە، هەمەوەندەکان بە سەرۆکایەتی جوامێر ئاغا ناوەندی دەسەڵاتی خۆیان گواستەوە بۆ قەسری شیرین[4]. (ظل السلطان)ی کوڕی ناسرەددین شای ئێران کەجێگری باوکی بوو لە ئەسفەهان، پێی باشبوو

---

[1]بڕوانە: دەقی ڕاپۆرتی ئاسایشی ناوخۆیی هەردوو ویلایەتی بەغداد و موسڵ و پەراوێزەکەی لە: خليل علي مراد ;المصدر السابق، ص ص٣٠-٣٢.

[2]بڕوانە: کۆنووس و بڕیاری ئەنجومەنی تایبەت، المصدر نفسه، ص ص٣٤.

[3] خليل على مراد: المصدر السابق، ص٣٨.

[4] میجەر ئی. بی.سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی....، ل٥٧.

ئاغـای نێـوبراو بکاتـە حـاکمی زەهـاو[1]، هەڵبەتـە بـۆ ئـەوەی وەك کـارتێکی فشار دژ بە دەوڵەتی عوسمانی بەکاریان بهێنێت، بـە تایبـەت لـەو ماوەیـەدا پەیوەندییـەکانی ئـەو دوو دەوڵەتـە (عوسمـانی–ئێرانـی) هەمیـشە لەسـەر ناوچە کوردییەکان شڵەژاو و ئاڵۆزبوو[2].

هەمەوەندەکان چی ئەوانەی لە سنووری دەوڵەتی عوسمانیدا بوون‌و چی ئەوانەشی لەودیو سنوور بوون بە سەرۆکایەتی جوامێر ئاغاو سـەرۆکەکانی تریـان، هەمیـشە سەرچاوەی نائـارامی بـوون بـۆ دەسـەڵاتدارانی عوسمـانی، بۆیە حکومەت هەموو هەوڵ‌و کۆششێکی خستەگەڕ بۆ گرتنیـان، بەتایبـەت بۆ گرتنی جوامێر ئاغا، بۆ ئـەو مەبەستە ساڵی(١٨٨٣) ئـەرکی دواکـەوتن‌و بەرەنگاربوونـەوەی هەمەوەنـدی بـە (محمـد فاضـل داغـستانی) سـپارد[3]، نێـوبراو تـا سـاڵی (١٨٨٦) هیـچی پێنـەکراو لـە ئاسـت ئـەو مەترسـیانەی هەمەوەند لە ناوچەکەدا دروستیان کردبوو دەستەوەستان بوو، لـەم رووەوە نشینگەی بریتانی لە بەغدادەوە ساڵی (١٨٨٦) نوسیویەتی:

(...هەمەوەندەکان بەدرێـژی سنوور تۆقینیـان ناوەتـەوە، وێـرای ئـەوەش کـە ژمارەیـەکی زۆر تیپـی سـەربازی هاتووچـۆ دەکـەن، کەچـی دەردەکـەوێ بـەریان نەکـەون، ئـەم هەڕەشـەیە تـا ئێستاش لـە سنووری هـەردوو دەوڵـەتی مەزندا هەیە، کە بریتین لە چەند پیاوێکی چەکدار کە لە (٥٠٠) کـەس زیـاتر نابن‌و جۆری چەکی مارتینییان پێیـە، سواری ئەسپێك دەبن کـە عەشیرەتی (شـەممەر) پێیـان داون، وەکـو ڕێگـران لـە هـەموو کـات‌و شـوێنێکدا وەکـو

---

[1] سي.جي. ادموندز:المصدر السابق، ص٤٣.

[2] نەجاتی عەبدوڵلا: ئیمپراتۆریا، سنوور ، خێڵ، ل١٢٢.

[3] الزوراء، عدد ١١٨٣، ١٧ی ذی العقدة، سنة ١٣٠١ه. وەرگیراوە لە: عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين، ج٨، ص ٨٩.

زەردەواڵە بلاٌودەبنەوە، کە ئەمە ئاسان نییە دەستیان بگاتیٌو هەر ڕۆژێك بەر لە ئێستە ئەفسەرێکیان بریندارکردو سەربازێکیشیان لە نزیك سلێمانی کوشت)[1].

بە فیتی عوسمانییەکانو فشاری ولاٌتی ئێرانو خودی دەستەکەی جوامێر خۆی لە ساڵی (١٨٨٦)دا، (فەقیٌ قادر)ی هەمەوەند بە خۆیو ٢٠٠ سوارەوە، ناچارکران پەنا ببەنە بەر دەسەلاٌتدارانی عوسمانیو داوای داڵدەدان بکەن[2]. بەڵگەنامەیەکی عوسمانی ئاماژە بۆ پەنابردنەوەی نێوبراوو هاوڕێکانی دەکاتو هەڵوێستی دەسەلاٌتدارانی عوسمانیو ڕێوشوێنی پێویستی بۆ نیشتەجێکردنەوەیان خستۆتەڕوو[3].

هەر لەو ساڵەدا (١٨٨٦) (محمد پاشای داغستانی) لە لایەن سوپای شەشەمی سوڵتانییەوە لە بەغداد ڕەوانەی لای خانەقین کرا، بۆ ئەوەی لەگەڵ حکومەتی ئێرانیدا بۆ لێدانی هەمەوەند رێکبکەون، دەرەنجام ئەوەبوو ئێرانییەکان (حوسام ئەلمولك)ی حاکمی کرماشان یان ناردە سەریانو زۆرێك لە گەورە پیاوەکانیان لە نێودان[4]. لەوانە کوشتنی جوامێر ئاغا بە

---

[1] ج.ج.لوریمر: دليل الخليج:القسم التاريخي، ت.مكتب الترجمة بديوان حاكم قطر، ج٤، مطابع العروبة-الدوحة-قطر-١٩٦٧، ص٢٢٢٩.

[2] بۆ وردەکاریەکانی ئەو هەوڵ و فشارە بڕوانە: سەرتیپ محەمەد ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل ل١٣٤-١٣٥

[3] بڕوانە دەقی بەڵگەنامەکە لە: عەبدوڵلاٌ عەلیاوەیی: سەرچاوەی پێشوو، ل٧٣. خليل علی مراد، المصدر السابق، ص ٣٦.

[4] الزوراء، عدد ١٣١٠، ٥ شعبان، سنة ١٣٠٤ھ. وەرگیراوە لە :عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين، ج٨، المصدر السابق، ص ١٠٤.

پیلانێکی خیانەتکارانە لە نزیك قەسری شیرین، لە نێو ڕەشماڵەکەی خودی حوسام ئەلمولك خۆیدا[١].

لە حوزەیرانی ساڵی (١٨٨٧) لە کاتی پەلامارەکانی (ئیسماعیل حەقی پاشا)دا هەندێك لە سەرۆکە بچووکەکانی هەمەوەند دەستگیرکران و هەندێکیشیان خۆیان بەدەستەوەدا، ژمارەی ئەو چەکانەی کە لە هەمەوەندەکانەوە ڕادەستی حکومەت کرایەوە، گەیشتە (٤٠٠٠) پارچە چەك، پاشتریش دەربارى عوسمانی بڕیاریدا بۆ ئەوەی سنووری ئێران نەبەزێنن و جارێکی تر پشێوی درووستنەکەنەوە، لە ناوچەکە دووربخرێنەوە، بۆیە زۆرێکیان بە خێزانەوە دوورخرانەوە بۆ ویلایەتەکانی ئەدەنە (٥٠ خێزان)، سیواس (١٠٠ خێزان)، قۆنیا ( ٢٣خێزان)و ئەنکارا (٥٠) لە ئەنادۆڵ[٢]. بەلاّم وەك لە ڕاپۆرتێکدا دەردەکەوێت، ژمارەیەکی زۆر لەوانە پاش ماوەیەك (١٣٠٥ك–١٨٨٨ز) هەلاّتوون و بەنهێنی گەڕاونەتەوە بۆ لای موسڵ و کەرکوك، هەندێکیشیان لای تاووق لەگەڵ چەکدارەکانی قایمقامدا کەوتوونەتە شەڕەوە و چەند کەسێکیان لێ کوژراوە، بۆ دواکەوتن و سەرلەنوێ گرتنەوەیان چەکدارەکانی سوپا و ژەندرمە (پۆلیس) لە گەڕاندا بوون، بۆ هەمان مەبەست لە عەشیرەتەکانی سوڵتانی و سوارەی عەشیرەتەکان چەکداریان ڕێکخستبوو، پرۆسەی گەڕان بەدوایاندا لە لایەن

[١] باڕۆن ئیدوارد نۆڵدە: سەرچاوەی پێشوو، ل١٣. مێجەرئی.بی.سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی...، ل٥٨. بۆ زانیاری لەبارەی ئەم کەسایەتیە و وردەکاری کوشتنەکەی بڕوانە: سەرتیپ محەمەد ئەمین: هەمەوەند لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا لە ناوەراستی سەدەی هەژدەوە تا جەنگی یەکەمی جیهانی، چ١، سلێمانی ٢٠٠٨، ل ل٥٩–١٤١

[٢] Gökhan Çetinsaya: Op.Cit, pp 77-78.

ئـەم چـەکدارانەوە گـەرمەو گوڕبـووە[1]. بـەڵام پرۆسـەکانی حکومـەت هـیچ ئاکامێکی نەبوو، چونکە هـەر لـەو ماوەیـەدا (٤٠٠) لـە پیاوەکـانی هەمەوەنـد چوونە سەر موسڵ‌و جاڕیاندا کە ناوچەکە تالآن دەکەن ئەگـەر خێزانـەکانیان بـۆ نەگێڕنـەوە، داواکـەیان هـەموارکراو حکومـەت لەسـەر حیـسابی خـۆی خێزانەکانیانی هێنایەوە بازیان[2].

دەوڵەتی عوسمانی بە دوورخستنەوەیان بۆ شارەکانی ئەنادۆڵ نەوەستا، بـەڵکو سـاڵی ١٨٩٠ ژمارەیـەکی زۆری تـری لـە خێزانـەکانی هەمەوەنـدی بـۆ شـارەکانی (تـەرابولس‌و بـەنغازی‌و جەبـەل ئەلئـەخزەر) لـە وڵاتـی لیبیـا دوورخستەوە، هەرچی هـەوڵ‌و کۆششەکانی (ئەحمەد ڕاسم پاشا)ی والی بوو لـەوێ بۆ نیشتەجێکردنیان‌و بەزۆر هێشتنەوەیان سوودێکی نـەبوو[3]. بـەرەنجام ئـەمانیش وەك ئیدمۆنـدز دەڵێـت لـە "داسـتانێکدا کـە لـە نایـابترین داسـتانەکان‌و مەزنترینیانـە لـە مێـژووی عەشـیرەتیی کـورددا"[4] لـە سـاڵی (١٨٩٦) توانیان بە کۆمەڵ خۆیان ڕزگار بکەن‌و بگەڕێنەوە بازیان[5].

---

[1] بڕوانە: دەقی ڕاپۆرتەکەی لە:خلیل علي مراد: المصدر السابق، ص ص٥٢-٥٤.

[2] مێجەر ئی.بی.سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی...، ل٥٩.

[3] بۆ وردەکارییەکانی ئەم هەوڵ کۆششە بڕوانە: حامد محمود عیسی علي، المشكلة الكردية فی الشرق الاوسط منذ بدايتها حتى سنة ١٩٩١، مكتبة مدبولي ١٩٩٢، ص ص ٢٢-٢٥.

[4] سی.جی. ادموندز: المصدر السابق، ص٤٣.

[5] هنری فیلد: المصدر السابق، ل٥٣.

## -ناکۆکی نێوان پشدەرو شیوەکەڵییەکان (سیوەیل):

وەك لــە ڕاپــۆرتێکی والی موســڵ عەبــدولقادر کــەمالی پاشــا (١٣٠٩-١٣١٠ك/١٨٩٠-١٨٩١ز)دا دەردەکەوێت کە ساڵی (١٨٩١) بۆ دەسەڵاتدارانی عوسمانی بەرزکردۆتـەوە، عەشیرەتی پشدەر بە ڕێکەوتن لەگەڵ هەندێ لە لقەکانی عەشیرەتی مەنگۆڕ کە سەر بە قەزای (ڕانیـە)ن و عەشیرەتی هەرکی، لــە ســاڵی(١٣٠٧ك-١٨٨٩-١٨٩٠)دا چــوونەتە ســەر گونــدەکانی (شـوهکل_شـیوەکەل)و بـارێی بـچووكو بـارێی گـەورە کـە سـەر بـە قـەزای (شارباژێر)ی لیوای (سلێمانی)ن و سەرجەمماڵەکانیان تالآن کردووەو دواتر ســوتاندوویانە[1]، ئــەم ڕووداوە وەك لــە یــادەوەری لۆکاڵیــشدا (الــذاکرة المحلیة) پارێزراوە، لە ڕۆژگاری (وەسمان ئاغای بابەکر ئاغای برای سەلیم ئاغا)دا بووە، دوابەدوای ڕووداوەکەش (ڕەسوڵ ئاغا)ی شیوەکەل[2] گازندەو سکالآی خۆی بردۆتە لای حکومەت[3].

---

[1] بڕوانە: دەقی ڕاپۆرتەکەی لە: خلیل علي مراد: المصدر السابق، ص٦٠.

[2] ڕەسووڵ ئاغا کوڕی سەلیم ئاغای وەسمان ئاغایە و برای مەحموود ئاغای شیوەکەلی بەناوبانگە، کاتی خۆی نیشتەجێی سیتەك بووەو تا سوورە قەلآتی لە ژێردەستدا بووە، لە گۆیژەوە تا سوورکێویش موڵکی بنەماڵەی ئاغایانی شیوەکەل بووە. (مەحمود ئاغای شیوەکەل)، باسێکی بلآونەکراوەی عەبدولرەقیب یوسف لە : بیرەوەریەکانی ئەحمەدی حەمائاغای پشدەری، ئا. عبدالرقیب یوسف و سدیق ساڵح، چاپخانەی ئازاد، سلێمانی، ٢٠٠١، پەراوێزی ل١٠٩.

[3] سدیق ساڵح:"هەڵبژاردەیەك لە بیرەوەیەکانی ئەحمەدی حاجی عەباس ئاغای پشدەر"، گۆڤاری پەیڤین، ژ٣ی ئابی ١٩٩٨، ل١٧٠.

بە گوێرەی بیروەرییەکانی ئەحمەدی حەمائاغای پشدەری، ڕەسووڵ ئاغای شیوەکەڵ پیاوێکی گەورەو دەوڵەمەند و خاوەن دەسەلآت بووە، شێخ سەعیدی بەرزنجە خۆشی پێنەهاتووە، عەشایەری ناوچەکە، بەتایبەت عەشایەری ناوچەی پشدەر کە زۆر لەژێر گاریگەریی شێخدا بوون و بە قسەیان دەکرد، لە دژیان هانداوە و ئەوانیش چوونەتە

هۆکاری پەلامارەکان وەك لە یادەوەری لۆکاڵیدا ئاماژەی بۆ کراوە، ئەوە بووە کە پێشتر شیوەکەڵییەکان پەلاماری (گەلاڵە)ی لای (ماوەت)ی ژێر ڕکێفی پشدەریان داوەو تالانیان کردووە، هەرچی پشدەرییەکانە گوایە لای حکومەت سکالایان کردووە، ئەوانیش ڕەزامەندییان نیشانداوە تۆڵەی خۆیان بکەنەوە، ئیتر لە سەردەمی ئاغایەتی ڕەسووڵ ئاغادا پەلاماری شیوەکەلیان داوەو تالانیان کردووەو سوتاندوویانە، هەرچی ڕەسوڵ ئاغایە بەرەنگاری نەکردووەو چووتە گوندی سیرین[1].

هەرچی (عەبدولقادر کەمال)یە زیاد لە جارێك سەرنجی دەسەڵاتدارانی بۆ ئەنجامدانی پرۆسەیەکی سەربازی بۆسەر پشدەرییەکان و (تەمێکردنیان) ڕاکێشاوە، هەرچی حکومەتی عوسمانی و لەشکری شەشەمی سوڵتانییە قایلبوونی خۆیان پیشانداوە[2]. بەڵام پرۆسەکە بەهۆی ئەوەی کە پشدەر ناوچەیەکی شاخاوییەو هاتنی وەرزی زستان و بەفر بارین و پچڕانی ڕێگەوبانەکانەوە، بۆ وەرزی بەهار دواخراوە، لە بەهاریشدا فەرمان دەرنەچوو، بۆیە والی نیگەرانی خۆی پیشانداوەو ئاماژەی بەوە داوە ئەگەر بێت شیوەکەلییەکان بۆ وەرگرتنەوەی مافەکانیان لە حکومەت نائومێد بن، ئەوا بەرئەنجامی خراپتری بۆ حکومەت لێدەکەوێتەوە بۆیە دۆخەکە

---

سەر شیوەکەڵییەکان، هەرچی ڕەسووڵ ئاغا و شیوەکەڵییەکان بوون، هێزیان کەم بوو و بەرەنگارییان پێنەکراو هەڵاتن، لە کۆتاییشدا ناوچەکانیان دەستی بەسەرداگیرا و لە نێوان پشدەرییەکان و شێخدا بە نیوەیی دابەشکرا. بڕوانە: بیرەوەریەکانی ئەحمەدی حەمائاغای پشدەری، ل١٠٩.

[1] بیرەوەریەکانی ئەحمەدی حەمائاغای پشدەری، پەرواوێزی ل١١٠.

[2] بڕوانە: دەقی نوسراوەکەی حکومەتی عوسمانی لە: خليل علي مراد: المصدر السابق، ص٥٨.

وادەخوازێــت بــێ دواکــەوتن پرۆســەی (تــەمێکردن) دژ بــەم عەشــیرەتانە ئەنجامبــدرێت، لــەم ڕووەوە: ســەپاندنی هێــزی ســەربازیو گەڕاندنــەوەی تالأنییــەکانو (تــەمێکردنی) یاخیبووەکــانی بــە پێویســت زانیــوە، هێمــای بــۆ ئەوەش کردووە ئەگەر ئەو لەشکرە سوڵتانییەی لە چوارچێوەی (چاکسازی عەشیرەتەکان)دا لــەژێر (فــەرمانی محەمــەد فاضــل پاشــا)ی (داغســتانییە) لــە موســڵ دانــراوە پرۆســەکە جێبەجێــدەکات کــارێکی باشــە، ئەگــەر نــا، ئــەوا نــاردنی دوو کەتیبــەی ســەربازی ســوڵتانی کــە بریتییــە لــە(٦٠٠) کــەس، بــە (١٥٠) سوارەوە ئامانجەکان بەدیدێنن[١].

وەك پێــشتر ئامــاژەمــان بــۆ کــرد، یــەکێك لــە ئامانجــەکانی (عومــەر وەهبــی پاشــا) ئــەو کاتــەی ســاڵی ١٨٩٢ لــە لایــەن دەســەڵاتدارانی ئەســتەنبوڵەوە ڕەوانەی ناوچەکە دەکرێت، سەرکوتکردنی عەشیرەتە (یاخیبووەکان) بووە لەناوچــەکە، لەوانــە هــەردوو عەشــیرەتی (هەمەوەنــدو پــشدەر)، دوای ئــەوە ناچارکردنی ئێزیدییەکان بووە بۆ بوونە موسڵمان، وەك لە سەرچاوەیەکی بەڵگەنامەییــدا هــاتووە، عومــەر وەهبــی پاشــا ئامــانجی یەکــەمی بــە ســەرکەوتوویی جێبــەجێکردووە، پاشــان چووتەســەر ئێزیدییــەکان[٢]. جێــی تێبینییــە سەرچاوەکان بۆمــان ڕووناکەنــەوە ئــەم ســەرکەوتنە چۆنو بەچــی شــێوەیەك ئەنجامــدراوە، بــەڵام یــادەوەری لۆکــاڵی، ئامــاژە بــۆ ئــەوەدەکات کــە حکومەتی عوسمــانی بــەهۆی ئــەم ڕووداوەوە لێپێــچینەوەی لەگــەڵ (وەسمــان ئاغا)ی پشدەردا کردووەو ئاغای نێوبراو ئەوەی ڕەتکردۆتــەوە کــە پــەلاماری شــیوەکەلییەکانیان دابێــت، بــەوەش تــوانی عوسمانییــەکان قایــل بکــات[٣].

---

[١] المصدر نفسه، ص ص٦٠-٦١.

[٢] Gökhan Çetinsaya: Op.Cit, p. 79.

[٣]بیرەوەریەکانی ئەحمەدی حەمائاغای پشدەری، ل١٧٠.

پێناچێ ناکۆکییەکان کۆتاییان هاتبێت، چونکە وەك لە نووسراوێکی حکومەتی عوسمانیدا کە لە (٢٥ی تشرینی یەکەمی ١٨٩٤)دا دەرچووە، ناکۆکییەکانی نێوان پشدەرییەکانو شیوەکەلییەکان نەبڕاوەتەوەو بگرە قووڵتریش بوونەتەوە، نوسراوەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە پشدەرییەکان دەستیان بەسەر ناوچەکانی شارباژێڕو مێرگەدا گرتووەو خەڵکەکەیان دژ بە شیوەکەلییەکان هانداوە، لە ئاکامیشدا شیوەکەلییەکان بۆ سنووری ئێران پاشەکشەیان کردووە. وەك لە نوسراوەکەدا هاتووە بەرنامەی ئەنجوومەنی لیوای سلێمانی ئەوەبووە شیوەکەڵییەکان بۆ گوندی (ڕاجە) لە سیوەیل بگوێزنەوەو کەتیبەیەکی سەربازی سوڵتانیش کە لە سلێمانیدا بووە، ڕەوانەی ئەوێ بکەن[1].

[1] بڕوانە: دەقی نوسراوەکەی حکومەتی عوسمانی لە: خلیل علی مراد،، ص٧٠.

## ناكۆكی نێوان شێخ موحەمەدی بارزان و عەشیرەتەكانی دەوروبەری:

پاش مردنی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی لە ساڵی (١٨٤٤)، شێخ موحەمەدی كوڕی جێگەی گرتەوەو وردە وردە لەگەڵ ڕۆژگاردا موریدو لایەنگرانی زۆربوون، و بەڕوویەكی تردا شكستی شۆڕشی ١٨٨٠و دوورخستنەوەی (شێخ عوبێدوڵلای نەهری) بۆ حجاز، بەشداری لە بڵاوبوونەوەی نێوبانگ و پێگەی شێخ موحەمەددا كردووە، بەشێوەیەك زۆربەی عەشیرەتەكانی دەوروبەری دەسەڵاتی ئەویان ناسی، موریدەكانی شێخ لە عەشیرەتەكانی زێباریو شێروان و مزووری دەستیان بە كڕینی چەك و تەقەمەنی كردو چەند لەشكری وەفاداریان خستە بەردەستی[1].

كاتێك فەتاح ئاغای زێباری كە لە ساڵی (١٨٨٠ز)وە دەسەڵاتی ناوچەی زێباری بەدەستەوە بوو، هەستی بە زیادبوونی پایەو دەسەڵاتی شێخ موحەمەد كردو وەك مەترسییەك بۆ سەر بەرژەوەندییەكانی خۆی لێكیدایەوە، پەیوەندی بە والی (موسڵ)ەوە كردو لەوە ئاگاداری كردەوە، كە شێخ موحەمەد خەڵك دژ بە دەوڵەت هاندەدات و پێویستە سنوورێكی بۆ دابنرێت، والیش شێخی بانگهێشتكرد بۆ موسڵ و مانەوەی ناچاری بەسەردا سەپاند، كاتێكیش بۆ داوای ئازادكردنی موریدو لایەنگرانی چوونە موسڵ، دەستبەسەریكردن و ناردنی بۆ سەربازیكردن، هەرچی (شێخ موحەمەد)ە پاش نائومێدبوونی لە ئازادبوون، هەڵهات و خۆی گەیاندەوە بارزان، بەڵام حكومەت دوای نەكەوت[2].

---

[1] بازیل نیكیتین: سەرچاوەی پێشوو، ل ل٤٣و٤٥.

[2] كامران عبدالصمد احمد الدوسكي: المصدر السابق، ص١١١ .

ئاغاکانی زێبار کە لەڕێگەی حکومەتەوە هیچیان پێنەکرا، ساڵی (١٨٨٦) پیلانێکیان بۆ کوشتنی شێخ موحەمەد داڕشت، بەلاّم سەرینەگرت، لە کۆتایدا شێخ گەیشتە ئەو بڕوایەی مانەوەی لە مەترسیدایە، بۆیە ناچاربوو بارزان بەجێبهێڵێت و رووبکاتە ناوچەی شێروانییەکان، ئەوانیش بۆ ماوەیەکی زۆر گرتیانەخۆ، هەرچی ئاغاکانی زێبارە رۆشتنی شێخیان بە هەل زانی و کەوتنە بەهێزکردنی پێگەی خۆیان و دژایەتیکردنی موریدەکانی شێخ، بەتایبەت ناچارکردنیان بۆ چوونە سەربازیکردن، چونکە لەو رۆژگارەدا سەربازگیری زۆرەملێ راگەیەندرابوو، ئەم هەڵوێستە ڕق و کینەی لایەنگرانی شێخیان دژ بە زێبارییەکان و حکومەت ئەستوورتر کرد[1].

موریدو لایەنگرانی شێخ بەتایبەت شێروانییەکان و بەرۆژییەکان، توانیان بە هێرشێکی گەورە فەتاح ئاغا لە ناوچەکە دەرپەڕێنن و رێگە بۆ گەڕانەوەی شێخ موحەمەد بۆ بارزان خۆشبکەن، بەلاّم کوشتنی کوڕێکی موحەمەد ئاغای سورچی ساڵی (١٨٩١) لە لایەن دۆستانی شێخەوە، ناکۆکییەکانی ئاڵۆزترکردو بووە سەرچاوەی هەڕەشە لە لایەنگرانی شێخ موحەمەد، کە لە ئاکامدا ساڵی ١٨٩٢ ناچاربوون پەلاماری گوندەکانی (کلات)و (بجیل)[2] بدەن، بەلاّم بە خراپی تێکشکان، بۆ ساڵی دواتر (١٨٩٣) ئاغاکانی زێبارو سورچی بۆ سکالاّکردن لە (شێخ موحەمەد) چوونە شەمدینان بۆ دیداری (شێخ موحەمەد سدیق)و پڕیان کرد لە گومان بەرامبەر شێخی بارزان، ئەویش ناردی بەدوایداو دەستبەسەری کرد[3].

---

[1] پی رەش: بارزان و حركة الوعي القومي الكردي ١٨٢٦-١٩١٤، د.م. ١٩٨٠، ص٤٤.

[2] بجیل: بنکەی موحەمەد ئاغای سورچی بوو.

[3] پی رەش: المصدر السابق، ص ص٦٧-٦٨.

دوای ئـەوەی شـێخ موحەمـەد دەسـەڵاتدارانی عوسمـانی لـە دۆخەکـە ئاگـادارکردەوە، ئـازادکراو لـە بـەهاری سـاڵی (١٨٩٤) گەڕایـەوە بـۆ بـارزان، بەڵام ئەم ڕووداوە ناکۆکی نێوان شێخی بارزان و شێخ موحەمەدی سدیقی نـەهری قـووڵتر کـردەوە، بـە چەشـنێك شـێخی نـەهری لـە هـاوینی سـاڵی (١٨٩٤ز)دا بـە هاوکـاری عەشـیرەتەکانی (سورچـی، ئۆرەمـار، ڕێکـانی، برادۆسـت، زێبـارو مـزوری) پـەلاماری ناوچـەی (بـارزان)ی دا و (شـێخ موحەمەد)یان ناچارکرد بکشێتەوە ڕەواندوز، لەو شارۆچکەوە بۆ سەرلەنوێ گەڕانەوە بۆ بارزان، چ لە ڕێگەی بەرزکردنەوەی سکاڵانامە بۆ دەسەڵاتدارانی عوسمـانی لـە موسـڵ و چ بـە هێرشـێکی سـەرنەگرتوو لـە سـاڵی (١٨٩٦) هەوڵـەکانی بـەردەوامبوو[1]، تادەرەنجـام حکومـەت ئامـادەیی پیـشانداو شکستی بە پیاوەکانی موحەمەد سدیق هێنا و شێخی بارزانیان جارێکی دیکـە ڕەوانـەی ناوچـەکەی خـۆی کـردەوە[2]. لەگـەڵ ئەوەشـدا دەرکردنـی یـەکجارەکی هێزەکـانی شـێخی نـەهری لـە ناوچـەکەدا، پێویـستی بـە چـەند هـەڵپرژانێکی چەکداری هـەبوو بۆ سـەقامگیربوونی ئارامی لە بارزان، پاش ئەوە شێخ تا مردنی ساڵی (١٩٠٢) لەگەڵ لایەنگرانیدا سەرقاڵی چالاکی ئایینی بوون[3].

---

[1] المصدر نفسه، ص ص٧٢-٧٨.

[2] بازیل نیکیتین: سەرچاوەی پێشوو، ل٥٠.

[3] پی رەش: المصدر السابق، ص٨٣.

## ناكۆكی ئەتروشیو عەشیرەتو هێزەكانی دیكەی ناوچەكە:

وەك پێشتر ئامادەمان بۆ كرد ئەتروشی عەشیرەتێكی گەورەو فرە لقی ناوچەی بادینانە، و تەنها عەشیرەتیش بوون بۆ بەشداریكردن لە پێكهاتەكانی سوارەی حەمیدی سەرۆكەكانی ئامادەییان پیشاندا.

سالی ١٨٩٧-١٨٩٨ لەنێوان ئەم عەشیرەتەو (دۆسكی)یەكاندا كە (داوودیە)ی سەر بە قەزای ئامێدی سەنتەریان بوو، پێكداهەڵپژانی چەكداری ڕوویدا، لەگەڵ ئەوەی دۆسكییەكان بەژمارە زۆربوونو چەكەكانیشیان نوێ بوو، بەلام بەرامبەر ئەتروشی زۆر بەخراپی تێكشكان،و نزیكەی (٨٠) كەسیان لێكوژرا، كە زۆریان لە سەرۆكەكانی دۆسكی بوون[1]. پێدەچێ هۆكاری سەركەوتنی ئەتروشی ئەوە بووبێت كە وێڕای ژمارە زۆریان، سەربە سوارەی حەمیدی بوون، كە چەكپۆشو سەر بەدەوڵەتی عوسمانی بوون[2].

ناكۆكی نێوان ئەتروشیو دۆسكی وەك توێژەرێك دەڵێت: بەشێك بوو لەو زنجیرە ناكۆكییانەی كە ئەتروشی بەسەرجەم لقە جیاجیاكانییەوە، لە تەك دانیشتوانی ئەو ناوچانەی لەكاتی كۆچە وەرزیەكاندا پێیدا تێپەڕدەبوون ، یا بۆ لەوەڕاندنو ئاودانی مێگەلەكانیان تیادەمانەوە، بەرپایان دەكرد[3]. سەرچاوەی ناكۆكییەكانیش بریتی بوو لە حاجی ئاغای سەرۆكی ئەتروشیو قایمقام (مقدم) لە سوارەی حەمیدی دا، كە لە سەرەتای سالی

---

[1] صديق الدملوجي: امارة بهدينان الكردية، ص ص١١٠و١١٢.

[2] بروانه: هامش عبدالفتاح علي بوتاني، المصدر نفسه، ص١١٢.

[3] كامران عبدالصمد احمد الدوسكي: المصدر السابق، ص١٠٥.

(١٨٩٧) بە سەرەوە پەلامارو تالآنی گوندو عەشیرەتەکانی تری دراوسێی دهۆکی دەداو لەبەر ئەوەی سەر بە هێزەکانی حەمیدی بوو هیچ کاربەدەستێکی مەدەنیو سەربازی ناوچەکە نەیدەتوانی بەرامبەری بووەستێ، هەر سکالآیەك لە پێکهاتەکانی سوارەی حەمیدی دەگەڕایەوە لای زەکی پاشا، ئەویش هەمیشە پشتی ئەو عەشیرەتانەی دەگرت، کە سەر بە حەمیدی بوون[١].

لە راستیدا دەسەلآتدارانی عوسمانی ئاگادار بە بارودۆخەکە، سەرۆکەکانی کوردیان بۆ ئەم شێوازەی دژایەتیکردنی یەکتری هاندەدا، هەر دوابەدوای پڕچەککردنی عەشیرەتەکان، وێڕای خراپبوونی دۆخی خەڵکی رەشو رووتی کوردو دەستەمۆبوونی زیاتر بۆ ئاغاکانیان، دوژمنایەتیو تۆڵە لە نێوانیاندا بلآوبوویەوە[٢]، لەو چوارچێوەدا ئەتروشەکان بە تەنها لەگەڵ دۆسکیەکاندا ناکۆك نەبوون، بەڵکوو پەلاماری عەشیرەتە کۆچەرییەکانی (ئۆرەمار)و عەشیرەتەکانی تری ناوچەکەیان دەدا، لە تشرینی دووەمی ساڵی (١٨٩٨) حاجی ئاغا چەند گوندێکی سەر بە (شێخ نور محەمەد)ی خاوەن نفووز لە دهۆك سوتاندو تالآنکرد، کاردانەوەی شێخ زۆر توندبوو، ژمارەیەك هێندە زۆری چەکدار کە نزیکەی هەزار سوارەو هەزار پیادە دەبوون لە عەشیرەتەکانی سەربە قەزاکانی (دهۆك، ئامێدی، زاخۆ)ی کۆکردەوە، بە چەشنێك دڵەڕاوکێی لە ناو دهۆك دا درووستکرد، ئەگەرچی دەسەلآتدارانی عوسمانی هەندێك هێزیان لە موسڵەوە بۆ هێمن کردنەوەی دۆخەکە نارد، بەلآم بێسوود بوو[٣].

---

[١] Gökhan Çetinsaya: Op.Cit, p. 83.

[٢] م.س.لازاریف، المسالة الكردية، ص٩٢.

[٣] Gökhan Çetinsaya: Op.Cit, pp. 83-84

لە کانوونی دووەمی ساڵی (١٨٩٩)دا دۆسکییەکان لە لایەن (شێخ نور محەمەد)ەوە هاندەدران بۆ ئەوەی هێرش بکەنە سەر کوردە کۆچەرییەکانی سەربە (حاجی ئاغای ئەتروشی)، لە شوباتی هەمان ساڵدا کوردەکان گوندە ئێزیدیەکانیان لە دهۆك تالانکرد، ئەم دۆخە سوڵتان عەبدولحەمیدی بە تەواوی نیگەران کرد، بۆیە ساڵی ١٨٩٩ (ئەبو بەکر حازم بەگ)ی وەکو والی نوێ بۆ موسڵ دەستنیشانکرد، سکرتێری یەکەمی کۆشك پێی ڕاگەیاند، کە دەبێت دەستبەجێ بڕوات بۆ ناوچەکە، چونکە (کوردەکان وەکو گورگ بەربوونەتە گیانی یەکتر)، والی نوێ لە ڕێگەی دوو کەسایەتی موسڵ ئەوانیش (نەقیب و ساڵح ئەفەندی سەعید) بوون، شێخی ڕازیکرد هێزەکەی هەڵبوەشێنێتەوەو بۆ خستنەڕووی سکالاکەی بچێتە موسڵ، لەو کاتەی لە موسڵ بوو، والی دڵنیایی کردەوە کە لە سکالاکەی دەکۆڵێتەوەو بۆ لێکۆڵینەوە ناردی بە دوای (حاجی ئاغا)دا، ڕاپۆرتی ئەم کارانەی خۆیشی دایە ئەستەنبوول و ئیدی لە چاوەڕوانی فەرماندابوو بە برووسکە پێیبگات، لە ئابی (١٨٩٩) ڕێگەدرا (شێخ نور محەمەد) بگەڕێتەوە دهۆك، دوو مانگ دواتریش بڕیاردرا (حاجی ئاغا)و عەشیرەتەکەی بگواسرێتەوە بۆ ویلایەتی دیاربەکر، چونکە سکالاکان کە لە دژی کرابوون، بنەمایەکی ڕاستیان هەبوو[1].

وێڕای ئەو گواستنەوەیە ناکۆکی و دوژمنایەتی ئەتروش لەگەڵ دۆسکییەکاندا چەندین ساڵ درێژەی کێشاو سەرجەم کۆششەکان بۆ پێکهێنانەوەیان تا (حوزەیرانی ١٩٠٥) سەرینەگرت، تا لەو ساڵەدا دەسەلاتدارانی عوسمانی بۆ پێکهێنانەوەیان لەگەڵ یەکتر کۆمیتەیەکیان پێکهێنا، کە پێکهاتبوون لە (قایمقامی قەزای دهۆك، شێخ بەهائەدینی

[1] Gökhan Çetinsaya : Op.Cit, p. 84.

نەقشبەندی، شێخ نور موحەممەدی دهۆکی، حاجی ئاغای سەرۆکی سلیڤانی لە زاخۆ)، کۆمیتەکە لەگەڵ هەردوو لایەنی ناکۆکدا کۆبوونەوە، لە ئاکامدا توانی ئاشتەوایی لە نێوانیاندا دروستبکاتو لە کۆنووسێکی فەرمیدا جێگیری بکەنو وێنەیەکی بۆ والی موسڵو یەکێکی دیکەی بۆ بابیعالی ڕەوانەکرد[1].

## -ناکۆکی نێوان هەمەوەندو شوان

وەك لەدوو ڕاپۆرتی (ڕەزا پاشا)ی سەرکردەی سوپای عوسمانیدا دەردەکەوێت، کە لە (٨یئابو١٧یئەیلول)ی ساڵی (١٨٩٨)دا بۆ حکومەتی عوسمانی بەرزکردۆتەوە، لە (بەهاری) ئەو ساڵەدا ناکۆکی لە نێوان هەردوو عەشیرەتی (هەمەوەند)و (شوان)دا سەر هەڵدەدات، لە ئەنجامدا هەمەوەند پاش تاڵانکردنیان (١٠)گوندی شوانەکانیان سوتاندووە، وێڕای ئاوارەبوونی دانیشتووانی (٦) گوندی تریانو ناچاربوون بە جیهێشتنی ماڵەکانیان[2]، هەرچی عەشیرەتی (شوان)ە خەڵکێکی زۆریان بۆ تۆڵەسەندنەوە کۆبوونەتەوە، پاش لێپێچینەوە وەڵامی سەرۆکەکانی هەمەوەند بۆ کاربەدەستانی لیوای سلێمانی ئەوە بووە کە عەشیرەتەکانی شوانو شێخ بزێنی ئابلۆقەی هەردوو گوندی (بەربادیوموزاقە)یان داوە، بەڵام پاشتر دەرکەوتووە کە مەسەلەکە وانییە، و بە پێچەوانەوە (٢٠٠) لە سوارەکانی هەمەوەند چوونەتە سەر گوندەکانی شوانو سوتاندوویانە[3].

---

[1] کامران عبدالصمد احمد الدوسكي: المصدر السابق، ص ١٠٧.

[2] بڕوانە: دەقی ڕاپۆرتەکەلە : خلیل علي مراد، ص٨٤.

[3] خليل علي مراد، المصدر نفسه، ص ص٨٦-٨٧.

وەك لــە راپۆرتەكــەدا هــاتووە، بــۆ ســنووردانان و رووبەڕووبوونــەوەی پشێویی عەشیرەتەكان كە چەندین ساڵە ویلایەتەكە پێوە گیرۆدەیەو بۆ بەهێزكردنی سوپاو كۆنترۆڵكردنی ناوچەكە لە ویلایەتی موسڵ، لەشكری شەشەمی سوڵتانی، پێكهێنانی هێزێكی گەڕۆكی (٤٠٠–٥٠٠) كەسی كە (میرالای بەكر بەگ) سەرتیپی تۆپخانەی گەڕۆك سەرۆكەكەی بێت، كە پێشتر چەندین جار لە پەلامارەكاندا بۆ سەر هەمەوەند بەشداری كردووەو ئاگاداری ناوچەكەیە، بە كارێكی پێویست زانیوەو بۆ تەواكردنی پێداویستیەكانی ئەو هێزەش، داوای كردووە هێزێكی (٣٠٠) كەس لە ئاكریۆ زێبار، هەروەها بەشی دووەم لە فەوجی(٤٧)و هێزێكی تر كە بریتین لە (٦٠) هێستر سوار لە (موسڵ)ەوە بۆ بهێنن، [1] هەر بۆ ئەم مەبەستە بریكاری سەرۆكایەتی فیرقەی (١٢) لە ناوچەكەو ئەنجوومەنی لیوای (كەركوك)یش بڕوایان وایە تاكە ڕێگە بۆ بەرگرتن لەم ڕووداوانە، (تەمێكردن)ی هەمەوەندەكانە بە هێزی سەربازی، لەو چوارچێوەشدا (تەمێكردن)ی تاوانبارەكانی هەردوو عەشیرەتی (شوان و شێخ بزێنی)یە[2].

بەڵام دواتر پرسی هێرشی سەربازیو پرۆسەی بەناو (تەمێكردن) لە لایەن عوسمانیەكانەوە نەچووە بواری جێبەجێكردنەوە، چونكە ناكۆكییەكە لە (١٨٩٨/٩/٢٧) بە ئامادەبوونی سەرۆك عەشیرەتەكان و گەورە پیاوانی (هەمەوەندو شوان و شێخ بزێنی)و بە هاوكاری دەستەیەكی ئاشتكردنەوە (هیئة صلح)وە كە بۆ ڕێكخستن و ئاشتكردنەوەی لایەنە ناكۆكەكان لە كەركوك و سلێمانی پێكهێنرابوو، لەسەر بناغەی ئەم چەند خاڵەی خوارەوە كۆنترۆڵ و چارەسەركرا:–

---

(1) بڕوانە: خلیل علي مراد: ص ص٨٤–٨٥.

(2) المصدر نفسه، ص ص٨٦–٨٧.

–هەمەوەندەکان (١٠٠)پارچە چەك و (٤) هێستر لەماوەی (٢١) ڕۆژدا بۆ شوانییەکان بگێڕنەوە.

–لە ئایندەدا هەردوولا هیچ ماف و خواستێکیان لە یەکتر نییە، بەوانەی لە ڕابردووشدا ڕوویداوە لە سکالاٚو گلەیی و گازەندە.

– هەردوولا بۆیان نییە لە شێوەی کاری چەتەگەری یا تالاٚنی ئاشکراو نهێنیدا کاری دەستدرێژی بکەنە سەر یەکتر.

– هەردوولا بەڵێنیان داوە بە هیچ جۆرێك دەستدرێژی نەکەنە سەر کاروان و ڕێبوارانی یەکتری ئەوانەی بۆ ئەنجامدانی کاری تایبەتی خۆیان بە ناوچەکانیاندا گوزەردەکەن.

–هەر لایەنێك پێچەوانەی ئەم مەرجانە بجوڵێتەوەو بەڵێن بشکێنیٚ، پێویستە بە توندترین سزای حکومەت قایلبێت، وێڕای هەڵگرتنی خەرجی ڕۆژانەی هێزەکانی سوپاو پۆلیس و هەر دەستەیەکی تر کە ڕەوانەی ناوچەکەیان دەکرێت[1].

بەهەرحاڵ وێڕای بەشداریکردنی شوان (ئەگەرچی قەبارەی ئەم بەشدارییە نازانریٚ) لە ناکۆکی نێوان ساداتی بەرزنجەو هەمەوەنددا لە بەرژەوەندی بەرزنجەییەکان[2] و وێڕای ئەوەی تاکەکانی هەردوو عەشیرەت (هەمەوەندو شوان) بە گومان و خۆپارێزییەوە بەرامبەر یەکتر ڕەفتاریان کردووە، بەلاٚم پرۆسەی ئاشتەوای لە نێوانیاندا بەرەنجامی هەبووە، ئەوەتانیٚ کاتێك (مێجەر سۆن)ی گەڕیدەی بریتانی ساڵی (١٩٠٧) بە ناوچەکەیاندا گوزەردەکات، ئاماژە بۆ دۆستایەتی نێوانیان دەکات[3].

---

[1] المصدر نفسە، ص٨٨–٨٩.

[2] مستەفا نەریمان :"چەند بەڵگەیەکی مێژوویی، ل٢٢٨.

[3] بڕوانە کتێبەکەی : رحلة متنكر الى بلاد مابين النهرين وكردستان، ص ص٢١٣ و٢١٩.

## ناكۆكی نێوان سۆتۆ ئاغای ئۆرەمارو تەتۆ ئاغای ڕێكانی:

له ڕاستیدا چیرۆكی ئەم ناكۆكییه زارەكی دەبوو، ئەگەر باسیل نیكیتین (١٨٨٥-١٩٦٠)ی كۆنسۆلی رووسیا له (ئۆرمیه) تۆماری نەكردایه، وێڕای ئەوەی مێژووی رووداوەكانی روون نییه، بەلاّم وەك له ناوی كەسایەتییەكاندا دیاره، ناكۆكییەكه له ماوەی كۆتایی سەدەی نۆزدەهەمو سەرەتای سەدەی بیستەمدا بووه[1].

سالأنێكی زۆر ڕێكانییەكان ملكەچی دەسەلأتی پڕ له ستەمو زۆرداری ئۆرەمارییەكان بوون، به دەركەوتنی (سۆتۆ ئاغا) له ئۆرەمار قۆناغێكی نوێ ستەمكاریو قۆرخكردن بەرامبەر ڕێكانییەكان دەستیپێكرد، هەرچی (تەتۆ ئاغا)ی ڕێكانه، بڕیاریدا چیدی دۆخی ستەمكاری رەتبكاتەوەو سنورێك بۆ (سۆتۆ ئاغا) دابنێت، بۆ ئەم مەبەستەش كوڕو براو پیاوانی عەشیرەتەكەی پشتیان گرت[2].

ناكۆكییەكه به كوشتنی برایەكی (سۆتۆ ئاغا) به دەستی (تەتۆ ئاغا) دەستیپێكرد، كه دەیویست به زۆر دەست بەسەرماڵو سامانی

---

[1] مێژووی نووسینەوەی ئەم ناكۆكییه كه له لایەن مەلا سەعیدی شەمدینانیەوه به كوردی نوسراوەتەوه دەگەڕێتەوه بۆ ساڵەكانی(١٩١٦-١٩١٨)و ساڵی ١٩٢٣ له لایەن بازیل نیكیتین و مێجەرسۆن كراوەته ئینگلیزی و ئێستا له كتێبخانەی لێكۆڵینەوەی ئێرانی له زانكۆی پاریس پارێزراوه. بڕوانه بازیل نیكیتین و كوردناسی: سەرچاوەی پێشوو، ل ل١٨٨و١٨٩.

[2] هەمان سەرچاوه، ل١٩٠.

ڕێکانییەکاندا بگرێت، (سۆتۆ ئاغا) بە پەلامارێك بۆ سەر گوندی (ڕزگە)ی بنکەی (تەتۆ ئاغا) وەڵامی دایەوەو چەندین ڕۆژ کۆشکەکەی گەمارۆدا، قایمقامی ئامێدی کە ئەم هەواڵەی پێگەیشت، ئەفسەرێكو بیست پۆلیسی ڕەوانەی (ڕزگە) کرد، بۆ ئەوەی بە هەر ڕێگەیەك بێت گەمارۆکەی سەر (تەتۆئاغا) بشکێنێت، بۆ شکاندنی گەمارۆکە ئەفسەر دوو ڕێگەی خستە بەردەم (سۆتۆ ئاغا)، یەکەم: ئەگەر گەمارۆکە کۆتایی پێبهێنێت، ڕاپۆرت بۆ والی موسڵ بەرزدەکاتەوە و ناکۆکییەکە وەك ڕووداوێکی ئاسایی دەخاتەڕوو، دووەم: ئەگەرو ئامادە نییە، ئەوا هەواڵ دەداتە ویلایەتی (وانو موسڵ) بۆ ئەوەی لەشکرکێشی بکەنە سەری، لە ئاکامدا سۆتۆ ئاغا بە ناچاری ڕێگەی یەکەمی هەڵبژارد، چونکە شەڕکەرەکانی ئامادەبوون شەڕی عەشیرەتیی بکەن بەڵام شەڕی حکومەت نا، هەرچی (تەتۆ ئاغایە) ئەفسەرەکە پێشنیاری بۆ کرد خێزانو کەسو خزمانی بگوێزێتەوە ئامێدیو سەبارەت بەو ستەملێکردنە سکاڵایەك پێشکەش بەرپرسان بکات، بەڵێنیشی پێدا پشتگیری بکات، ئەویش قایلبوو، بەرامبەر بەم نێوانکارییە ئاغای ئەفسەر بڕێکی باش پارەی لە هەردوو لایەنی ناکۆك وەرگرت[1].

شێخ موحەمەد سدیقی نەهری ویستی بە هەر تەرزێك بووە ناوچەی ڕێکانی بهێنێتە بندەستی خۆی، بۆ ئەو مەبەستە لەگەڵ قایمقامی ئامێدی ڕێککەوت، کە (تەتۆ ئاغا) ڕەوانەی نەهری بکات، بۆ ئەوەی لای والی وان لەگەڵ (سۆتۆ ئاغا) پێکیانبهێنێتەوە، قایمقام ئەرکەکەی جێبەجێکرد، (تەتۆ ئاغا) قایل بوو لەوێ شێخ (تەتۆ)ی ڕازیکرد کۆشکەکەی (ڕزگە)ی پێبفرۆشێتو ئامادەیە سەرلەنوێ نۆژەنی بکاتەوەو وێڕای هەندێ دەستکەوتی مادیش بیپارێزێت، هەردوولا ڕێککەوتن، بەڵام ئەم ڕێککەوتنە

---

[1] بازیل نیکیتین و...، هەمان سەرچاوە، ل ل١٩١-١٩٥.

جێی گومان و نیگەرانییەکانی (سۆتۆ ئاغا) بوو، چونکە ڕێگای کاروانی ئۆرەمارییەکان بۆ موسڵ ، ئاکرێ و ئامێدی بە ناو ڕێکاندا دەڕوات و پێدەچوو لە ئایندەدا هەڵوێستی ئۆرەمارییەکان بخاتە تەنگی، بۆیە (سۆتۆ ئاغا) خەڵکەکەی کۆکردەوەو لە مەترسییەکانی دۆخەکە ئاگاداری کردنەوە، پێشنیاری بۆیان کرد کە باشترین ڕێگە پەلاماری (زرگە)یە، وەڵامی ئەوانیش (هەمی لەسەر ڕەئیا ئاغا حازرین)، ئەوەبوو بە (٩٠٠) چەکداری دۆسکی و ئۆرەمارییەوە پەلاماری (زرگە)یاندا، و (١٣) لە پیاوەکانی شێخ کە بۆ پاراستنی (تەتۆ) لەوێ بوون کوشت، هەرچی ئەوانیترە هەڵهاتن، کۆشکی تازە نۆژەنکراویشیان سووتاند، بەڵام (سۆتۆ ئاغا) بەربەرەکانێی شێخی بۆ نەچووەسەر، هەرزوو پەشیمان بوویەوە و بۆ لێخۆشبوون چووە نەهری، بەڵێنی دا خێزانی کوژراوەکان بە (١٣٠٠) لیرە قەرەبوو بکاتەوە، بۆ کۆکردنەوەی ئەو بڕە پارە، شێخ (٨) لە پیاوەکانی خۆی و (٢) پۆلیسی ڕەوانەی ناوچەکانی (دۆسکی و ئۆرەمار) کرد و لە سەرووی پارەی دیاریکراوەوە (٣٠٠٠) لیرەی تریان کۆکردەوە[1].

دۆخەکان پێچەوانەی بەرژەوەندییەکانی (سۆتۆ ئاغا) بوو ، بۆیە پاش ساڵێك بۆ لەنێودانی (تەتۆ ئاغا) ڕێگەی تری گرتەبەر، بۆ لە بیرکردنی ڕابردوو و دەستپێکردنی لاپەڕەیەکی نوێ، مەلایەکی ناوچەکەی نارده لای (تەتۆ ئاغا) و بۆ دڵنیاکردنەوەشی پێشنیاریکرد کچێکی خۆی بکاتە هاوسەری، (تەتۆ) دۆخەکەی بە دڵ بوو، ڕاستەوخۆ پیاوەکانی شێخی نەهری کە بۆ پاسەوانیکردنی لای بوون لە چەك داماڵی و ڕەوانەی نەهری

(1) هەمان سەرچاوە، ل ل١٩٦-٢٠٩.

کردنەوەو بۆ دووپاتکردنەوەی لایەندۆستیش هەردوولا سەردانێکی شێخی بارزانیان کرد[1].

(سۆتۆ ئاغا) دوای دوو ساڵ کە ناکۆکی شێخی بارزان لەگەڵ عوسمانییەکان دەستیپێکرد، کەوتە داونانەوە بۆ (تەتۆ ئاغا)، بە دیوێکدا (تەتۆ)ی قایلکرد بۆ نەدانی باج و دوورخستنەوەیان لە سەرژمێریکردن، ئاژەڵەکانی بگوێزێتەوە بۆ ئۆرەمار، بە دیوەکەی تریشدا قایمقامی ئامێدی لێ ئاگادارکردەوەو حەزی تەمێکردنیشی نەشاردەوە، ئەویش ڕێگەی دا[2].

(سۆتۆ ئاغا) خۆی نەخۆشخست و سەرجەم خزمانی خۆی ئاگادارکردەوە کە مەرگی نزیکەو ئارەزوو دەکات بیانبینێت، لەوانە کچەکەو تەتۆ ئاغای زاوای، هەمووان لە گوندەکەی سۆتۆ لە (نیروکی) کۆبوونەوە، (سۆتۆ ئاغا)ی نەخۆش ئەگەرچی داوای کرد خزمەتێکی باشی (تەتۆ ئاغا) بکەن و پێی گوتن (ئەوە ئەز دەمرم و تەتۆ برا مەزنی هەنگۆیە)، بەڵام لە پیلانێك زیاتر هیچیتر نەبوو، چونکە پیاوەکانی بواریان نەدا ڕۆژی دوای ببینێ و لە خەودا کوشتیان[3].

بەداخەوە وەك لێکۆڵەرێکیش هێمای بۆ کردووە، پاش ئەم ڕووداوە نازانین ناکۆکییەکانی نێوان ئەم دوو لایەنە چ ئاراستەیەکیان وەرگرتووە، تەنها ئاماژەیەك ئەوەیە، تا نزیك جەنگی یەکەمی جیهانی نەبڕاوەتەوە[4].

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل ل١٩٦-٢٠٩.

[2] هەمان سەرچاوە، ل ل٢٠٩-٢١٠.

[3] بازیل نیکیتین، سەرچاوەی پێشو، ل٢١٠.

[4] کامران عبدالصمد احمد الدوسکي: المصدر السابق، ص١١٠ .

## - ناكۆكی نێوان هەمەوەندو ساداتی بەرزنجە:

وەك لـە بەڵگەنامەیـەكی عوسمانیـدا هـاتووە، كـە لـە بنـچینەدا ڕاپـۆرتی فەرمانبـەرێكی عوسمانیـەو لـە حـوزەیرانی سـاڵی (١٩٠٥)دا نوسـراوە، "لـە مێـژە نـاكۆكی كەوتۆتـە نێـوان شـێخانی بەرزنجـەو هەمەوەندەكانـەوە"[1]. سەرچـاوەی ناكۆكیەكـە بـەگوێرەی بەڵگەنامەیـەكی تـری عوسمـانی ئەوەیـە لەكاتی دورخستنەوەی (هەمەوەند)دا شێخ سەعیدی بەرزنجە هەندێ زەوی‌و زاری بـێ تـاپۆ، لەوانـەی كـە حكومـەت فرۆشـتوونی، كڕیـوە، بـەڵام لـەكاتی گەڕانەوەیاندا بۆ زێدی خۆیـان هەمەوەنـدەكان كەوتوونەتـەوە كشتوكاڵكردن تیایـدا، لـە ئاكامـدا لـە نێوانیانـدا نـاكۆكی سـەریهەڵداوەو ئـەم ناكۆكییـە بـە كوشتنی (سەید نوری سەید حەسەن كانی كوالی) قووڵتر بۆتەوە[2].

بـۆ تۆڵەسـەندنەوە، (شـێخ مـەحموودی شـێخ سـەعید)و (شـێخ سـەعیدی گۆپتەپـە)و چـەند سـاداتێكی دیكـە لەگـەڵ لقـەكانی (تـەرخانی‌و روغزایـی) عەشـیرەتی (جـاف)دا كۆبوونەوەیـەكی گـەورەیان بـۆ پرسـی پـەلاماری (هەمەوەنـدەكان) سـازكرد[3]. لـە ئەنجامـدا بـۆ ئـەو مەبەسـتە بەرزنجەییـەكان توانیان نزیكـەی (هـەزار) پیادەو سوارە كۆبكەنـەوەو بـە سـەرۆكایەتی شێخ مـەحموود ڕەوانـەی گونـدی (داریكـەلی) بكـەن، هەرچـی (شـێخ سـەعید)ی بەڕێوبەری ناحییەی (قەرەداغ)، كـە لـە خزمـانی شێخ بـووە، نزیكـەی (٢٠٠) كەسـی كۆكردۆتـەوەو ناردوویـەتی بـۆ هـەمان گونـد، كۆششـەكانی بـەگ باشی=مقدم (موستەفا ئەفەندی) كە لـە لایـەن دەسـەڵاتدارانی ناوچـەكەوە بـە

[1] بڕوانە دەقی بەڵگەنامەی یەكەم لە: مستەفا نەریمان، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٨.

[2] بڕوانە دەقی بەڵگەنامەكە لە: عثمان علی: المصدر السابق، ص٢٠٣.

[3] مستەفا نەریمان: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٨. مامۆستا جەعفەر، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٠.

سەرۆكايەتی مەفرەزەیەكی سەربازی، بۆ قایلكردنی (شێخ مەحموود)و بەرگرتن لە شەڕ، ڕەوانەی (داریكەلی) كراوبوو، بێئەنجام بوو، تاگەڕاوەتەوە چەمچەماڵ بۆ بردنی هێزی زیاتر، هەردوو لای ناكۆك لای گوندی (بەكەجانی) تێكگیران‌و (شێخ نەجمەدینی برای سەید نوری) كوژرا، لە گەڕانەوەدا هێزەكەی (موستەفا ئەفەندی) دوای گوێنەدانی (شێخ سەعید) بە ئاگاداركردنەوەكان، بۆ لێك جیاكردنەوەیان‌و وەستاندنی شەڕ ناچاربووە هێز بەكاربهێنێت[1]

وێڕای ئەوەی كاربەدەستانی لۆكاڵی داوای بەكارهێنانی هێزیان لە دژی شێخ سەعید كردو داواكەش لە لایەن (سەدری ئەعزەم)ەوە هەمواركرا، بەلأم خودی سولڵتان داواكەی پەسەند نەكردو دەیگوت" ئەم چەشنە مامەڵە لەگەڵ ویستی ئیمپراتۆریدا ناگونجێت"[2]. بێگومان ئەم هەڵوێستە وەك پێشتر هێمامان بۆ كرد، پەیوەندی بەو پێگە گرنگەوە هەبوو كە شێخانی بەرزنجە لای سولڵتان هەیانبوو، لە ئاكامیشدا ئەم هەڵوێستە ڕەنگدانەوەی لەسەر ئاراستەی ڕووداوەكان هەبوو، چونكە بەگ باشی (موستەفا ئەفەندی) ئاگاداركرایەوە كە بەكارهێنانی هێز لە دەرەوەی سنووری دەسەلأتی ئەودایەو پێویستە سوپاكەی بگەڕێنێتەوە چەمچەماڵ[3].

هەرچی ساداتی بەرزنجەیە ئەم جارەیان لەشكرێكی (١٥٠٠–٢٠٠٠) كەسیان لە عەشیرەتەكانی: جاف، پشدەر، باجەلأن، شوان، شێخ بزێنی‌و جەباری كۆكردەوە، هەمەوەندەكان بە بیستنی ئەم هەواڵە گوندەكانی

---

[1] بڕوانە دەقی بەڵگەنامەكە لە: عثمان علي: المصدر السابق، ص ص٢٠٣–٢٠٤.

[2] Gökhan Çetinsaya: Op.Cit, p 85.

[3] بڕوانە دەقی بەڵگەنامەكە لە: عثمان علي: المصدر السابق، ص٢٠٤.

بازیانیـان چـۆڵکردو چـوون بـۆ نزیـك کـەرکوك[1] بـۆ بـەرگرتن لـە شـەڕو بڵاوەپێکردنـــی لەشـــکرەکەی (شـــێخ ســـەعید) لەلایـــەن دەســـەڵاتدارانی ناوچـەکەوە، فـەرمانی خـودی سـوڵتان عەبدولحەمیدو ئاگادارکردنـەوەی بـە "زمـــانێکی گونجـــاو" بێـــسوود بـــوو، هـــەر ڕاســـتەوخۆ ڕۆژێ دوای ئـــەو ئاگادارکردنـەوە، لەشـکری سـادات لـە (داریکـەلی)یـەوە پـەلاماری گونـدەکانی هەمەوەنـدیان داو تالأنیـان کـرد، گونـدەکانیش بـریتی بـوون لـە: سـورتکە، ئـەڵلایی، بازیـان، سەروچـاوە، تەکیـە، کلاشـکەران، جولومـەك، ئەحمـەدە ڕەش[2].

هەمەوەنـد بـۆ ڕاگرتنـی شـەڕو پێکـدادان لـە ڕێگـەی (تۆفیـق بـەگ)ی فەرماندەی ئۆردووی سەربازی بازیانەوە، بۆ جێبەجێکردنی داواکارییەکانی ســاداتی بەرزنجــە ئامــادەی خۆیــان خــستەڕوو، بــۆ ئــەو مەبەســتەش موتەسەریفی سلێمانی یان ئاگادارکردەوە، بەڵام بێسوود بوو، کۆششەکانی فەرماندەی نێوبراویش بۆ بەرگرتنی سادات هیچی لێنەکەوتەوە. بەهـەرحاڵ لـە کاتێکـدا لەشـکری سـادات خۆیـان بۆ پـەلاماردنی چەمچەماڵ سازدابوو، (٢٥ی حـوزەیران) نزیکـەی (٤٠) سـوارەی هەمەوەنـد ڕوبـەڕووی سـوارەکانی (ڕوغزایی و گـەلاڵی) بوونـەوە، لـە ئاکامـدا سـەرۆکی روغزایـی کـوژراو چـەند کەســێکی تــر برینــدار بــوون، هــەر لــەو ماوەیــەدا (٢٥٠) ســوارەیەك لــە هەمەوەنـدی پیربـادی‌و موزەفـەر چـوونە نێـو شـەڕەکە، دەرەنجـام لەشـکری ســادات بــە ناچــاری بــەرەو (داریکـــەلی) پاشەکـــشێیان کـــردەوە، بــۆ پاســـەوانیکردنی بەروبوومـــە کـــشتوکاڵییەکانیان لەهـــەر پرۆســـەیەکی

---

[1] مستەفا نەریمان: چەند بەڵگەیەکی مێژوویی، ل٢٢٨ . مامۆستا جەعفەر: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٠.

[2] عثمان علی: المصدر السابق، ص٢٠٤.

تۆڵەسەندنەوە داوای هاوکاریان لە سوپای عوسمانی کرد، بەڵام سوپا ئەم داواکارییەی جێبەجێنەکرد، لەو سۆنگەیەوە کە هەمەوەندەکان ناتوانن تۆڵە لە خودی شێخ بکەنەوە، بۆیە (شێخ مەحموودی شێخ سەعید)و (شێخ سەعیدی بەڕێوبەری قەرەداغ) بۆ ئەو مەبەستە لەگەڵ چەند سەد کەسێکدا لە ناوچەکەدا ماونەتەوە[1].

دوای چوار مانگ لەو ڕووداوانە، چەند ئەندامێکی بنەماڵەی بەرزنجی گیرانو درانە دادگا، بەڵام هەموویان لە لایەن سوڵتانەوە بەخشران، هەرچی دەسەلاّتدارانی ناوخۆیە لە بەدواداچوونی هەندێ لە بەرزنجەییەکان کە تاوانبار کرابوون بە نائامادەگی(غیابی) بەردەوامبوون، بەڵام ئەوانیش لە شوباتی ساڵی ١٩٠٦ دا سوڵتان فەرمانی لێخۆشبوونی بۆ دەرکردن[2].

[1] عثمان علي، المصدر نفسه، ص ص٢٠٤-٢٠٥.

[2] Gökhan Çetinsaya: Op.Cit, p. 85.

## ناكۆكی نێوان بەرواریيەكانو تەيارييەكان:

نـــاكۆكی نێـــوان بەرواريیـــەكانو تەيارييـــەكان دێرينـــەو مێژووەكـــەی دەگەڕێتـــەوە بـــۆ دوو ســـەدە لـــەوەو پـــێش (پـــەلاماری تەيارييـــەكان بـــۆ بەرواريیـەكان لەسـەر شـێوازی شـەڕی لـە ناكـاوو خێرابـوو، هـەورە بروسـكە ئاسـا پـەلاماری گونـدێكيان دەداو پـاش وێرانيكردنـی هەڵـدەهاتن، بـۆ بەيانييەكەی مێرێكی بەرواری خەڵكێكی زۆری عەشيرەتەكەی كۆدەكردەوەو لـە رۆشـنايی رۆژدا هێرشـيان بـۆ دەبـردنو دوای كوشـتو بڕكردنيـان دەگەڕانەوە، بەو چەشنە پێكداهەڵپژان بەردەوامبوو)[1].

ناكۆكييـەكان لـە پرۆسـەی دزیو تالآنيكردنـەوە گـۆڕا بـۆ بـەناكۆكی سەبارەت بەوەی فلآنە يا فيسارە گوند سەر بەكام عەشيرەتيانە، بۆ وێنە نـاكۆكی لـە بـارەی گونـدی(دەشـتان) كـە گونـدێك بـوو دانيـشتوانەكەی كوردبوونو باجيـان دەدايە بەرواريیـەكان، بـەڵام تەيارييـەكان لـە سـنووری گوندەكەدا هەندێ زەوی زاريان هـەبوو، ناڕەزای خـەڵكيان لـە قورسـی باجو سـەرانە بـۆ داواكردنـی گوندەكـە قۆسـتەوەو دەرئـەنجام بـە فـەرمانێكی عوسمانی لكانديان بە تـەياری خوارووەوە، دواتريش ئـەوەی ڕۆڵـی زياتری لـە قووڵكردنـەوەی ناكۆكييـەكانی ئـەو دوو لايەنـەدا گێـڕا، هەسـتكردنی تەيارييەكان بوو، بەوەی دانانی مێرەكانی بـەرواری لـە چوارچێوەی مافو دەسەڵاتی ئەواندايە، بۆ وێنە لەرووداوێكدا پێكڕای فراكسيۆنەكانی تـەياری بۆ سەپاندنی مێرێك بەسەر بەرواريیەكاندا، هێرشێكی چەكداريی گەورەيان بردە سەر ناوچەكانی بەرواری، لە ئاكامدا لە نێوان هـەردوو لايـەنی ناكۆكدا

---

[1] صديق الدملوجي: امارة بهدينان الكردية، ص١٠٠.

لــه گونــدی (دیریــشکی) پێکداهەڵپــڕژان درووســتبوو، بــەڵام بــه شکــستی تەیارییەکان کۆتایی هات[1].

دوای شەڕی (دیریشکی)و بەئامادەبوونی (شێخ بەهائەددینی بامەڕنی)و زۆرێـك لـه سـەرۆك عەشـیرەتەکانی کـوردو تـەیاری هـەردوو لایـەنی نـاکۆك پێکهاتنەوەو ئاشتەواییان دروستکرد، بەڵام زۆری نەبرد، بەهۆی ناکۆکی ناوخۆییـەوە هەنـدی لـه میرەکـانی بـەرواریو پـەنایان بـۆ تەیارییـەکان بـرد، دوای ماوەیـــەك هـــاوڕێ لەگـــەڵ میرەکـــانی تەیاریـــدا چـــوون بـــۆ گونـــدی (تـەروانیش)، هەرچـی (محەمـەد بـەگی تەتـەرخان بـەگ)ی بەرواریـیه کـه بـەم چوونەی زانی گوندەکەی گەمارۆدا، بەڵام له ئەنجامدا هێزێکی تری تـەیاری توانی گەمارۆکه بشکێنێتو ڕێگه بۆ پاشەکشێکردنیان خۆشبکات[2].

نـاکۆکی بـەردەوامی نێـوان هێـزو دەسـەڵاتە جیاوازەکـان لەسـەر پلـەی میرایەتی بەرواری له ئەنجامدا بـه کوشتنی (محەمـەد بـەگی تەتـەرخان بـەگ) کۆتایی هات له دەورووبـەری ساڵی (١٨٩٠)[3]، ئـەم رووداوە نـاکۆکی نێـوان بەرواریـیەکانو تەیارییـەکان قووڵتردەکاتـەوە، چـونکه مـیری نـوێ (حـاجی ڕەشـید بـەگی تەتـەرخان) گومـان دەکـات گوایـە (مـەلیك یوسـف)ی سـەرۆکی تەیارییەکان دەستی له کوشتنی باوکیدا هەیە، بۆیە وەك پرۆسەیەکی تۆڵـە، دوودڵـی نـەکرد لـه کوشـتنیدا لـه ١٥ی ئـەیلولی (١٩٠٠)، پرۆسـەی لـه یـەکتر کوشتنو پەلاماردان له ساڵی دواتردا بەردەوامبوو، بۆ وێنه تـەیاری خـواروو پـەلاماری چـەند گونـدێکی بەرواریـیەکانیانـداو ژمارەیـەك لـه خەڵکەکـەیان

---

[1] یوسف ملك خؤشابا: حقیقة الاحداث الاثوریة المعاصرة، بغداد، بلا، ٢٠٠٠، ص١٨.

[2] المصدر نفسه، ص١٩.

[3] کامران عبدالصمد الدوسکي: المصدر السابق، ص١٠٢.

کوشت[1]. هەرچی حاجی ڕەشید بەگی بەرواریيە بەرامبەر دوژمنکارییەکانی تەیاری بە هاوکاری عەشیرەتەکانی بادینان وەرزە پەلاماری ڕێکدەخستو چەندین قات تۆڵەی لێدەکردنەوە، بەرامبەر کوشتنی خزمەتکارێکی (محەمەد دەشتایی)، سەرۆکی ئاشورییەکان (ئیسماعیل)ی کوشت، وەڵامی ئەوانیش کوشتنی (سەعید بەگ)ی برای بوو لە گوندی (هرور) لەگەڵ سوتاندنی کوخێکدا بە هەزار سەر مەڕەوە[2].

عەشیرەتەکانی (دۆسکی، مزوری، زەیدەکیە، بۆتان، شەرەفان) کە پێدەچێت بۆ تۆڵەی (سەعید بەگ) بێت، ساڵی (١٩٠٥) پێکڕا نزیکەی (٤) هەزار چەکداریان کۆکردەوەو چوونە سەر (ئاشووتییەکان) کە لقێك بوون لە تەیارییەکان، وێڕای کوشتنی زۆرێکیانو سامانێکی بێئەندازەشیان هێنایەوە، هەڵوێستی عوسمانییەکان تەرەفگیرانە بوو، چونکە کاتێك لە موسڵەوە کەتیبەیەکی سوارەیان بۆ بەرگرتن لە شەڕەکە ڕەوانەی ناوچەکە کرابوو، دایانە پاڵ عەشیرەتەکانی کورد، بە بیانووی ئەوەی بریتانییەکان لە پشتی پەردەوە تەیارییەکان هاندەدەنو پشت بە ئەوان هەڵگەڕاونەتەوە[3].

بەڵام دوای ئەم ڕووداوە عوسمانییەکان بڕیاریاندا هەردوو لایەنی ناکۆك پێکبهێننەوە، بۆ ئەو مەبەستە والی (وان) ڕاسپێردرا، ئەویش لای خۆیەوە هەر یەك لە: راغیب بەگی موتەسەریفی هەکاری، شیخ عەبدولحەمید پاشا (کەسایەتی لە هەکاری)، شەکیب بەگ (بەڕێوبەری تەحریر لە هەکاری)، تەوفیق بەگ (پیرەمێرد)، لە ویلایەتی (موسڵ)یش: عەونی بەگ (میر لیوای

---

[1] یوسف ملك خۆشابا: المصدر السابق، ص ص١٩-٢١

[2] صدیق الدملوجي: امارة بهدینان، ص١٠٠.

[3] المصدر نفسه، ص١٠١.

جەندرمە)، مەحمود ئەفەندی ئەلعومەری (کەسایەتی)، نوری بەگ (قایمقامی ئامێدی)، شێخ بەهائەدینی (بامەڕنی)، سدیق ئەلدەمەلوجی، هەردوولا لە گوندی (دەشتان) کە دەکەوێتە سەر زێ کۆبوونەوە، گەورە پیاوانی تەیاریو سەرۆکەکانیانو حاجی رەشید بەگو موختاری گوندەکانی بەرواری ئامادەی ببوون، بەلاَم لە کۆتایدا پرۆسەی پێکهێنانەوەکە سەرینەگرت، چونکە خاوەن مافەکانی تەیاری دەستیان لە مافەکانی خۆیان هەلّ نەگرت[1]

لە ئەنجامدا هەردوو لای ناکۆك چوونەوە سەر دۆخی شەڕو ناکۆکی جاران، ئەوە بوو سالّی ١٩٠٨ (ڕەشید بەگ)ی بەرواری بە نزیکەی (٨) هەزار چەکداری بەرواریو عەشیرەتەکانی دیکەی ناوچەکە، هەلّمەتێکی گەورەی بردە سەر تەیارییەکان، هێرشبەران بە ئاڕاستەی دۆلّی (لێزان)دا چوون، بە هەر گوندێکدا گوزەریان دەکرد وێرانو تالاَنیان دەکردو دەیانسووتاند، بەلاَم بەهۆی بەرهەلّستیکردنی تەیارییەکانەوە نەیانتوانی لە پردی لێزان بپەڕنەوە[2].

وەك لە پێداچوونەوەی ئەو ناکۆکییە عەشیرەتییانەدا ڕووندەبێتەوە، دەسەلاَتکارانی عوسمانی لە ناوچەکە، ڕاهاتوون لەوەی سیاسەتێك پەیڕەوبکەن کە تاڕادەیەك لەسەر بناغەی پشتگوێخستنی سەرۆك عەشیرەتە بچووکەکانو ئاغاکان وەستابوو، هەروەها تا ڕادەیەك ئازادکردنیان لە بەڕێوەبردنی کاروبارە نێوخۆییەکانیانو خەریکبوون بە ناکۆکیو پێکدادانی نێوخۆییەوە، لەو چوارچێوەشدا یەکالاَکردنەوەی

---

[1] صديق الدملوجي ،المصدر نفسه، ص ص١٠٣-١٠٤.

[2] كامران عبدالصمد الدوسكي: المصدر السابق، ص١٠٤.

ناکۆکییەکانیان بە ئارەزووی خۆیان، ئەمەش بێگومان وەك لە ڕاپۆرتێکی جێگری کۆنسوڵی بریتانی لە دیاربەکر هاتووە کە لە ١٣ی ئازاری ١٩١٤ بۆ باڵوێزی وڵاتەکەی لە ئەستەنبوڵ هەناردووە: "سەرقاڵی دەکردن، ئیدی بەو جۆرە سەرۆك عەشیرەتەکان نەیاندەتوانی ڕیزەکانی خۆیان یەکبخەن و بەرهەڵستییەکی مەترسیدار دژ بە حکومەت پێکبهێنن" [١].

---

[١] بڕوانە ڕاپۆرتی ژمارە (FO.195/٢٤٥٨)ی کونسوڵی بریتانی لە موسڵ کە لە ١٣ی ئازاری ١٩١٤ بۆ (سیدی مالیت) ی سەفیری وڵاتەکەی لە ئەستانبول نوسیوە. وەرگیراوە لە: عثمان علي، الكرد فی الوثائق البريطانية، ص١١٠.

## بەشی چوارەم:

### باسی یەکەم/

کودەتای ۱۹۰۸ و

وەرچەرخانی سیاسەتی عوسمانی بەرامبەر بە عەشیرەتەکان

### باسی دووەم/

رووداوەکەی شێخ سەعید و

کاریگەری بۆ سەر پەیوەندی نێوان عەشیرەتەکانی

ناوچەکەو عوسمانیەکان

### باسی سێیەم/

بزاڤەکەی شێخ عەبدولسەلامی دووەمو هەڵویستی

ئیتحادییەکان

## باسی یەکەم:

## کودەتای ١٩٠٨و

## وەرچەرخانی سیاسەتی عوسمانی بەرامبەر بە عەشیرەتەکان

ساڵی ١٨٨٩ دەستەیەك لە خوێندکارانی کۆلێجی پزیشکی سەربازی سوڵتانی لە ئەستەنبوڵ ڕێکخراوێکی نهێنیان بە ناوی "کۆمەڵەی ئیتحادی عوسمانی" پێکهێنا[1]. ئامانجی سەرەکیی ئەم ڕێکخستنە بەرەنگاربوونەوەی بەڕێوبەرێتیی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمو گێڕانەوەی دەستوورو پەرلەمان بوو[2]. کەسانێك کە لە بنەچەوە کوردبوون، لە سەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەی ئیتحادی عوسمانییەوە ڕۆڵی بەرچاویان تێدا هەبوو، دوو کەس لە چوار ئەندامە دامەزرێنەرەکەی کە "ئیسحاق

---

[1] ارنست رامروز: ترکیا الفتاة و ثورة ١٩٠٨م، ت. صالح احمد العلي، مکتبة الحیاة، بیروت، ١٩٦٠، ص٤٩.

ساڵ ١٨٩٥ لە پاریس پاش ئەوەی ڕێبەرایەتیکردنی ڕێکخراوەکە دەخرێتە ئەستۆی (ئەحمەد ڕەزا)، نێوی ڕێکخراوەکە کرایە (کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی)، ساڵ ١٩٠٦ دوابەدوای کردنەوەی لقی ڕێکخراوەکە لە زۆربەی بەشەکانی ئیمپراتۆرییەتەکە و وڵاتانی دەوروبەریدا، نێوی ڕێکخراوەکەیان گۆڕی بۆ (کۆمەڵەی تەرەقی و ئیتحاد)، دواجار ساڵ ١٩٠٧ دوای ئەوەی لەگەڵ "کۆمەڵەی ئازادی عوسمانی"دا کە ساڵێك بەر لەوە لە سلانیك لە لایەن کۆمەڵێك ئەفسەرەوە دامەزرابوو، ناوی ڕێکخراوەکە بۆ شێوازە کۆنەکەی خۆی (کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی) گۆڕایەوە. بڕوانە: شەریف پاشای خەندان، بیرەوەریەکانی بەرهەڵستێك: بەربەرەکانیی کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرقی، و. زریان ڕۆژهەڵاتی: بنکەی ژین، سلیمانی، ٢٠٠٦، ل٢٢; ئێریك جەی. زۆجەر: سەرچاوەی پێشوو، ل ل١٥٠-١٥٥.

[2] شکیب ارسلان: تاریخ الدولة العثمانیة، جمع وتحقیق: حسن السماحي سویدان، ط١، دار ابن کثیر، دمشق، ٢٠٠١، ص٣٢٧.

سکوتی[1] و عەبدوڵڵا جەودەت"ن[2] کوردبوون، پاشتریش ژمارەیەکی تری ناسراوی کورد چوونە ڕیزی جوڵانەوەکەو بە گەرمی تێکەڵاوی چالاکییەکان بوون لەوانە: شێخ عەبدولقادری نەهری کوڕی شێخ عوبێدوڵڵا، عەبدولڕەحمان بەدرخان، حیکمەت بابان، ئیسماعیل حەقی بابان، سولەیمان نەزیف...[3]

کۆمەڵەی ئیتحادی عوسمانی بە دڵنیاییەوە بۆ یەکێتی ڕەگەزە (ئیتنییەکان) دەگەڕێتەوە کە هێزی تورکی عوسمانییە لاوەکان بوو، لە سایەی ڕێبەرایەتی "ئەحمەد ڕەزا"دا لقی پاریسی کۆمەڵەکە لەساڵی ١٨٩٥ بەدواوە ڕۆژنامەی "مەشوەرەت"ی بە زمانی تورکی و فەرەنسی دەرکرد،

[1] ئیسحاق سکوتی(١٨٦٨-١٩٠٢) ڕۆشنبیر و سیاسیی لە خێزانێکی کورد لە دیاربەکر لە دایك بووە، لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقییە، لە ڕۆژنامەکانی (عوثمانلی و کوردستان) بە زمانی تورکی عوسمانی نوسینەکانی بڵاوکردۆتەوە. بۆ زیاتر بڕوانە: فەرهاد پیربال، ڕۆژنامەگەری کوردی بە زمانی فەڕەنسی، سەنتەری برایەتی، هەولێر، ١٩٩٨، ل١٨.

[2] عەبدوڵڵا جەودەت(١٨٦٩-١٩٣٢) ڕۆژنامەنووس و چالاك لە بواری سیاسی، لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقییە، لە شارۆچکەی عەرەبگیر لە بنەماڵەیەکی کورد لە دایك بووە، لە ساڵی ١٨٩٤ پزیشکی سەربازیی لە ئەستەنبوڵ تەواوکردووە، لەبەر چالاکی سیاسی زیاد لەجارێ گیراوە، دواجار ساڵی ١٨٩٧ بۆ تەرابلوس دوورخراوەتەوە، لەوێشەوە توانی خۆی بگەیەنێتە ئەوروپا و درێژە بەکاری سیاسی بدات، بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی ژیانی، بڕوانە مالمیسانژ: القومية الكردية و د. عبدالله جودت في مطلع القرن العشرين، ت. شكور مصطفى، ط١، اربيل، ٢٠٠٠.ص ص٩-١٨ و٨٤-٩١.

[3] وەدیع جوەیدە: جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد، ل ل٢٢٥-٢٢٦.

دەستەکەش زیاتر خۆیان بە "ژۆن تورك-تورکە گەنجەکان" ناودەبرد، وەك "عوسمانییە گەنجەکان" کە ٣٠ساڵ پێشتر ئەو ناوەیان لە خۆیان نابوو[1].

لە ماوەی چەند ساڵی داهاتوودا ڕێکخراوەکە لە سەرخۆ پەرەیگرت و ساڵی ١٨٩٦ پلانێك کە کۆمەڵەکە بۆ ڕووخاندنی تەختی سوڵتان عەبدولحەمید دایانڕشتبوو، ئاشکرابوو، لە ئەنجامدا پاش ئەوەی ژمارەیەك لە ئەندامەکانی لە ترسی ڕاوەدوونان بەرەو دەرەوە هەڵهاتن، هەندێکی تریان لە لایەن پۆلیسی سوڵتانەوە دەستگیرکران و دوورخرانەوە بۆ شوێنە دوورەدەستەکانی دەوڵەتی عوسمانی، لەوانە: شێخ عەبدولقادری شەمزینی کە لەگەڵ بیست کەس لە ئەندامانی خێزانەکەیان دوورخرایەوە بۆ مەککە[2]، هەرچی "عەبدوڵلا جەودەت"ە، بۆ تەرابولسی ڕۆژئاوا (لە لیبیای ئێستا) و "ئیسحاق سکووتی" بۆ دوورگەی ڕۆدس دوورخرانەوە، ئەم دوو دامەزرێنەرەی "ئیتحادی عوسمانی" توانیان لە ساڵی ١٨٩٧ خۆیان بگەیەننە "جنیف"ی پایتەختی سویسراو لەوێ ڕۆژنامەی "عوثمانلی" بە هەردوو زمانی تورکی و فەڕەنسی دەربکەن[3].

---

[1]ئێریك جەی. زۆجەر: سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٠.

ژۆن تورك وشەیەکی فەرەنسییە بە واتای (تورکی گەنج) بەو کەس و ڕێکخراوانە دەڵێن لە دەرەوەی وڵات بەشداری ڕیزەکانی ئۆپۆزسیۆنیان کردووە، ئەو عوسمانیانەی کە دژایەتی سیاسی سوڵتان عەبدولعەزیزیان دەکرد بە ژۆن تورکەکان و بزوتنەوەکەشیان بە بزوتنەوەی یەکەمی ژۆن تورك ناوزەد دەکرد، بەڵام ناوەکە زیاتر بۆ ئەو ڕێکخراوە عوسمانیانە بەکاردەبرێ، کە لەکاتی سوڵتان عەبدولحەمیددا لە دەرەوەی وڵاتەوە هەوڵی ڕووخانی حکومەتیان دەدا. بڕوانە: شەریف پاشای خەندان: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩.

[2]ارنست رامروز: المصدر السابق، ص ص ٦١-٦٣; جەعفەر عەلی ڕەسول: سەرچاوەی پێشوو، ل ل١٢١-١٢٢.

[3]مالمیسانژ: المصدر السابق، ص ص١٠-١١.

لە ساڵی ١٩٠٦ بەدواوە هەڵبەت لەگەڵ زۆربوونی ڕێژەی سەربازان لە ڕیزی ئەندامانی و گەیشتنی ڕێکخراوسازانی وەك دوکتۆر نازم[1] و دوکتۆر بەهائەددین شاکر[2]، یان هێشتا تەلعەت پاشا، کۆمەڵە بەرەو ناسیۆنالیزمی تورك یا هەتا بەرەو پان تۆرانیزم هەڵخلیسکا[3].

---

[1] دوکتۆر نازم (١٨٧٣-١٩٢٦) لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی بوو، دوای تەواوکردنی خوێندنی پزیشکی لە پاریس لەگەڵ (ئەحمەد ڕەزا)دا پێکەوە کاری سیاسییان کردووە، دوای شۆڕشی ١٩٠٨ کراوەتە وەزیری مەعاریف. بڕوانە: شەریف پاشای خەندان: سەرچاوەی پێشوو، ل٤١.

[2] بەهائەدین شاکر (١٨٧٤-١٩٢٢) سەرکردەو بەڕێوبەرێکی ئیتحاد و تەرەقی بووە، ساڵ ١٨٩٦ ئەکادیمیای پزیشکی سەربازی بە پلەی کاپتن تەواوکردووە، ساڵی ١٩٠٥ هەڵهاتووە بۆ میسر، لەوێشەوە بۆ پاریس، پاش ماوەیەك بەنهێنی گەڕاوەتەوە ئەستەنبوڵ و ڕۆڵێکی کارای لە ڕێکخستنی ئیتحاد و تەرەقیدا گێڕاوە و بەردەوام سەبارەت بە تواندنەوەی نەتەوەکانی تر و بە تورککردنیان کۆبوونەوە و کۆنفرانسی بۆ گەنجە تورکەکان دەگرت و هانی دەدان بۆ ئەوەی دوژمنایەتی پێکهاتەکانی تر بکەن. پاش سەرکەوتنی شۆرشی ١٩٠٨ ئەرکی ڕاپەڕاندنی کاروباری پزیشکی پێ سپێردراوە. بڕوانە: شەریف پاشای خەندان: سەرچاوەی پێشوو، ل٤٢; مالمیسانژ، جڤاتا هێڤی تەلەبەیێ کوردان١٩١٢-١٩٢٢، یەکەم ڕێکخراوی یاسایی تەلەبەی کورد، و. زریان ڕۆژهەلاتی: چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٨، ل٣٤.

[3] حەمید بۆزئەرسەلان: مێژووی تورکیای هاوچەرخ، و. نەجاتی عەبدوڵلا، دەزگای چاپ و بلاوکراوەی ئاراس، چ١، هەولێر، ٢٠٠٩، ل٢٦. پان تۆرانیزم یا تۆرانیزم )بەو بزاڤە دەوترێت کە ئامانجی ڕێکخستنەوەو لە کۆتایدا یەکگرتنی هەموو ئەو کەسانەیە کە گومان دەکرێ بە بنچینە تورکن و ڕەگ و ڕیشەیان دەگاتەوە تۆران، واتە ئەو ناوچە نادیارە خەیاڵی و بەهەشت ئاسایەی دەشتەکانی ئاسیای ناوەڕاست، سنوورەکانی تۆران لەلای ڕۆژهەڵاتەوە چین، لە باشوورەوە تیبت، هیند و ئێران، لە ڕۆژئاواوە دەشتەکانی قەپچاق و دەریای قەزوین، لای باکووریشەوە جارێکی تر دەشتەکانی قەپچاق. بڕوانە: جیکۆب لاندۆ: پانتورکیزم سەدەیەك پەلکوتان بۆ فراوانخوازی، و. ئەبوبەکر خۆشناو، چاپخانەی سەردەم، چ١، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل٨.

له هه‌ڵمه‌تێكدا ئه‌فسه‌رانێك له‌وانه "نیازی به‌گ‌و ئه‌نوه‌ر به‌گ" كه ئه‌ندامی كۆمه‌ڵه‌كـه بـوون، بـه سـوپاكانیانه‌وه لـه مه‌كـه‌دۆنیا یـاخیبوون‌و داوای گه‌ڕانـه‌وه‌ی ده‌سـتووریان كـرد، یه‌كـه‌مجار سـوڵتان هه‌وڵیـدا بـه نـاردنی ژماره‌یـه‌ك ئه‌فـسه‌ری متمانـه‌پێكراوی خـۆی، هـه‌روه‌ها بـه هێـزی سـوپای ئه‌نه‌دۆڵی یاخیبوونه‌كه سه‌ركوتبكات، به‌ڵام سه‌ركه‌وتوو نه‌بوون، سـه‌ره‌نجام سوڵتان سه‌ری دانه‌واندو له ٢٣ی تـه‌مووزی ١٩٠٨ ڕایگه‌یاند كه ده‌سـتوور به‌ته‌واوی جێبه‌جێبكرێت‌و په‌رله‌مانیش كه (٣٠) ساڵ ده‌بـوو هه‌ڵواسـرابوو، هێنرایه‌وه جێگه‌و بانگه‌وازی هه‌ڵبژاردن درا[١].

كاتێك هه‌واڵه‌كه ئاشكرابوو، له‌٢٤ی ته‌مموزه‌وه ته‌واوی شـاره گـه‌وره‌كانی ئیمپراتۆریا به‌تایبه‌ت "ئه‌سته‌نبوڵ" ئاهه‌نگگێڕان‌و برایه‌تیان به‌خۆوه‌بینی‌و تیایـدا هـه‌مووان پێكـه‌وه شـادی كۆتـایی "ملهوڕگـه‌رایی"یـان ده‌گێـڕاو دروشمه‌كانی "سه‌ربه‌ستی، یه‌كسانی، برایه‌تی‌و عه‌داله‌ت" یـان ده‌وتـه‌وه[٢]. ته‌نانـه‌ت كورده‌كـانی ئه‌سـته‌نبوڵیش بـه جلـی نه‌تـه‌وه‌یی‌و ڕوخـسارێكی شـادمانه‌وه به‌شـداری خۆشـییه‌كانیان كـرد، به‌تایبـه‌ت پـاش ئـه‌وه‌ی زیندانییه‌كان ئازادكران‌و دوورخراوه‌كان گه‌ڕانه‌وه[٣].

---

[١] ئێریك جه‌ی. زۆچه‌ر: سه‌رچاوه‌ی پێشوو، ل١٥٦. عه‌بدولعه‌زیز یامولكی: سـه‌رجه‌می به‌رهه‌می، یه‌كه‌م به‌رگ، ئاماده‌كردنی:صدیق سالح، چاپخانه‌ی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٥٥.

[٢] حه‌مید بۆزئه‌رسه‌لان: سه‌رچاوه‌ی پێشوو، ل٢٦.

[٣] قدري جميل باشا (زنار سلوبی): مسألة كردستان، ط٢، بيروت، ١٩٩٧، ص٣٢.

کـورد بـۆ یەکـەمجار دوای کودەتاکـە لـە سـاڵی ١٩٠٨ لـە پایتـەختی عوسمانیـدا "کۆمەڵـەی تـەعاون و تـەرەقی کـورد"یـان دامەزرانـد[١]، جێـی ئاماژەپێکردنــە تــا ئەوکاتــە تورکــەکان کاراکتــەری شــۆڤێنی و هەســتی تۆرانـچێتی خۆیـان ئاشـکرا نـەکردبوو[٢]، بەگـشتیش ئـەو تێڕوانینـە لـەنێو خەڵکـدا باڵادەسـت بـوو کـە ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی لەسـەر لێـواری قۆنـاغێکی نـوێی برایەتیدایـەو ژیـان تاڕادەیـەك بـەرەو باشـتر دەڕوات، سـەرکردە نەتەوەییـەکانی کـوردیش پـشتگیری کودەتاکـەیان کـرد بـەو ئومێـدەی ڕژێمـی نـوێ داخوازییـە نیـشتمانییەکانی کـوردان جێبـەجێبکات، لەڕاستیشدا ئیتحادییەکان لەرۆژە بەراییەکانی کودەتاکەدا، کاتێك هەستیان بـەلاوازی هەڵوێـستی خۆیـان کـرد، بـۆ بەدەسـتهێنانی پـشتگیری ڕێکخـراوە سیاسیی و هەروەها سەرۆك عەشیرەتەکانی کورد تێکۆشـان[٣]، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا کۆمـەڵێك لـە شـێخان و سـەرۆك عەشـیرەتەکانی کـورد بـە تـرس و گومانــەوە پێــشوازیان لــە دەســەڵاتی نــوێ کــرد، چــونکە دەترســان دەستکەوتەکانیان لە دەستبدەن[٤].

---

[١]ناودارترین دامەزرێنـەرانی ئـەم کۆمەڵـە "ئـەمین عـالی بـەدرخان و شـێخ عەبـدولقادری نـەهری و قـەدری جـەمیل پاشـا" بـوو، کۆمەڵەکـە لـە چـەند شـارێکی وەکـو دیاربـەکر، بەدلیس، موسڵ، بەغداددا لقی خۆی کردەوەو بڵاوکراوەیەکی هەفتانەشی بە ناوی"کورد تعـاون و ترقـی جمعیـت غزتـسی" دەرکـرد. بـۆ زیـاتر بڕوانـە: عبدالـستار طـاهر شـریف: الجمعیات و المنظمات والاحزاب الکردیة في نصف قرن(١٩٠٨–١٩٥٨)، بغـداد، ١٩٨٩، ص ص١٩–٢٩.

[٢]مالمیسانژ: جڤاتا هێڤی تەلەبەیێ کوردان١٩١٢–١٩٢٢، ل٢٦.

[٣]جلیلـی جلیـل وآخـرون: الحرکـة الکردیـة، ص ٦٦; حامـد محمـود عیـسی: القـضیة الکردیة فی ترکیا، مکتبة مدبولي، القاهرة، ٢٠٠٢، ص ص٩٥–٩٦.

[٤]ن. لازاریف و آخرون: تاریخ کردستان، ص١٦٨.

لـە ویلایـەتی موسڵـیـشدا کودەتاکـە ئـەو دەنگدانـەوەی نـەبووە، چـونکە زۆرینەی دانیشتوانی ویلایەتەکە موسڵمان بـوون، بۆیـە لـە چاوی ئەوانـەوە سیاسـەتەکانی ئیـسلامگەرایی و کوردڕاکێـشی سـوڵتان عەبدولحەمیـد، ئـەو سـوڵتانەی وەك خەلیفەیــەکی نموونــەیی لــە یادەوەریانــدا وێنــاکردبوو[1]، بەشێکیشیان ڕاشکاوانە داوای پـەیڕەوکردنی شـەریعەتیان دەکـرد و بڕوایـان بە دروشمەکانی یەکسانی و برایەتی نەدەکرد، کە ڕژێمی نوێ بانگەشەی بـۆ دەکرد، بگرە ڕەتیـشیان دەکـردەوە[2]، بـەلاَم زۆری پێنـەچوو کـەش و هـەوای شـادی ڕۆژەکـانی سـەرەتا بـوون بـە ناهـەمواری، ئەگـەرچی پـاش گێڕانـەوەی دەسـتوور ئەنـدامانی کۆمیتـە دەسـەلاَتیان نەگرتەدەسـت[3]، بـەلاَم لـە مـاوەی چـەند مانگێکـدا وەك "ڕۆحـی دەوڵـەت" خـۆی نیـشاندەداو بـە نوێنەرایـەتی

---

[1] وەدیع جوەیدە: جولاَنەوەی نەتەوەیی کورد، ل٢٣٣.

[2] بڕوانـە دەقـی نامەکـەی برتـرام دکـسون بـۆ جـیرارد لۆتــەری سـەفیری بریتانیـا لـە ئەسـتەنبوڵ لـە: عثمـان علـي: الکرد في الوثـائق البریطانیـة، ط١، اربیـل، ٢٠٠٨، ل١٠٢. نوسەری نامەکە لە ١٣ی حوزەیرانی ١٩٠٩دا گەشتێکی بەناوچەکانی موسڵ و سلێمانی و ناوچەکانی سنووری ئێراندا کردووە.

[3] جێگەی پرسیارە دوای گێڕانەوەی دەستوور کۆمەڵـە سوڵتانی لەسـەر تـەخت لانـەدا و ئەندامەکانیـشی دەسـەلاَتیان نەگرتەدەسـت، لـە راسـتیدا وێـڕای ئـەوەی کـە سـوڵتان ڕای گشتی داگیرکردبوو، کارکردنەوەی بە دەستوور پێگەی لەنێو خەڵکدا بەهێزترکرد، بۆیـە لە دۆخێکـی وادا نـەدەکرا لابدرێت، بـە دیـوێکی تریـشدا ئیتحادییـەکان هەسـتیان دەکـرد کەمتر دەتوانن جڵەوی حکومەت بخەنەدەست خۆیـان، چونکە لەنێویانـدا کەسایەتییەکی سەرکردەی بەئەزموون لە کاری سیاسی و ناسراوبێت لە ئەستەنبوڵ نەبوو، بۆیە کۆمەڵـە پێـی باشـبوو بەشـێوەیەکی کـاتی لـە پـەراوێزی دەزگاکانـدا بمێنێتــەوەو لـەدوورەوە چاودێری ڕەوشـەکە بکـات و ئـەرکی پاراسـتنی ئازادییـە دەسـتوورییە نوێیەکـە بگرێتـە ئەستۆ. بڕوانە: دومون و فرانسوا جورجو: "موت امبراطوریـة ١٩٠٨-١٩٢٣"، فـی روبیر مانتران ، تاریخ الدولة العثمانیة، ج٢، ت. بشیر السباعي، دار الفکر للدراسات، القـاهرة، ط١، ١٩٩٣، ص ص ٢٤٥-٢٤٦.

دەسـتەیەك لـە ئەفـسەران هـەر زوو بـوو بـە زمانحـاڵی سیـستمێکی تـازەی داپڵۆسێنەر[1].

دژە شۆڕشی نیسانی ١٩٠٩[2]شتەکانی هێنایە پێش، لایەنگرانی سوڵتان لـە ئەسـتەنبوڵ ڕاپـەڕینو توانیـان ئەنـدامێکی زۆری کۆمەڵـەی ئیتحـادو تـەرەقی لـە شـارەکەدا لەناوبـەرن، کاتێـك سـوڵتان نـەیتوانی تاوانبـاران سـزابدات، یەکەیـەکی سـوپا لـە سـالۆنیکەوە بـەرەو ئەسـتەنبوڵ کـشاو یاخیبوونەکــەی کپکــردەوە[3]و کۆشــکی یڵــدزی تــالآنکردو ســوڵتان عەبدولحەمیـدی دووەمـی لەسـەر تـەخت هێنایـە خـوارەوە (٢٧ی نیـسان)و محەمەد ڕەشادی برا بچووکی"محەمەدی پێنجەم" لە جێگەی دانا[4].

کۆمەڵـەی ئیتحـادو تـەرەقی هاوکـات لەگـەڵ خۆگـۆڕینی لەسـەرخۆی بـۆ پارتێکی تاقانـە، لـە دوای خامۆشکردنی بزاڤی دژە شۆڕشـەوە تادەهـات بـە ئاشـکراتر دەبـو بـەزمانحاڵی ناسـیۆنالیزمی تـورك، بـەگوێرەی دەربرینـی (حوسـێن یالــچین)ی ڕۆژنامەنووسـی سـەر بـە ئیتحادییـەکان" کۆمیتـەی ئیتحادو تەرەقی" بەتەواوی خۆی لەگەڵ تورکیزم دەناسێتەوە"، هەربۆیە لـە جێگـەی ئـازادی ڕادەربڕینـی یەکـەمین مانگـەکان، سیاسـەتی تۆقانـدنی

---

[1] حەمید بۆزئەرسەلان، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨.

[2] مەبەست ڕووداوی ٣ی مارتـە بـە گـوێرەی ڕۆژمێـری ڕۆمـی کـە دەکاتـە ١٣ی نیـسانی ١٩٠٩. بۆ زانیاری لە بارەی ئەم دژە شۆڕشە بڕوانە: شکیب ارسلان: المصدر السابق، ص ص٣٣٤-٣٣٧. ئێریك جەی.زۆجەر: سەرچاوەی پێشوو، ل ل١٦٣-١٦٩.

[3] وەدیع جوەیدە: جولآنەوەی نەتەوەیی کورد، ل٢٢٨.

[4] حەمیـد بۆزئەرسـەلان: سەرچـاوەی پێـشوو، ل ل٢٩-٣٠. بـۆ زانیـاری زیـاتر لـەبارەی لێخرانی سوڵتان و تالآنکردنی کۆشکی یڵدز بڕوانە: عەبدولعـەزیز یـامولکی: سەرچـاوەی پێشوو، ل ل٦٩-٧٨.

ڕۆژنامەنووسـان و قەدەغـەکردنی زۆربـەی ڕێکخراوەکـان و سـەرکوتکردنی هەموو ئەوانەی لەگەڵیاندا ناکۆك بوون، گرتەبەر[1].

لـە ڕاسـتیدا ئـەو گوتـارەی لـە (ژمـارە ٢ی سـاڵی ١٩٠٩)دا لـە کۆڤـاری " پـەیمان" ی سـەر بـە ئیتحادییـەکان لـە دیاربـەکر بلاٌوبۆتـەوە، بـەڕوونی هەڵوێـست و بۆچـوونی ئیتحادییـەکان بەرامبـەر عەشـیرەتەکانی کوردسـتان ئاشکرادەکات، کەتێیدا هاتووە: "مەشرووتییەت[2]ئاغایەتی هەڵوەشاندەوە، ئاغایەتی نەما، عەشیرەت نەما، بەلاٌم نا! عەشیرەت هەیە، بەلاٌم وەکو جاران نییە، ئێستا هەر نەتەوەیەك عەشیرەتێکەو ئێمەش عەشیرەتی عوسمانی... ئێمە ئێستا عەشیرەتێکی گەورەین، لە موسڵمانەوە بگرە هەتا مەسیحی، ئەوەی لە دڵەوە وابەستەی عوسمانی بێت، ئەندامێکی ئەم عەشیرەتەیە"[3]. هەڵبەتـە ئەمـە بۆچـوونی ژیرانـەی ژۆن تورکـەکان بـوو کـە لـە ژێـر نـاوی عەشـیرەتی عوسمانیـدا دەیانویـست سـەرجەم نەتـەوە جیاوازەکـان بکەنـە تورك.

لـە چوارچـێوەی ئـەو وێنـاو تێڕوانینـەدا بـۆ عەشـیرەتەکان، حکومـەت سەبارەت بە چەك داماڵین و هەڵوەشاندنەوەی تیپەکانی سوارەی حەمیدی لە

---

[1] حەمید بۆزئەرسەلان: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦.

[2]مەبەسـت مەشـرووتییەتی دووەمـە کـە وەك قۆنـاغی ئـازادی ناودەبرێـت و لـە ٢٣ی تـەمووزی١٩٠٨وە دووبـارە دەسـتووری بنـچینەی بـە فـشاری ئیتحادییـەکان کەوتـەوە مەیـدانی جێبـەجێکردن تـا ٢١ی کـانوونی دووەمـی ١٩١٨ بـەردەوامبوو، هەرچـی مەشـرووتییەتی یەکەمـە ئـەوا لـە ٢٣ی کـانوونی یەکـەمی ١٨٧٦ەوە کـە دەسـتووری بنچینەیی پەسەندکرا، تاکو ١٣شوباتی ١٨٧٨ بەردەوامبوو. بڕوانە: شەریف پاشای خەندان: سەرچاوەی پێشوو، ل١٦.

[3]مالمیسانژ: جڤاتا هێڤی تەلەبەیێ کوردان، ل ل٤٥-٤٦.

ئـەیلوولی ۱۹۰۸ دا فـەرمانێکی دەرکـرد، بـەڵام کـاری پێنـەکرا، چـونکە دەسـەڵاتدارە لۆکاڵییـەکان نـە هێـزو نـە خواسـتی چـوونە نێـو نـاکۆکیو روبەڕووبوونـەوەیان هـەبوو لەگـەڵ سـەرۆکە بـەهێزەکانی کـورددا، هەرچـی عەشیرەتەکانیشە ئەوانەی بەشداری تیپەکانی سوارە بـوون، بـە تونـدی دژی هەڵوەشاندنەوە، یا چوونە ڕیزی سوپای نیزامی دەوەستانەوە[1].

لـە بـەهاری ۱۹۰۹دا بەشـێکی تیپـەکانی سـوارەیان لـە چـەك دامـاڵی، لەڕاستیدا ئەندامەکانی کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی نەیانتوانی ئەو تیپانـە بـە تــەواوی هەڵبوەشـێننەوە، چـونکە دەترسـان هەڵوەشـاندنەوەی ببێتـە سەرچـاوەی ڕاپـەڕینێکی بـەرفراوانو گـشتگیر لـەنێو کوردانـدا، لـە دانیـشتنێکی پەرلەمانـدا لـە ڕۆژانـی ۸و ۱۰ی تـەمووزی ۱۹۰۹ پێـشنیاری ئەوەکرا ئەفسەرەکانی سوارە ملکەچی سەرجەمی یاساو ڕێساکانی سوپای نیزامی بکرێن، بەڵام زۆرینەی ئەوانەی بەشداری گفتوگۆکانیـان کـرد دژ بـەو پێشنیارە بوون، بە بیانووی ئەوەی ئەو بڕیارە پشێویو نائارامی لە نێو کوردانـدا لێدەکەوێتـەوە، بـەدیوێکی تریـشدا گوایـە ئـەو تیپانـە ئـامرازێکی تایبـەتو هـەرە پێویـستن بـۆ دەوڵـەتی عوسمـانی[2]. بۆیـە لـە ئەنجامـدا هێشتنیانەوە، بـەڵام بـە بڕیـارێکی نـوێ لـە ساڵی ۱۹۱۰ ناوەکـەیان گـۆڕیو کردیانــە (تیپــەکانی ســووکە ســوارەکان). ســاڵی ۱۹۱۲ پــاش ســەرلەنوێ ڕێکخـستنەوەیو زیـادکردنی تیپێکـی تۆپخانـە بـۆ پێکهاتـەکانی، دووبـارە ناوەکەیان گۆڕییەوەو ئەمجارە کردیانە (عەشیرەت سوارەی فیرقەلـەری) واتـە (تیپەکانی سوارەکانی عەشیرەت)[3].

---

[1] م. س. لازاريف: المسألة الكردية، ص٢٢٥.

[2] م. س. لازاريف: المسألة الكردية، ص ص٢٢٥-٢٢٦.

[3] مالمیسانژ: جڤاتا هێڤی تەلەبەیێ کوردان، ل ٣٧.

وێڕای ئەوەش تیپەکانی سوارە وەك هێزێکی ناچالاكو بێڕێز لە نێو خەڵك مایەوەو لە نێو خودی بەرپرسانیشدا متمانەی لەدەستدابوو، بەتایبەت پاش ئەوەی زۆرێك لە سەرۆك عەشیرەتە بەشداربووەکانی فەرمانەکانی دەسەڵاتیان جێبەجێنەدەکرد[1]، لە دۆخێکی وەهادا سەرکردەکانی ئیتحادو تەرقی پێچەوانەی پرنسیپەکانی خۆیان سیاسەتی پان ئیسلامیی سوڵتان عەبدولحەمیدیان پێڕەوکردو ناچاربوون لە دەرەوەی بازنەی پێکهاتەکانی تیپەکانی سوارە بۆ ڕاکێشانی سەرۆك عەشیرەتەکانی تر تێبکۆشن[2] بە تایبەت دوای دەرکەوتنی مەترسی نزیکبوونەوەی سەرۆك عەشیرەتو شێخەکانی کورد لە ئەرمەنو ڕووسیا، چونکە دڵنیابوون ئەگەر بێتو لە کاتی جەنگدا ئەو عەشیرەتانە پشتیان نەگرن، ئەوا هێز وتوانای جەنگییان درزی تێدەکەوێت، لەو پێناوەداو بۆ نزیکبوونەوە لە سەرۆکە دەسەڵاتدارەکانی کوردستان بەڵێنی هەنگوینیان ئەدا، بەلاّم سەرکەوتوو نەبوون[3].

سیاسەتی ئیتحادییەکان بەرامبەر بە عەشیرەتەکانی کورد بەتایبەت لە کوردستانی باشوور وەك "مس بێڵ" دەڵێت، سیاسەتێك بوو "بە دیوێکدا ناواخنەکەی کۆششگەلێکی بێبەرهەم بوو بۆ کۆنترۆڵکردنو سەردانەواندنیان، بە دیوەکەی تریشدا شۆڕشکردن بوو لە دژیان، لە دوای کودەتاکەی ساڵی ١٩٠٨ ەوە پشێوىو نائارامییەکان زیاتر ڕوو لە زیادبوون بوو وەك ڕوو لەکەمی، هۆکاری ئەمەش لە ڕوویەکەوە کردەوەی ستەمکارانەی ئیتیحادییەکان بوو، لە ڕوویەکی تریشەوە ئەو نیگەرانییە

---

[1] کمال مظهر احمد: المصدر السابق، ص ص٩٣

[2] دیڤید ماکداول: سەرچاوەی پێشوو، ل١٧١..

[3] کمال مظهر احمد: المصدر السابق، ص ص٩٣-٩٤.

سیاسییه بوو، که نائومێدبوون له بزاڤی دەستووری هێنایه ئاراوه، ئەم دوو هۆکـارەش ئارەزوویـەکی سـەیری بـۆ ئۆتۆنـۆمی لای گەلـه جیاجیاکانـدا خوڵقاند"[1].

لەڕاسـتیدا ڕژێمـی نـوێ لـه هۆکـاری پـشێویو نائـارامی عەشـیرەتەکان نەدەگەیـشت، سیاسـەتی لاوازکردنـی عەشـیرەتەکانی درێژەپێـداو وەك ئامرازێکیش بۆ سەپاندنی یاساو ئارامیی هەمیشه پەنای بۆ بەکارهێنانی هێز دەبرد[2]. هەر له ساڵی یەکەمی فەرمانڕەوایکردنیانەوه تورکه گەنجەکان کـاری سـەربازیو توندوتیـژی دژ بـەو عەشـیرەته کوردانـه دەسـتپێکرد، کـه پەیوەندییان لەگەڵ سوڵتانی لەکارخراو "عەبدولحەمید"دا باشبوو، لەوانه عەشـیرەتەکانی میللـیو قزڵبـاشو بارزانییـەکان[3]و هـەروەها سـەرانی شێخانی بەرزنجه.

"ئیـسماعیل حـەقی" نوێنـەری تـورك لـه بەغـدادو دەستڕۆیـشتووی نێـو کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی، له گوتارێکدا لـه ڕۆژنامـەی (تـەنین–طـنین)[4]، لـه ٢٨ی کـانوونی یەکـەمی (١٩١٠) دا ڕاشـکاوانه لــه بـارەی بــەکارهێنانی پرەنسیپی هیز دەنووسێت:

---

[1] المس بیل: المصدر السابق، ص١٣٥.

[2] غسان العطیة: المصدر السابق، ص ٥٤.

[3] ارشاك سافراستیان: المصدر السابق، ص ١٤٠.

[4] ڕۆژنامەیـەکی سیاسـی ڕۆژانـەی بـوو، بۆچـووونی کۆمەڵـەی ئیتحـاد و تـەرقی بڵاودەکـردەوە، دوای ڕاگەیانـدنی کودەتـای ١٩٠٨ لـه لایـەن"جاهیـد یاڵـچین، تۆفیـق فیکرەت، حوسێن کازم قەدری"یەوه دامەزرا، یەکەم ژمارەی له ١ی ئابی١٩٠٨ دەرچوو. بڕوانه: شەریف پاشای خەندان: سەرچاوەی پێشوو، ل٣١ .

"سەرەتا پێویستە سوپا بەهێز بکەین، ئەوە بەرنامەیەکە لە ئێستادا کاری لەسەر دەکەین، نابێ تەنها و بەشێوەیەکی هەمیشەیی پشت بە مانەوەی "لەشکری شەشەم" ببەستین، بەڵکو پێویستە هێزێکی مەزنی تۆکمەو ڕێکخراویش ڕەوانە بکەین" سەبارەت بەشێوازی بەکارهێنانی ئەم هێزەش دەنوسێت :"...بۆ ئەوەی سزاکە کاریگەریی دروستی هەبێت، پێویستە ئەو هەنگاوانە دەستنیشانبکەین، کە دەیگرینەبەر... لەنێو خەڵکانی خێڵەکیدا گردبوونەوە لە دەوری ناوە گەورەکان باوە، هەر شێخێکی بەناوبانگ سەنتەری ڕاکێشانی خەڵکە، لەپێناو بەرژەوەندی ئیمپراتۆریادا، پێویستە لە ئێستادا ئەو سەنتەری ڕاکێشانە بشکێنین! لە میسردا سەردەمی عەشیرەتو شێخانمان بینی، بەڵام ئەمڕۆ لە جوتیار زیاتر هیچی دیکە نییە، لە عیراقیشدا پێویستە سنوورێك بۆ ئەم سیستمەی ئێستا دابنێینو لە جوتیار زیاتر کەسیتر نەهێڵینەوە[1]!.

لە کۆتایدا ئەو شێوازە لە پرەنسیپو سیاسەتی ژۆن تورکەکان، هەندێ لە عەشیرەتەکانی کوردستانی باشووری نائومێد کردو ناچاری کردن بیر لەوە بکەنەوە کە پشت لە عوسمانییەکان بکەنو بچنە ژێر سایەی فەرمانڕەوایی ڕووسەکانەوە. لە ناوەڕاستەکانی ساڵی ١٩١١ شێخ محەمەد عەلی سەرۆکی عەشیرەتی تاڵەبانی نوسراوێکی ئاڕاستەی کۆنسوڵی گشتی ڕووسیا کردو داوای لێکرد عەشیرەتەکانی "تاڵەبانیو داوودەو زەنگەنەو هەمەوەند" کە لە لیواکانی کەرکوكو سلێمانی دەژێنو ژمارەیان نزیکەی (٣٠) هەزار ماڵێك دەبێت، دەخوازن بچنە ژێر سایەی حوکمڕانی ڕووسیو دووپاتیانکردۆتەوە لە دۆخێکدا ئەگەر هێزەکانی ڕووسیا بێنە کوردستانی

---

[1] غسان العطية: المصدر السابق، ص ص٥٤–٥٥.

باشوور، ئەوا لەلایەن کوردەکانەوە بەرێزەوە پێشوازی هاوکاری دەکرێن[1].
هەر لەو چوارچێوەدا لە بەهاری ١٩١٤ دا دەنگۆی ئەوە لە ئارادا بوو "جافو دزەیی" لە عوسمانییەکان نائومێد بوونو خۆیان ئامادە کردووە داوای هاوکاری لە ڕووسەکان بکەن[2]. ئەم جموجوولانە لە کاتێکدا بوو کە حوسێن بەدرخانو عەبدولڕەزاق بەدرخانی ئامۆزای[3] لە کوردستانی باکوورو ڕۆژهەڵات بەتوندی خەریکی کارو چالاکی بوونو هەوڵیان دەدا بە هاوکاری ڕووسیا بەرەنگاربوونەوەیەك لە دژی "کۆمیتەی ئیتحادو تەرەقی"ڕێکبخەن، هەر لەو چوارچێوەشدا تێدەکۆشان سەرۆکە ناوخۆکانی

---

[1] .م. س. لازاریف: المسألة الكردية، ص٢٩٣.

[2] بڕوانە: پوختەی کاروباری کاتی جەنگی جیهانی لە کوردستانی جنووبی، و. مەهاباد سالح ئەحمەد: گۆڤاری ژین، ژ١، ل١٠٠.(ئەم نوسینە لە بنەڕەتدا ڕاپۆرتێکی نوسینگەی مەندووبی مەدەنی ئینگلیزییە لە عێراق و ساڵ ١٩١٩ نوسراوە).

[3] عەبدولڕەزاق بەدرخان (١٨٦٩-١٩١٨) کوڕی نەجیب پاشای نەوەی بەدرخان بەگی میری بۆتانە، دوای خوێندنی زمانە ڕۆژهەڵاتییەکان و خوێندنی زمانی فەڕەنسی، ماوەی چەند ساڵێك وەك کارمەندێك لە وەزارەتی دەرەوە کاری کردووە، لە سەرەتای نەوتەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا سکرتێری سێیەمی باڵوێزخانەی عوسمانی بووە لە بیتەربۆرگ، لەو ماوەدا لەگەڵ هەندێ سیاسی و ڕۆشنبیری ڕووسدا ئاشنایەتی پەیدا دەکات، بەمەبەستی دوورخستنەوەی لەکاری سیاسی کراوەتە سەرۆکی دیوانی سوڵتانی، ساڵ ١٩٠٦ بە تۆمەتی کوشتنی بەڕێوبەری پۆلیسی ئەستەنبوڵ دووردەخرێتەوە بۆ باکووری ئەفریقیا، ساڵانی ١٩١١-١٩١٨ قۆناغی چالاکی سیاسی ڕۆشنبیری ئەو بوون، سەرکردەیەکی پرۆ ڕووس بووە و دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر بێنەوا ماوەتەوە، لە ساڵێ ١٩١٨ تورکەکان بێسەرو شوێنیان کردووە. محمد علي الصويركي: معجم اعلام الكرد في التاريخ الاسلامي في العصر الحديث في كردستان وخارجها، ط١، ٢٠٠٥، ص٤٢٧.

کورد، لەوانە عەبدولسەلامی بارزان، شێخ تەهای نەهری، تەنانەت ڕێبەرانی ئێزیدیش لەم کارەدا بەشداربکەن[1].

لە چوارچێوەی ناکۆکییەکانی بەڕێوبەریی نوێ لەگەڵ سەرانی عەشیرەتەکانی کوردستانی باشووردا، لە کۆتایی ساڵی ١٩١٠دا هەوڵێك درا بۆ وەرگرتنی باجێکی قورس لە کۆمەڵە عەشیرەتەکانی جاف، چونکە لە دوای دامەزراندنی ڕژێمی دەستووری نوێو بە شێوەیەکی کارەکی هیچ جۆرە باجێکیان نەدابوو بە گەنجینەی دەوڵەت، مەحموود پاشا کە تا ئەو کاتەش دەسەڵاتی بەسەر جافەکاندا هەبوو، بانگ کرا بۆ موسڵ. لەوێ بۆ ماوەی ساڵێك بە دەستبەسەری هێشتیانەوە، بەڵام ئیتحادییەکان کە زانیان ئەم سیاسەتە کاریگەریی نییەو هیچی لێ دەستگیرنابێت، ڕێگەی پاشای نێوبراویاندا بگەڕێتەوە وڵاتی خۆی[2].

هەروەها "موستەفا پاشای باجەلان" کە لە سایەی ڕژێمی سوڵتان عەبدولحەمیددا چەندین ساڵ وەك دوورخراوەیەك لە ئەستەنبوڵ مابووەوە، لەبەر ئەوەی لایەنگری بریتانییەکان بوو ساڵی ١٩١٢ لە لایەن

---

[1] بڕوانە: دایڤید ماکداول: سەرچاوەی پێشوو، ل ل١٧٠-١٧١. بۆ زانیاری لەبارەی کارو چالاکییەکانی عەبدولڕەزاق و حوسێنی ئامۆزای و کۆششەکانیان بۆ نزیکبوونەوە لە ڕووسەکان و هەڵوێستی رووسیا بڕوانە: م.س. لازاریف: المسألة الكردية، ص ص٢٣٥-٢٤١; عبدالفتاح علي يحى:"عبدالرزاق بدرخان نشاطه السياسي و الثقافي"، گۆڤاری کاروان، القسم العربي، ژ.٦٥، حوزە یرانی ١٩٨٨، ص١٢٩-١٣٢.

[2] پوختەی کاروباری کاتی جەنگی جیهانی لە کوردستانی جنووبی، ل٩٩ ; المس بيل: المصدر السابق، ص١٣٨.

ئیتیحادییەکانـەوە بـۆ ماوەیـەك وەك گومـانلێكراوێكی سیاسـی لـە بەغـداد دەستبەسەر كرا[1].

لــە دوای جــەنگی بــەڵكانیش (١٩١٢-١٩١٣) دوای ئــەوەی هێزەكــانی ئیتحـادو تـەرەقی لـە (٢٣ی كـانوونی دووەمـی ١٩١٣) بـە تـەواوی دەسـتی بەسـەر ڕەوشـی سیاسـی نێوخـۆدا گـرتو لـە پەرلەمانـدا بـوون بەدەسـەڵاتی بێركابـەر (تـا ١٩١٨)[2]، ئاڕاستـەو گروپـی ناسیۆنالیـستی تـۆرانی وەك تاقـە دەسەڵات دەركەوتن كە "زیاگۆك ئالپ"[3] بەشـێوەیەكی ڕاگەیەنـدراوو بـەهێز ئاڕاستە نوێیەكانی بڵاودەكردەوە كاتێك دەیگـوت "مانـەوەی دەوڵـەت تـەنیا بە هەڵسانەوەی نەتەوەیـەك جێبەجێـدەبیّ، ئـەو نەتـەوەش نەتـەوەی توركـە" یـان كـە دەیگـوت "سـەردەمی بـوونی كۆمـەڵێك لـە نـەژادو ڕەگـەز لـەناو ئیمپراتۆری كۆتایی پێهاتو لەناوچوو"[4].

---

[1] پوختەی كاروباری كاتی جەنگی جیهانی لە كوردستانی جنووبی، ل١٠٠.

[2]مالمیسانژ: جڤاتا هێڤی تەلەبەێی كوردان، ل ٤١ ; ئێریك جەی. زۆجەر: سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨٥.

[3]موحەمـەد ضـیا(١٨٧٦-١٩٢٤)، لـە بنەماڵەیـەكی كـورد لـە دیاربـەكر لـە دایـك بـووە، باوكی بەڕێوەبەرێكی بچووك بوو لـە شارۆچكەی كۆك ئالـب، ئەگەرچـی كـورد بـوو، بـەڵام پەروەردەیەكی عوسمانی و ڕق و كینەیەكی سروشتی لە كولتووری گوندنشینی كوردی هەبوو، لەژێر كارتێكردنی فیكـری سۆسیالیـستی فەلسەفەی دوركهایم دا بـوو، نوێنـەری دیاربەكر بوو بۆ كۆنگرەی كۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی ساڵی ١٩٠٩و تێیـدا وەك ئەنـدامی ئەنجومەنی جێبەجێكردنی كۆمەڵەكە هەڵبـژێردرا .بڕوانە، دایڤید ماكداول: سەرچاوەی پێشوو، ل٢١٣.

[4]قیس جـواد العـزاوي: ڕەگ و ڕیـشەكانی ناسیۆنالیزمی توركـی، و. موحـسین ئەحمـەد عومەر، دەزگای چاپ و بەخشی سەردەم، چ١، سلیمانی، ٢٠٠٧، ل٨٨.

لە چوارچێوەی ئەو وێنایەدا ئیتحادییەکان بەمەبەستی درووستکردنی کۆمەڵگەیەك کە کولتوورو زمانی تورکی تێدا بالآدەست بن، سیاسەت و شێوازی رەفتاری تازەی گرتەبەر، لەوانە پێڕەوکردنی سیاسەتی کۆچپێکردن و نیشتەجێکردن و تواندنەوەی نەتەوەکانی تر، لە (١٣)ی مایسی (١٩١٣ )دا نیزامنامەی نیشتەجێکردنی عەشیرەتەکان و کۆچبەران و لە ساڵی (١٩١٤)ش بەڕێوبەرایەتی نیشتەجێکردنی عەشیرەتەکان و کۆچبەران دامەزراند [1].

[1]دووساڵ دواتر، واتە ساڵی (١٩١٦) یاسای ڕێکخستنی گشتی بەڕێوبەرایەتی عەشیرەت و کۆچبەران پەسەندکراو دەستبەجێ کەوتە بواری جێبەجێکردنەوە بڕوانە: مالمیسانژ، جڤاتا هێڤی تەلەبەیێ کوردان١٩١٢-١٩٢٢، ل٣٥. بەپێی سەرژمێرییە فەرمییەکانی ئۆفیسی کۆچبەران، ژمارەی ئەو کوردانەی لە باکووری کوردستان پاش دەرکردنی ئەو یاسایە، لە زێدی خۆیان دەرکراون و دورخراونەتەوە، گەشتۆتە (١٠٠٠٠٠٠) کەس. بڕوانە: مالمیسانژ: القومیة الکردیة، ت: د. عبدالله جودت، ص٦٣.

## باسی دووەم:

# ڕووداوەکەی ساڵی (١٩٠٩)ی شێخ سەعیدو کاریگەری لەسەر پەیوەندیەکانی نێوان دەوڵەتی عوسمانیو عەشیرەتە کوردیەکاندا

یەکەمین نیشانەکانی بەرەنگاریو ناکۆکی نێوان عەشیرەتەکانی کوردو ئیتحادییەکان بە شێوەیەکی هەر زوو دوای سەرکەوتنی کودەتاکەی ١٩٠٨ لە کوردستانی باشوور دەرکەوت. وەك لە بەڵگەنامەیەکی عوسمانیدا دەردەکەوێت، لەگەڵ گەیشتنی موتەسەڕیفی نوێی ئیتحادیدا بۆ شاری سلێمانی، "شەوەکەی تەقە ئارامی لە خەڵك هەڵگرت، هەمەوەندەکانیش لە دەوروپشتی شاردا خەریکی چەتەگەری بوون" وەك بەڵگەنامەکە ئاماژەی بۆ دەکات، هەندێ لە فەرمانبەرە توندڕەوەکان ئۆباڵی کارەکەیان خستە سەر بەرەی شێخانی بەرزنجە[1]، گوایە "شێخ سەعید" هەمەوەندەکانی بۆ ڕاپەڕینێکی ئاشکرا هانداوە[2]، مەبەستیش لەو ڕاپەڕینە یاخیبوون بووە دژی ئەنجومەنی نوێ، گوایە "شێخەکان بە ئاسایی خاوەنداربوونو لە لایەن سوڵتان عەبدولحەمیدەوە پشتیوانییەکی باشیان لێدەکرا، دەیانویست خۆیان بەهێز پیشان بدەن، بەڵکو دەوڵەت داوایان لێبکات یان بە زۆر بیانخاتە ناو دەسەلاتی خۆیەوە"[3]. لەوانەشە هۆکاری یاخیبوونەکە ترسی

---

[1] مستەفا نەریمان، چەند بەڵگەیەکی مێژووی، ل٢٢٩.

[2] Gökhan Çetinsaya, op. cit, p 86.

[3] مێجەر سۆن: سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان، ل١٦٧ ; وەدیع جوەیدە، سەرچاوەی پێشوو ل٢٣٧.

لـه دەستـچوونی ئـەو دەسـەڵاتو پێگـە بێـت، کـە بنەماڵەکـە لـە دوای لـە ناوچوونی میرایەتی بابان لە سایەی دەسەڵاتی عەبدولحەمیددا بە دەستیان هێنـابوو[1]. بـە گـوێرەی م.س. لازاریـف لـەو یاخیبوونـەدا هـەر یـەك لـە زێبارییەکانو بارزانییەکان پاڵپشتی هەمەوەندیان کردووە، بەڵام بێ ئەوەی روونـی بکاتـەوە ئاسـتو شـێوازی ئـەم پاڵپـشتکردنە چـۆن بـووە[2]، یاخیبوونەکەش هاوکات بوو لەگەڵ پەنابردنو بێزاری دەربڕینی ژمارەیەك لە بازرگانەکانی شارەکە بۆ حکومەت، ئەوانەی بەدەست سەرکوتی شێخ سـەعیدەوە زەرەرمەنـدبوون[3]و دەمێـك بـوو گوشـارەکانی بـۆ سـەریان دوژمنایـەتیو بێزارییـەکی پـەنهانی دژی شێخو بنەماڵەکەی لە لا دروست کردبوون[4].

دوای دەرکەوتنی کردارەکی ئیتحادییەکان لە شاری سلێمانی[5] بەشێکی زۆر لە پیاوە ناودارەکانی میری لە شارەکە، لەوانە (د. ضیاء)و(سالح ئاغا)، کە کینەو ناحەزیان لەگەڵ بەرەی شێخاندا هەبوو، لە نێو خۆیاندا بەنهێنی ڕێککـەوتن بـۆ لێـدانیان، بـۆ ئـەو مەبەسـتە پەیوەنـدیان بـەو کـەسو

---

[1] دیڤید ماکداول: سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٧.

[2] بڕوانە: المسألة الكردية، ص٢٢٢.

[3] تقرير دائرة الحاكم المدني البريطاني في العراق، ص ص١٠٢-١٠٣.

[4] ڕەفیق حیلمی: سەرچاوەی پێشوو، ب١، ل٣٤.

[5] یەکـەم دەسـتەی ئیتحـاد و تـەرەقی لـە ڕێکـەوتی (١٧یئـابی ١٩٠٨)دا لـە سـلێمانی دامـەزرا. یاداشـتەکانی شـێخ قـادری حەفیـد، ل ل ٣-٤. بـەڵام دووەم دەسـتەی ئـەم ڕێکخراوە بە فەرمی لە (١٩٠٨/١٢/٢٠)دا لە سلێمانی دەست بەکاربوون و پێکهاتبوون لە (ئاغا فەتحوڵڵای چەلەبی، فائق تۆفیق، ئەحمەد دەروێش). بڕوانە: ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: شاری سلێمانی ١٩١٨-١٩٣٢ لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی-سیاسی، سلێمانی، ٢٠٠٢، ل ٣١.

عەشیرەتانەوە کرد، کە ناحەزی کۆنو ساردییان لەگەڵ شێخاندا هەبوو، لەوانە مەحموود پاشا، کە لەو قۆناغەدا سەرکردەیەکی بەناوبانگی عەشیرەتەکانی جافو لە ناحەزانی بەرەی شێخان بوو[1]. بە گوێرەی هەندێ

---

[1] مستەفا نەریمان: چەند بەڵگەیەکی مێژووی، ل ل ٢٢٨-٢٢٩.

ڕیشەی ناکۆکی نێوان جاف و بەرزنجە وەك لە یادەوەریی لۆکاڵیدا هاتووە، دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژگارێك کە شێخ سەعید و بنەماڵەکەی بوون بە خاوەنی دەسەڵات و زەوی وزار و عوسمانییەکان بۆ سوودی خۆیان کەوتنە ئەوەی بایەخێکی تایبەتی بدەن بە شێخان، ئیدی جافەکان و هەندی عەشیرەتی تری ناوچەکە کەوتنە ناکۆکی لەگەڵیاندا، بە دیوێکی تردا خەڵکی ناوچەی عەربەتو شارەزوور کە خۆیان بە دەروێش و موریدی شێخ کاکە ئەحمەد دەزانی. جافەکان بەتایبەت لقی (میکایلی) لە کاتی گەرمیان و کوێستان کردنیاندا بە ناوچەکانیاندا گوزەریان دەکرد و زیانێکی زۆریان لە کشتوکاڵی ناوچەکە ئەدا، لە ئەنجامدا پەنایان بردە بەر شێخ سەعید، نێوبراویش بەنامەیەك مەحموود پاشای جافی لە کێشەکە ئاگادارکردۆتەوە. بەلاّم وەلاّمی نامەکەی بەتوندی داوەتەوەو توویە: "برۆ بە شێخ سەعید بێژە دەست نەخاتە ناو کاروباری خەڵکەوە و بە نوێژکردنی خۆیەوە خەریك وێت". شێخیش پەست دەبێ و چەکداری عەشیرەتەکانی نزیکی کۆدەکاتەوە (لەوانە ڕوغزایی و سمایل عوزێری کە لە لقەکانی جاف بوون)، کە مەحموود پاشا بەم هەواڵە دەزانێ، کێشەکە چارەسەر دەکات، بەلاّم هەڕشەکەی شێخ دەبێتە گرێیەك لە دڵی مەحموود پاشادا. بڕوانە: م.ر.هاوار: سەرچاوەی پێشوو، ل ل ٢٠٢-٢٠٣.

بەلاّم بەڵگەنامەیەکی عوسمانی کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە ١٣ی کانوونی دووەمی١٨٩٥ و لە بنەڕەتدا برووسکەیەکی مەحموود پاشای جافە و بۆ دەسەلاّتدارانی عوسمانی بەرزکردۆتەوە، ئاماژە بۆ هۆکاری تر و ناکۆکی قووڵتر دەکات کە لە نێوان مەحموود پاشا و شێخ سەعیددا هەبووە. وەك لە ناوەرۆکی برووسکەکەدا دیارە، "مەحموود پاشا" گلەیی و گازندەی خۆی لە "شێخ سەعید و نەقیب"ی برای دەکات، گوایە هەردوو نێوبراو لە ناکۆکیی نێوان خۆیان و شێخانی سلێمانیدا، بەهەڕەشەوە داوای پارەتیان لێکردووە، لەبارێکدا ئەگەر پارەتیان نەدات نووسراوی لەسەر بنووسن و داوای دوورخستنەوەی بکەن، هەروەها هەڕەشەی کۆکردنەوەی عەریزەی خەڵکی

سەرچاوەش، لەوانە نووسراوەکانی شێخانی بەرزنجە، مەحموود پاشا سەرۆکی لقی سلێمانی کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی بووە[1].

ئەندامانی لقی سلێمانی کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی بۆخۆیان بریتیبوون لەو کەسانەی کە ناحەزو دوژمنی شێخ سەعید بوون، بازرگانەکانو ئەو ئەفسەرانەی کە تازە خوێندنگەی جەنگیان تەواوکردبوو، لە ڕیزەکانیاندا بوون، ئەوانە بە گشتی دڵیان گەرمو مەیلی ئازادیو ڕووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵ خاوەن نفووزەکاندا هەبوو[2]. بەتایبەتیش "شێخ سەعید" کە لە بۆچوونی ئەواندا مانەوەی هەڕەشە بوو بۆ سەر بەرژەوەندییەکانیانو دەبوو لەناو ببرێت[3]. لەم سونگەوە دژایەتیکردنی شێخ سەعیدو بنەماڵەکەی بە نهێنیو بە ئاشکرا لە لایەن ئەندامانی لقی سلێمانی کۆمەڵەی ئیتحادو

---

تریشیان لێکردووە. هەر لەو چوارچێوەدا مەحموود پاشا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە کە کارەکانیان پشێوی لەناو عەشیرەتەکانی ناوچەکەدا دروست کردووە و باری گشتی لیواکەی تێکداوە. بۆ زیاتر بڕوانە: دەقی بەڵگەنامەکە لە: عثمان علي: دراسات في الحركة الكردية المعاصرة، ص١٩٨.

[1] بڕوانە: م.ر.هاوار: سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٧; عثمان علي: دراسات في الحركة الكردية المعاصرة، ص١٨٩; بەلام سەرچاوەیەك كە لە سەرەتاكانی دەركەوتنی لقی سلێمانی كۆمەڵەی ئیتحاد و تەرەقی دەكۆڵێتەوە و پشتی بە نوسراوو كەرەستەی بەڵگەنامەیی بەستووەو ئاماژە بۆ ناوی زۆرێك لە ئەندامەكانی دەستەی دووەمی ڕێكخراوەكە دەكات، دوور و نزیك ناوی مەحموود پاشا ناهێنێ كە پەیوەندی بە لقی سلێمانی كۆمەڵەكەوە بووبێت. بڕوانە: كەمال ڕەئوف محەمەد: "جەمعیەتی ئیتحاد و تەرەقی عوسمانی-لقی سلێمانی"، ڕۆژنامەی كوردستانی نوێ، ژ.١٤٨٦ لە ١٩٩٧/١٠/٣٠، ژ.١٤٨٧ لە ١٩٩٧/١١/٢، ژ.١٦٠٦ لە١٩٩٨/٥/٥.

[2] ڕەفیق حیلمی: سەرچاوەی پێشوو، ب١، ل٣٥ ; جەعفەر عەلی ڕەسوڵ: سۆفیزم و....، ل١٣٤.

[3]عبدالرحمن ادريس صالح البياتي: المصدر السابق، ص٤٩.

تەرەقی دەستی پێکرد، ئەوانەی ڕقیان لە شێخ بوو، بەهەموو توانایانەوە کەوتنە پلان دارشتن بۆ دوورخستنەوەی لە سلێمانی[1].

هەر لەو ماوەیەدا لە رۆژنامەکانی موسڵو بەغدادا بە ڕاسپاردەی ئیتحادییەکان، چەندین گوتاریان دژ بە شێخانو دەستو پێوەندەکانیان بلاوکردەوە، لە کوچەو بازاڕەکانیشدا بێ ڕێزیان بەرامبەر شێخانو بنەماڵەکەی دەستپێکرد، لە دوایشدا زۆری پێنەچوو (لە سەرەتای کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٠٨دا)، لە کوڕانی شێخ سەعید "شێخ مەحموودو شێخ ئەحمەد"و لە خزمەکانیشیان"سەید ئەحمەدی بابا رەسوڵو شێخ سالحی ئەفەندی" یان بانگ کردو بە بیانووی ئەوەی قەرزداری میرین، ڕاگیران...زۆری پێنەچوو ئەو ناوە پڕ لە سەرباز کراو دەیان کەسیان لە بازاڕییەکان بانگکردو بردنیاننە پۆستەخانەو تەلەگرافیان بۆ موسڵو بەغدادو ئەستەنبوڵ دژ بە شێخان پێ نووسین[2].

دوای سێ رۆژ لە گرتنی کوڕەکانی شێخو خزمانی، دەوڵەتی عوسمانی کە ئیتحادییەکان بڕیارەکانیان کۆنترۆڵ کردبوو و ئەندامەکانی درکیان بە مەترسی بەکارهێنانی هێز لە دژی بنەماڵەکە کردبوو، لە کۆتاییدا بە فەرمانێك شێخو دەستو پێوەندەکەیان ناچارکرد شاری سلێمانی بە جێبهێڵن[3]. بەو جۆرە لەژێر سانسۆری لەشکرێکی زۆربەی حکومەتدا

---

[1] عثمان علي: دراسات في الحركة الكردية المعاصرة، ص١٨٩.

[2] مستەفا نەریمان: چەند بەڵگەیەکی مێژووی، ل ل٢٢٨-٢٢٩; م. ر. هاوار، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٧.

[3] عبدالمنعم الغلامي: الضحايا الثلاث، مطبعة الهدف، الموصل، ١٩٥٥، ص٦. بە پێی بیرەوەرییەکانی شێخ قادری حەفید ئیتحادییەکان میرزا غەفوری مۆر هەڵگری نهێنی

**ڕەوانەی موسڵ کران[1] و لەوێ شێخ و خزم و دەوروبەرەکەی بوونە میوانی "محەمەد پاشای سابونچی"[2] و لە نزیک سەرا نیشتەجێکران، هەرچی پیاوەکانی شێخ و دەست و پێوەندەکەیەتی، لە خانوویەکی تری نزیک ئەو ماڵەدا دانران[3].**

**لە (٥)و (٦)ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٠٩ دا، لە "میانەی ئاژاوەیەکی دژ بە کورددا" [4]شێخ سەعیدو شێخ ئەحمەدی کوڕیو ژمارەیەکی زۆر لە دەستوپێوەندەکانی بوونە قوربانی.**

---

"شێخ سەعید"یان لە خشتە بردووەو تەلەگرافێکی ساختەیان بە زمانی شێخەوە بۆ والی موسڵ ناردووە، گوایە تیایدا شێخ داوا دەکات بێت بەهانایەوەو فەرمانێك دەربکات زوو لە سلێمانی بیگوێزنەوە بۆ موسڵ بۆ ئەوەی تیا نیشتەجێ بێت و ژیانێکی ئارام بژێ. بروانە: جەمیل ڕۆژبەیانی: "شێخ مەحموودی حەفید زادە"، گۆڤاری کاروان، ژ. ٢٨ ، ساڵی ١٩٨٦، ل٥٩.

[1] ڕەفیق حیلمی: سەرچاوەی پێشوو، ب١، ل٣٥.

[2] محەمەد پاشا سابونچی: کوڕی سابون فرۆشێکی موسڵی بوو، وێڕای ئەوەی باوکی سامانێکی باشی بۆ بەجێهێشتبوو، بۆخۆشی مرۆڤێکی لێزان بوو، یەکێك لە نهێنییەکانی سەرکەوتنی سەخاوەتی بوو لە میوانداریدا، دەرگای ماڵی بۆ هەمووان لە عەرەب، تورك، کورد، هەمیشە کراوە بوو، بەو بڕە مەیلەی بۆ سیاسەت هەیبوو، توانی کورسییەکی ئەنجوومەنی بەڕێوبەرێتی موسڵ کە بە هەڵبژاردن بۆ یەك ساڵ بوو بەدەستبهێنێ و چەندین ساڵ قۆرخی بکات و بیکاتە ڕێگەیەك بۆ خۆ دەوڵەمەندکردنی زیاتر، بەو چەشنە بە کردارەکی لە ماوەی ساڵانی ١٨٩٥-١٩١١ لە موسڵدا دیکتاتۆر بوو، (وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا شێخی نێوبراو لە ئەستەنبوڵ نازناوی پاشایەتیی بۆ وەرگرت). بۆ زیاتر بڕوانە: حنا بطاطو: المصدر السابق، ص٣٢٧-٣٢٩.

[3] عبدالمنعم الغلامي: المصدر السابق، ص٧.

[4] وەدیع جوەیدە: جولانەوەی نەتەوەیی کورد، ل٢٣٨.

به گوێری گێڕانەوەی کۆنسوڵی بریتانی لە موسڵ کە پێدەچێ خەڵکی موسڵ و کارمەندەکانی عوسمانی سەرچاوەی زانیارییەکانی بن، کێشەکە لە ٥ی کانوونی دووەمدا دەستپێکرد، لە کاتێکدا هەر یەك لە شێخ مەحموودو شێخ ئەحمەدی برای‌و بەهائەدینی کوڕی حاجی عەبدوڵلا[١]، ئەمانە هەموو گەنج بوون‌و بە بۆنەی جەژنەوە لە بالکۆنەیماڵی مستەفا بەگ، کە دەیڕوانییە سەر گەڕەکێکی قەرەباڵغ دانیشتبوون، بەهائەدین لە نێو ئاپۆڕەی خەڵکەکەدا ئافرەتێکی موسڵی.....دەبینێت، بۆ هێنانی یەکێك لە پیاوەکانی دەنێرێت، ئەویش نایەت، دەرئەنجام دەمەقاڵە لە نێوانیاندا دروست دەبێ، ئافرەتەکەو هاوڕێیەکانی دەست دەکەنە هاتوو هاوار[٢]. ژمارەیەك خەڵك بە دەنگ هاواری ژنە هاوشارییەکانیانەوە چوون، ئەوەشی زیاتر کێشەکەی ئاڵۆزتر کرد، تەقەکردنی کوڕانی شێخ‌و هاوڕێکەی بوو کە بەسەر خەڵکەکەدا کردیان، هەروەها هاتنە ناوەوەی کۆمەڵێك جەندرمەو هێستر سواری کورد کە سەر بە تیپی چوارەمی پیادە بوون، کە بە ڕێکەوت نزیکی ڕووداوەکە بوون، ئیدی هەواڵی ئەوەی "کوردەکانی سەر بەتیپی چوارەمی پیادە کە لە کەرکوکەوە هاتوون" ئابڕووی ئافرەتێکی مووسڵاوییان بردووە، بە زوویی بەنێو خەڵکدا بڵاوبۆوە، لە هەمان کاتدا ئاپۆڕەی خەڵك زیادی کرد، شەڕو پێکدادان گەرم بوو و نزیکەی سێ

---

[١] بەهائەدین لەو ڕۆژەدا لە موسڵ باشکاتبی (ڕیجی-ئینحصار) ئەبێ، لە بنەماڵەی حاجی ئیبراهیم ئەفەندی خەڵکی (کفری)یە. بڕوانە ڕەفیق حیلمی: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٦.

[٢]عثمان علي، الكرد في الوثائق البريطانية، ص٩٣-٩٤. بە گوێرەی گێڕانەوەی عبدالمنعم الغلامي، بەهائەدین خۆی لە بازاڕ بووەو و بە سەرخۆشی توانجی لە ئافرەتەکە گرتووە، دەرئەنجام بۆتە دەمەقاڵەیان و هاوڕێیەکانی هاتوون بۆ یارمەتی. بڕوانە: الضحايا الثلاث، ص١٤.

کاتژمێری خایاند، لە نێوان (٣٠ تا ٥٠) کەس کە لە نێوانیاندا ژن‌و منداڵ هەبوون، بوونە قوربانی، کە شەو داهات سەربازەکان خۆیان بەدەستەوەدابوو و هەر لە سەربازگەکەدا دەستبەسەر کران، ئەو ڕۆژە والی‌و سەرکردە باڵاکانی سوپاو چەندین کەسایەتی ئایینی‌و نا ئایینی موسڵ، ئەوانەی کە دەیانتوانی بۆ کۆنترۆڵکردنی ڕووداوەکە هەنگاو هەڵگرن، تێکرا کۆبوبوونەوە، بەڵام هیچیان نەکرد [١].

کێشەکان بەوە کۆتایی نەهات، بۆ ڕۆژی دواتر (٦ی کانوونی دووەم) شاندێك لە پیاوانی ئایینی‌و دەستەیەك لە خەڵکی شارەکە سەردانی والییان کرد، داوایان لێکرد سەربازە کەرکوکییەکانیان بەدەستەوە بدەن، بەڵام داواکەیان ڕەتکرایەوە[٢]، ئەمە خەڵکەکەی پەست‌و نائومێدکرد، بۆیە بە چاوساغی (ئەبو جاسم) ناوێك بۆ پەلاماردانی ئەو ماڵەی شێخ سەعیدو دەست‌و پێوەندەکەی تیایەو تەنها سەد هەنگاوێك لە بارەگای حکومەتەوە دوور بوو بەڕێکەوتن، بۆیە دوور نییە بەرپرسانی حکومەت لەوێوە چاودێری ڕووداوەکانیان کردبێت[٣].

---

[١]عثمان علي: الكرد في الوثائق البريطانية، ص٩٤.

[٢] المصدر نفسه، ص ٩٥. بە گوێرەی گێڕانەوەی عبدالمنعم الغلامي، شاندەکە سەردانی (فەریق زەکی پاشا چەلەبی وەکیلی والییان کردووە، کە داوای یەکەمی خەڵکەکەشی ڕەتکراوەتەوە، دواتر داوای بەدەستەوەدانی کوڕانی شێخ سەعید و هاوڕێکەیان کردووە، بەو پێیەی هۆکاری ئاژاوەکە بوون، بەڵام وەڵامی ئەو ئەوەبووە، "حکومەت بەرپرسیار نییە لە دواکەوتن یا بەدەستەوەدانی ئەوان بە خەڵکی". بڕوانە: الضحايا الثلاث، ص١٦.

[٣]عثمان علي: الكرد في الوثائق البريطانية، ص٩٥.

هێرشبەرەکان بەدەم هاواری "بژی غیرەت، بژی ئەبوو جاسم"ەوە دەرگای ماڵەکەیان شکاندو(١٣) کەسیان لەدەستو پێوەندەکانی شێخ کوشت، شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ سەعید چەند هەنگاوێك لەو لای ماڵەکەوە پێکرابوو، خودی شێخ سەعیدیش کە تەمەنی هەشتا ساڵ دەبوو، کە لە ماڵ هاتەدەرەوە قورئانەکەی بەرزکردبۆوە، بەیاوەری ئەو پاسەوانانەی بۆی دانرابوو ڕووی کردە بارەگای والی، شێخ لەبەردەم بارەگادا ڕاوەستابوو لە پڕ بەردێکیان بەسەریدا کێشاو کوشتیان[1]. لە کۆی (٥٣) کەس کە یاوەری شێخ بوون لە هاتنیدا بۆ موسڵ تەنها شێخ مەحموود و سێ کەسی دیکە مانەوە،[2] کۆی قوربانییەکانی ئاژاوەکەش لە هەردوو ڕۆژەکەدا (٧٠)کەس

---

[1] المصدر نفسه، ص ص٩٥-٩٦.

به گوێرەی گێڕانەوەی عبدالمنعم الغلامي والی سێ کەسایەتی موسڵی کە پێکهاتبوون لە (ڕەشید ئەفەندی عومەری، شێخ ئیبراهیم ڕۆمی و عەلی ئەفەندی ئیمامی مزگەوتی "نەبی شیت") لەگەڵ دەستەیەك چەکداردا دەنێرێ بەدوای شێخ سەعیددا، گوایە بۆ پاراستنی لە ئاژاوەکە، شێخیش متمانەی بەنێردراوەکانی والی کردو و لە گەڵیان ڕووی کردۆتە سەرای حکومەت، بەڵام دوای نزیکبوونەوە بۆ ئەوەی شێخ چاوی بە والی نەکەوێت، بە فەرمانی تۆفیق بەگی تابور ئاغاسی دەرگای سەرا داخراوەو ئیدی شێخ لە دەرەوە ماوەتەوە لەو کاتەدا یەکێك لە خەڵکە هەڵچووەکە بەردێکی کێشاوە بەسەریدا، کە ئەمەش پێدەچێت پلانێکی داڕێژراوبێت. بڕوانە: الضحايا الثلاث، ص١٧.

[2] عثمان علي: الكرد في الوثائق البريطانية، ص ٩٦.

بە گوێرەی گێڕانەوەی ڕەفیق حیلمی، شێخ مەحموود لەو کاتەدا لە ماڵی "خدری هەمەوەندی " خۆی شاردۆتەوە و لە مەرگ ڕزگاری بووە، بڕوانە: یاداشت، ب١، ل ٣٩ ; هەرچی "جەمیل ڕۆژبەیانی"یە، دەڵێت: کەسێکی خەڵکی سلێمانی کە سەر بە بنەماڵەی "کەریمی عەلەکە" بووە، شێخ مەحموودی ڕزگار کردووە. بڕوانە: شێخ مەحموودی حەفید زادە، ل٦١. بە گوێرەی سەرچاوەیەك ڕزگاربووەکانی دیکە بریتی بوون لە"شێخ مەعروفی برای شێخ سەعید و سەید ئەحمەدی بابا ڕەسوڵ و (شێخ قادر)". بڕوانە: مستەفا نەریمان: چەند بەڵگەنامەیەکی مێژوویی، بەڵگەنامەی ژمارە(٤)، ل٢٣١.

دەبوون[1]. کوژرانی شێخ سەعید لە موسڵ "کارێکی دوژمنکارانەی قێزەون بوو دژ بە کەسایەتییەك کە نێوبانگێکی مەزنی هەبوو"[2]، ڕوودانیشی لەنێو شـارێکی موسـڵمانو لـە ڕۆژانـی جەژنـدا، کـارێکی نـامۆو شـەرمهێنو دڵتەزێنـە[3]. بۆیـە ڕووداوەکـە لـە تێکـڕای عێـراقو دەرەوەیـدا سـەداو دەنگدانەوەیـەکی گـەورەی هـەبوو، خـەڵکی بەتایبـەت سلێمانیو کـەرکوكو شارەکانی دیکەی کوردستانی هەژاند[4]و عەشایرەکانی ناوچەکەی تووشی مـەراقو خەفـەتو ماتـەمینی کـردوو[5]و لـە دوایـشدا هەڵـچوونو ڕاپـەڕین ئەنجامدا[6]. بە تایبەتیش عەشیرەتی هەمەوەند[7].

چەند ڕۆژنامەیەك لـە ئەستەنبوڵ ئاماژەیـان بـۆ ڕووداوەکەو کاردانـەوەی خەڵك کردووە، ئەمەش قوڵایی گاریگەری مەسەلەکە نیشاندەدات لە هـەردوو ئاسـتی نێوخـۆییو دەرەکیـدا، وەك لـە ڕاپـۆرتی بریتانییەکانیـشدا دەردەکەوێت، بۆ لێکۆڵینەوە لە ڕووداوەکە، ژمارەیەك لە بەرپرسانی میری لە ئەسـتەنبوڵەوە گەیـشتوونەتە موسـڵ[8]، کـە پێدەچـێت هاتنیـان لـەژێر کـارتێکردنی هـەوڵو تێکۆشـانەکانی "شـێخ عەبـدولقادری نـەهری" و ئەندامانی کۆمەڵەکەیەوە (کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی کورد) بێت، کە دوای ڕووداوەکـە "هەسـتیان بـە سـەرەنجامی کێـشەکە کـردو دەسـتیان کـردە

---

[1] عثمان علي: الكرد في الوثائق البريطانية، ص ص٩٥-١٠٠

[2] ستيڤن همسلى لونگريگ: العراق الحديث، ص٩٧.

[3] عثمان علي: الكرد في الوثائق البريطانية، ص٩٧.

[4] ڕەفیق حیلمی: سەرچاوەی پێشوو، ل٣٩-٤٠.

[5] بیرەوەرییەکانی ئەحمەدی حەمائاغای پشدەری، ل١٣٤.

[6] مستەفا نەریمان: چەند بەڵگەیەکی مێژوویی، ل٢٣١.

[7] مێجەر.ئی.بی.سۆن: چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، ل ل٩٥-١٠٠

[8] عبدالرحمن ادريس صالح البياتي: المصدر السابق، ص٥٥.

تێكۆشـان بـۆ روونكـردەوەی هـۆو سـەرەنجامی ئـەم كارەسـاتەو سـەرنجی كاربەدەستانی میرییان بۆ ئەوە ڕادەكێشا كە بە وردی بڕواننە بارودۆخی كوردستانی باشوور"[1]، بۆ سزادانی تاوانبارەكانیش هەرچی زووە هەنگاو هەڵگرن[2].

دوابـەدوای بڵاوبوونـەوەی هـەواڵی ڕووداوەكـە عەشـیرەتی هەمەوەنـدو دەروێـش‌و موریـدو دۆستەكانی شـێخان، لـە كـەركوك‌و سلێمانی‌و هـەولێر بڕیاریاندا شاڵاو بكەنە سەر موسڵ‌و تۆڵەی شێخ سەعید بكەنەوە، بەتایبەت دوای ئەوەی زانییان شێخ مەحموودو ئەوانەی لە ئاژاوەكە رزگاریان بووە، هێشتا دەستبەسەرن[3]. بەڵام "سەید ئەحمەدی خانەقا"[4] ڕێگەی نەدان،

---

[1]مستەفا نەریمان: چەند بەڵگەنامەیەكی مێژووی، ل ٢٣٢.

[2]مێجەر سۆن: سلێمانی ناوچەیەك لە كوردستان، ل١٦٨.

لێپێـچینەوەی جیـدی لـە ڕووداوەكـە دوای لادانـی (زەكـی پاشـا)ی والی موسـڵ دەستپێكرد، كە لە قۆناغی بەڕێوبەرێتی ئەودا ڕووداوەكە بوو. والی پاش ئەو (ڕەشید پاشا) كە لە (١ی ئازاری ١٩٠٩) دا دانرا، دوای سەردانێكی بۆ سلێمانی، كە گەڕایەوە موسڵ بۆ لێكۆڵینەوە ژمارەیەكی زۆر خەڵكی زینـدانی كـرد (١٣٠ پیاو و ١٣ ژن)، بۆ هاوكاریكردن لە لێپێچینەوەكەدا لە (دیاربەكر)ەوە داوەر بانگهێشت كرا، لێپێچینەوە نزیكەی یەك ساڵ و نیوی خایاند، لە كۆتایدا ١٣ كەس حوكمی لە سێدارەدانی بۆ دەرچوو، ٥٠ كەسیش یەكی سێ ساڵ زینـدانی كـران، بەڵام ئەستەنبوڵ حوكمەكەی پـشتڕاست نـەكردەوە و لـە كۆتایـشدا سـەرجەم تاوانبارەكانیـان ئـازادكران. بڕوانـە: عبدالرحمن ادريس صالح البياتي: المصدر السابق، ص٥٨.

[3]عبدالمنعم الغلامي: المصدر السابق، ص٢١.

[4] سەید ئەحمەدی خانەقا (١٨٧٣ز-١٩٥٢ز) كوڕی شێخ حوسێن شێخ قادرە لە نەوەی سـەید ئەحمـەدی سـەردارە، جگـە لـەو گوندانـەی لـە دەوروبـەری سـورداش لـە بـاوك و باپیرانیـەوە بـۆی مـابۆوە، نزیكـەی (٢٠)گونـدی تـری لـە دەوروبـەری كـەركوك هـەبوو، خانـەقای سـەید ئەحمـەدی لـە بـاوك و باپیرییـەوە بـۆ مـابوو، لـەرۆژگاری ئـەودا

بەتایبەت پاش ئەوەی موتەسەریفی سلێمانیو کەرکوکو هەولێر تکایان بۆ هێنا کە خەڵکە هەڵچووەکە هێوەربکاتەوە، سەید ئەحمەد بۆ ئەو مەبەستە (مەزبەتەیەك–نووسراوێك) دەنێرێت بۆ والی موسڵو داوادەکات هەرچی زووە، شێخ مەحموود ڕەوانەی سلێمانی بکاتەوە، ئەگەر نا، هێزی عەشیرەتەکانی کورد پەلاماری موسڵ دەدەن. ئیدی والی قایل دەبێو شێخ مەحموود بەهێزێکی جەندرمەوە بەرەو کەرکوك دەخرێتەڕێ، خەڵکی عەشایەری هەولێر تا نزیکی موسڵ پێشوازی دەکەن، زۆرێك لە سەرانی عەشیرەتەکانی کەرکوکیش بە یاوەریو ڕێبەرایەتی سەید ئەحمەدی خانەقا لەژێر چاودێری سوپای میریدا تا "پردێ" چوونەتە پێشوازی، لەوێ عەشایەری هەولێر گەڕانەوە، بەوجۆرە شێخ تا کەرکوك بەڕێ دەکرێ [1].

لە شاری کەرکوك شێخو یاوەرانی بوونە میوانی تەکیەی شێخ عەلی تاڵەبانیو خانەقای سەید ئەحمەد، شێخ مەحموود چووە تەکیەو شێخ قادری برایو ئەوانی دیکە لە خانەقا مانەوە، بە گەیشتنیشی هەرچی عەشایەری ناوچەکەیە، سەرلەنوێ خرۆشانەوەو کەوتنە سەر بیری ئەوەی شۆڕشێك هەڵگیرسێنن[2]. بەتایبەت عەشیرەتی هەمەوەند کە لەلایەن شێخەوە هاندران بۆ هەڕەشەو پەلاماردانی بازرگانەکانی سلێمانی، لە

---

قوتابخانەیەکی ئاینی تیابوو، سەرانی عەشیرەتەکانی ناوچەی کەرکوك لەوانە (شێخ بزێنی، شوان، ڕۆژبەیانی، ساڵەیی، بەرزنجەی قەرەحەسەن) بەگەورەی خۆیان دەزانی، تێکڕا عەشیرەتەکانی: تاڵەبانی، کاکەیی، داوودە، کافرۆشی، هەماوەند، جاف، زەند، پاڵانی، گێژ، زەنگنە، و عەشیرەتەکانی سلێمانی و هەولێر ڕێزیان لێدەنا. بڕوانە: جەمیل ڕۆژبەیانی: شێخ مەحموودی حەفید زادە، ل ل٧٣-٧٤.

[1] جەمیل ڕۆژبەیانی: شێخ مەحموودی حەفید زادە، ل ل٦١-٧٣.

[2] ڕەفیق حیلمی: سەرچاوەی پێشوو، ل ل٣٩-٤٠.

ئاکامدا بازرگانی ناوچەکە بۆ چەند مانگێك تووشی ئیفلیجییەکی تەواوەتی بوو، "هاتووچۆ بۆ ماوەیەك لە جووڵە کەوت، سلێمانی وەك ولاتێکی وێرانەی لێهات، نیوەی بازاڕەکان داخران‌و بازرگانەکان لە دوکانەکانیاندا بەبێ شمەك کڕیار دانیشتبوون"[1] ، بە پێی بەڵگەنامەیەك هەر لەو ماوەیەدا عەشیرەتەکانی دەوروپشتی سلێمانی چوونەتە سەرماڵی موتەسەریفی سلێمانی‌و ماڵەکەیان تالانکردووە، دەنگۆی ئەوەش هەبووە کە شێخ سەعیدی گۆیك تەپە"گۆپتەپە" بە هەزار سوارەوە ئابڵۆقەی سلێمانی داوە[2].

لە ئاست ئەم بارودۆخەدا، والی موسڵ تەلەگرافی کرد بۆ موتەسەریفی سلێمانی"تۆفیق پاشا"، کە هەرچی زووە شارەکە بەجێبهێڵێت‌و بچێتە بەغداد، بەلاَم لەڕێگا لەلایەن چەکداری عەشایەرەو کاروانەکەی پەلامار دراو سەرجەم شمەکەکانی تالاَن کرا، خۆشیان ناچارکرد بگەڕێتەوە سلێمانی[3].

کە ڕەشید پاشا کرایە والی موسڵ (لە ١ی ئازاری ١٩٠٩) بارودۆخەکە تاڕادەیەك گۆڕانی بەسەردا هات، والی نویێ تەنها ڕۆژێك لە موسڵ مایەوە، بۆ ڕۆژی دواتر بەڕێ کەوت بۆ کەرکوك‌و لەوێ دوای گەیشتنی دڵی شێخ محموودی دایەوە‌و بە هێزێکی گەورەوە لەگەڵ خۆی بردییەوە سلێمانی"[4].

---

[1] مێجەر سۆن: سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان، ل ل١٦٨-١٦٩.

[2] مستەفا نەریمان: چەند بەڵگەنامەیەکی مێژووی، ل٢٣٢.

[3] عبدالمنعم الغلامي: المصدر السابق، ص٢١.

[4] ڕەفیق حیلمی: سەرچاوەی پێشوو، ل٤١.

بە گوێرەی گێڕانەوەی (مێجەر سۆن) پێش ئەوەی والی بگاتە سلێمانی، ژمارەیەك لە بازرگانەکان بۆ پێشوازیکردنی چوونە دەرەوەی شار، بەلاَم والی لە چاوپێکەوتندا

دوای گەڕانەوەی شێخ مەحموود بۆ سلێمانی دۆخی ناوچەکە بە تەواوی ئارام نەبۆوە، بەڵکو ترس و تۆقاندنی هەمەوەند بۆ نزیکەی دوو ساڵ لە ناوچەکەدا درێژەی کێشا[1].هەرچی ڕژێمی نوێیە، بۆ پەلاماردانیان ناوبەناو هێزیان کۆدەکردەوەو دەچوونە سەریان.

لە هاوینی ساڵی ١٩٠٩ دا هێزێك لە چەمچەماڵ کۆکرابۆوە بۆ پاککرنەوەی هەمەوەندەکان، تابورێکی (٢٥٠) سەربازی تورك بە ڕابەری ئەفسەرێکی پلەدارو چەند ئەفسەرێکی دیکەو چەکدار بە چەکی ماوزەڕ، ناردیانن بۆ سلێمانی لەگەڵ (١٠٠) تفەنگی ماوزەڕی نوێ....هەمەوەندەکانیش هەموو پیاوە جەنگاوەر و ئازاکانی خۆیان کۆکردەوە کە نزیکەی (١٧٠) سوارو پیادە بوون، لە بازیاندا بۆسەیەکیان نایەوە تا کاروان گەیشت، هەر لەوێدا دەوریان گرتن و لە ماوەی (١٥) خولەکدا دوو ئەفسەرو ژمارەیەك سەرباز کوژران، ئاژەڵەکانیان بەرەڵاکردو چەك و جبەخانەو خواردن و پۆشاکەکانیان تالان کردن"[2].

هەر لەو کاتەدا هێزێکی (٣٥٠٠) سەربازی لە چەمچەماڵ کە ماوەی سێ مانگ دەبوو بۆ لێدانی هەمەوەند لە چاوەڕێی فەرمانداندا بوون، لە لایەن

---

نائومێدی کردوون، دوای (٢٤) کاتژمێریش لە ناو شاردا والی کۆبوونەوەیەکی ساز داو هەردوو لای ناکۆك (واتە شێخان و بازرگانەکان)ی داوەت کرد، نوێنەری شێخان چوون بەڵام بازرگانەکان بەشداریکردنیان ڕەتکردەوە، ئەم بەشداری نەکردنەش بەسبوو بۆ والی کە هۆی ئاوارەبوون و کوژرانی شێخ سەعید بخاتە پاڵ بازرگانەکان، والی پاش ئەوەی گیرفانی پڕکرا لە پارە، بە ڕازیبوونەوە لە خودی خۆی شێخان ماڵئاوایی لە سلێمانی کرد، دوای ئەوەی ماف و هێزی بێ ڕکابەری بۆ بەجێهێشتن (مەبەست بۆ شێخان). بڕوانە: میجر سون: رحلة متنكر الى بلاد مابين النهرين و كردستان، ص ص٢٤٦-٢٤٧.

[1] Gökhan Çetinsaya: op. cit, p 86.

[2]مێجەر سۆن: سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان، ل١٣٥.

چەکدارەکانی هەمەوەندەوە لە شەوە پەلامارێکدا سەرچاوەی ئاوەکەیانیان بڕیو هێسترەکانیان بەرەڵاکردو چەند سەربازێکیشیان لێکوشتن[1].

پاش چەند مانگێك دواتر بۆ لێدانو قەڵاچۆکرنی (٢٥٠) سوارەی هەمەوەند، (٨)هەزار سەرباز لە چەمچەماڵ ئامادەکران، بۆ دادگایی کردنیشیان لە پاش گرتنیان دوو دادوەر دانرابوو، هێزەکە لە ئابی ١٩٠٩ دا بەرەو بازیان کەوتنەڕێ، بەڵام هیچ بەرگرییەك نەبوو، نە پیاوێك، ژنێك، منداڵێك تەنانەت ئاژەڵێکیش لەو ناوەدا نەبوو، بەو جۆرە هەمەوەند بەناو گوندەکانی شوانو عەشیرەتەکانی دیکەدا خۆیان حەشاردابوو و بڵاوەیان لێکردبوو، دواتریش لە ڕێگەی قەرەداغەوە هەڵهاتنو بەلای باشووری ڕۆژهەڵاتا لە رووباری سیروان پەڕینەوە بۆ سنووری شەرەفبەیانیو لەوێشەوە چوونە سنووری ئێران (زەهاو)[2].

یاخیبوونی هەمەوەند تا تەمووزی ١٩١٠ درێژەی کێشا، لەو ماوەیەدا "نازم پاشا" کە بینی ناتوانێ سزایان بدات، لە گەڵیاندا گەیشتە ڕێکەوتننامەیەك، بەوە قایل بوو کە بە رووکەش ملکەچی خۆیان پیشانبدەن، پێدەچێت ئەم سیاسەتی ئاشتەواییە لە ئاکامی بانگکردنەوەی پاشای نێوبراوەوە بۆ ئەستەنبوڵو لادانی لە پلەکەی، لە نیسانی ١٩١١ دا سەری نەگرتبێ، بەوەش هەمەوەندەکان گەڕانەوە دۆخی جاران، لە ساڵی ١٩١٢ دا هەوڵدان بۆ تۆمارکردنی بەشێك لە پیاوەکانیان لە تیپە سنوورییەکاندا، لەسەر شێوەی سوارەی حەمیدی شکستی هێنا[3].

---

[1] هەمان سەرچاوە، ل ل١٣٥-١٣٦.

[2] هەمان سەرچاوە، ل١٣٦.

[3] المس بيل: المصدر السابق، ص١٣٧.

لە کاتی هەڵگیرساندنی جەنگی یەکەمی جیهانیدا هێشتا هەواڵی ئەوە هەبوو کە هەمەوەندەکان لە حاڵەتی یاخیبووندان[1]. دۆخی نائارامی ناوچەکەش درێژەی هەبوو، وێڕای ئەوەی هێزێکی سنووریی لە ژمارەیەکی کەم لە پیاوەکانی هەمەوەندو جافو دزەیی پێکهێنرابوو[2].

## باسی سێیەم:

[1] وەدیع جوەیدە: جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد، ل٢٣٨.

[2] المس بيل: المصدر السابق، ص١٣٧.

# بزاڤەکەی شێخ عەبدولسەلام بارزانی دووەم و هەڵویستی ئیتحادییەکان

پێدەچێ شێخی بارزان "شێخ عەبدولسەلامی دووەم" بەهێزترین و بە تواناترین سەرکردەی کوردی بێت، کە ئیتحادییەکان لە ماوەی نێوان (١٩٠٨-١٩١٤)دا روبەڕووی بوبێتنەوە، ناکۆکی نێوان شێخ و ڕژێمی نوێ لوتکەی ناکۆکی بوو لە نێوان شێخەکانی بارزان و دەسەڵاتی عوسمانیدا[1].

وەك پێشتر هێمامان بۆ کرد، ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٠٢-١٩٠٧ بۆ شێخ عەبدولسەلام، وەك چۆن قۆناغی خۆ پەروەردەکردن و حەسانەوەو سوود وەرگرتن بوو لەو خۆشەویستی و ڕێزەی کە باوکی لە دڵی موریدو لایەنگرانیدا چاندبووی، لە هەمانکاتدا قۆناغی پێگەیشتنی کەسایەتی ئەو بوو لە گۆڕەپانی مامەڵەی عەشایەری و سیاسەتدا، لەم قۆناغەدا بایەخ و گرنگی پێدانی شێخی بارزان زیاتر بەئاراستەی ناوەندی شێخایەتی بارزان و چالاکترکردنی بوو لە میانی چەند کارێکی ڕیفۆرمخوازانەوە لەوانە: نەهێشتنی موڵکایەتی و دابەشکردنی زەوی بەسەر جوتیاراندا، نەهێشتنی مارەیی و بە زۆر بە شوودانی کچ، ڕێکخستنەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر بنەمای دادپەروەری، دروستکردنی مزگەوت و نزیککردنەوەی زانایانی ئایینی لە سەنتەری بارزان و پرس و ڕاپێکردنیان لە

---

[1] وەدیع جوەیدە: جولانەوەی نەتەوەیی کورد، ل٢٤٢ ; جرجیس فتح الله: المصدر السابق، ص٧٠.

بارەی کاروبارە کۆمەڵایەتی و سیاسی و زانستیەکانەوە[1]، پێکهێنانی کۆمیتە لە تێکڕای گوندەکاندا بۆ سەرپەرشتیکردنی کاروبارەکانی خەڵك، رێکخستنی شانەی چەکدار لە نێو سەرجەم عەشیرەتەکان و دانانی بەرپرس بۆیان[2].

بەگوێرەی راپۆرتێکی کۆنسوڵی بریتانی لە دیاربەکر "بناغەی نەخشە ریفۆرمکارییەکەی شێخ لەسەر ریشەکێشکردنی دەسەڵاتی ئاغاکان و هاریکاریکردنی هەژاران و بڵاوکردنەوەی ئاشتەوایی و ئارامی" بووە[3]. جێگیرکردنی ئاشتەوایی و ئارامی و دیسپلین لە ناوچەی بارزان لە ساڵانی دواتردا سەرنجی هەر یەك لە (دەبلیو.ئەی.ویگرام و ئەدگار.تی.ئەی.ویگرام) راکێشاوە و لەم رووەوە نووسیویانە: "دەتوانین لایەنە چاکەکانی ئەم وڵاتە بگێڕینەوە بۆ شێخ، کە وەك رێسایەك بەوپەڕی راستگۆی و دڵسۆزییەوە ئەرکی پاراستنی ئارامی و دیسپلینی لە ئەستۆ گرتووە، ئەو شێخەی هەستدەکات بەرژەوەندی ئەو پاراستنی خەڵکەکەیەتی نەك بارگرانکردنی، لەوجۆرە کەسانەیە دەکرێ لە جێبەجێکرنی یەکسانیدا متمانەی پێبکرێت، بە چەشنێك لە نێوان کوردێکی موسڵمان و مەسیحییەکدا یەکسانی تەواوەتی دەستەبەردەکات، بەڵام ئێمە ئەو ترسەمان هەیە بەرپرسانی تورك بە گشتی ئەم رەوشتەی ئەویان بەدڵ نەبێت"[4].

---

[1] کامران عبدالصمد الدوسكي: المصدر السابق، ص ص١٣٨-١٣٩ ; جەعفەر عەلی رەسووڵ: سۆفیزم کاریگەری لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی کورددا، ل ل١٥٠-١٥١.

[2] المصدر نفسه، ص ص١٣٨-١٣٩

[3] عثمان علي: دراسات في الحركة الكردية المعاصرة، ص٢٣٦.

[4] بڕوانە: مهد البشرية او الحياة في شرق كردستان، ص١٣١.

سەبارەت بە پەیوەندییەکانیشی لەگەڵ هێزو لایەنەکانی دەوروبەریدا لەوانە شێخانی نەهریو ئاغاکانی زێبارو دەوڵەتی عوسمانی لە قۆناغی پێش دەرکەوتنی ئیتحادییەکاندا، ئەوا بەم شێوەی خوارەوە ڕوونی دەکەینەوە:

وەك پێشتر ئاماژەمان پێدا، لە رابوردوودا پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو بنەماڵەی شێخانی (نەهریو بارزان) بەتایبەت لە سەردەمی شێخ موحەمەد سدیقو شێخ موحەمەدی بارزاندا ئاڵۆزو پڕ لە ناکۆکی بوو، بە مردنی ئەمەی دواییان، شێخ موحەمەدی نەهری ئاسوودە بوو، لە هەمانکاتیشدا ئیرەیی دەبرد بە پەرەگرتنی دەسەلأتی شێخ عەبدولسەلامی دووەم، لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانی لە دەسەلأتی کەمبکاتەوە، مەسەلەکان بەو شێوە بوون تا مردنی شێخ موحەمەد سدیق، کاتێ کوڕەکەی سەید تەها شوێنی گرتەوە، ئەمە هەلێك بوو بۆ شێخ عەبدولسەلام تا بۆ درووستکردنی ئاشتەوایی بیقۆزێتەوە، شێخی بارزان چووە پێشەوەو داوای ئاشتبوونەوەی کردو بە سەید تەهای وت"لێتان دەپاڕێمەوە با ڕابوردوو لەبیربکەینو با هاوڕێ بین"، نێوبراویش داواکەی ڕەتنەکردەوە، لە کۆتایشدا ئەم هەنگاوە بووە بناغەی ئاشتەوایی لە نێوان هەردوو لایەندا[1].

سەبارەت بە پەیوەندیی لەگەڵ ئاغاکانی زێباردا لەم قۆناغەدا ئەگەرچی جۆرێك هێمنیو ئارامی بەخۆوە بینی، کە هۆکارەکەی دەگەڕایەوە بۆ ڕکابەریی نێوان بنەماڵە دەسەلأتدارەکانی زێبار، کە لەو نێوانەدا هەندێکیان دایانە پاڵ شێخ عەبدولسەلام، لەوانە "مەحموود ئاغای زێباری" کە داوای

[1]بازیل نیکیتین و کوردناسی، ب١، ل ل٥٠-٥١.

لـه شـێخ كـرد بیبەخـشیّو قایـل بێـت لەسـەر دەسـتی تەوبـە بكـات[1]. بـەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناكۆكییەكی ئاشكرا لە نێوانیاندا درێـژەی هـەبوو و هەنـدێك لە ئاغاكانی زێبار دەكەوتنەخۆ تا حكومەت بورووژێننو هانیبدەن بچێت بە گـژ بارزانییەكانـدا، وەك "عبـدالمنعم الغلامـي" هێمـای بـۆ دەكـات، ئەوانـە هەمیـــشە لـــە كارمەنـــدانی حكـــوومی نزیـــك دەبوونـــەوەو "بێجگـــە لـــە بەرزكردنـەوەی ڕاپـۆرت بـۆ بەرپرسـە باڵاكـان، دژ بـە بارزانییـەكان كـارێكی تریـان نـەبوو، هەمیـشە ئـەوانیان بـە هەڵگەڕانـەوەو نیـازخراپی تۆمـەتبار دەكرد"[2].

شـایەنی ئامـاژە بۆكردنـە شـێخ عەبدولـسەلام لـە ٥ی كـانوونی دووەمـی ساڵی ١٩٠٧ دا، لـە میـانی دەمەتەقێیەكدا لەگـەڵ "صـدیق الـدملوجي"[3] لـە ئامێـدی، تێكـڕای ئـەو ڕاپۆرتانـەی بـەدرۆ خـستۆتەوەو داوای كـردووە لێپێچینەوەی لەگەڵ بكـەن، بـەڵام دادپەروەرانـەو گـوێ لـە سـكاڵاكانی بگـرن، ئەوەشـی دووپاتكردۆتـەوە ئەگـەر والیو قومانـدان لـە ژیـانو ئـابڕوی دڵنیـای بكەنەوە، ئەوا ئامادەیە بڕواتە موسڵ، داواشی كردووە با ئاغاكانی زێباریو

[1] پێ ڕەش، المصدر السابق، ص٩٣.

[2] بڕوانە: الضحایا الثلاث، ص٢١.

[3] بڕوانە: امارة بهدینان الكردیة، ص ص٨١– ٨٤.

بـە گـوێرەی دەمـەلوجی لـەو ڕۆژەدا شـێخ عەبدولـسەلام بـە (٥٠٠) چـەكداری زێبـاری و مزووری و شێروانییەوە كە فەقێ عەبدولڕەحمان سەركردایەتی دەكردن چۆتە ئامێدی و بۆتە میوانی حاجی عەبدولعەزیز ئاغای ئامیدی خەزووری، لەو ڕۆژەدا ئاغاكانی ئامێدی ئەوانەی هەواداری شێخ بوون و ئەوانەشی هەوادار نەبوون وەك یـەك هـاوڕێ و یـاوەرانی شێخیان میوانداری دەكرد، هەر لەو ڕۆژەدا لەسەر بانگهێشتی پێشوەختی شێخی بارزان "شـێخ بەهائـەددین"چـۆتە ئامێـدی و بەتـەنها لەگـەڵ شـێخدا مـاوەی دوو كاتـژمێر كۆبوونەتەوە. بڕوانە: ل٨١.

هـەر ناحـەزێکی تریـان ئامـادەبن و لێپرسـینەوەمان لەگـەڵ بکـەن، ئـەوکات درۆکـان ئاشـکرا دەبـن. خـودی"دەمـەلوجی" بـڕوای وایـە ئـەو تۆمەتانـەی خرابوونە پاڵ شێخ عەبدولسەلام، خاڵی نـەبوون لـە گـەورەکردن، وێنایـەکی نادرووستیشیان بەخشییە شێخ و بزاڤەکەی و لـە کۆتایشدا شێخیان خستە گومانـەوە لـە حکومـەت، سـەرئەنجامیش کەوتـە خۆپاراسـتن و کۆکردنـەوەی خەڵکی عەشایەر لە خۆی.

ئـەو کاتـەی ئیتحادییـەکانیش بـۆ یەکـەم جـار دوای لادانـی سـوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم جڵەوی دەسـەڵاتیان گرتـە دەسـت، سـەرجەم سکاڵاو پروپاگەندەو ڕاپۆرتە هەڵبەستراوەکانی کارمەنـدەکانیان، بـێ لێکۆڵینـەوە یـا لەبـەر چـاوگرتنی بارودۆخەکـەی، وەك راسـتییەك وەرگـرت و وەك کەسـێکی یاخی و هەڵگەڕاوە لە دەوڵەت لە شێخ عەبدولسەلامیان ڕوانی[1].

سەرچاوەکان بەگشتی قووڵبوونـەوەی کێشەکانی نێـوان شـێخی بـارزان و دەسـەڵاتدارانی عوسمـانی دەگێڕنـەوە بـۆ پیلانـی خانـەدانێکی موسـڵ کـە ناوی" محەمەد سابونچی پاشا" بووە، گوایە بە هاوکاری چەند کارمەندێکی میری هەمیشە لە هەل دەگەڕا دەست بەسەر ئەو گوندانـەدا بگرێت، کە سـەر بـە دەسـەڵاتی شـێخی بارزانـە، بـەڵام شـێخ پێـی لەسـەر ئـەوە دادەگـرت کـە دەست لە ماڵ و موڵکی خۆی هەڵناگرێت، زۆری پێنەچوو ئـەوانیش تۆمـەتی پیلانگێڕانیان لە دژی حکومەت خستە پـاڵی[2]. ئەم پیلانگێڕانـە بـە گـوێرەی ڕاپۆرتێکی جێگری کۆنسوڵی بریتانی، دواتر ڕووداوی مەترسیداری بەدوادا

---

[1] عبدالمنعم الغلامي: المصدر السابق، ص٣٨.

[2]بڕوانە: دبليو. أي. ويگرام و أدگار.تی. أی. ويگرام: المصدر السابق، ص١٣١ ; وەديع جوەيدە: جووڵانەوەی نەتەوەيی کورد، ل٢٤٤.

هات، كاتێك "عوسمان ئاغای زێباری" چەند گوندێك دەبەخشێتە سابونچی پاشا، بەرامبەر بەوە والی هانبدات لەشکر بنێرێتە سەر شێخانی بارزان‌و سەرکووتیان بکات[١].

بەڵام چالاکی سیاسی شێخ عەبدولسەلام‌و دەرکەوتنی وەك داکۆکیکارێك لە مافە سیاسی‌و کەلتووریەکانی کورد، پەیوەندییەکانی نێوبراوی لەگەڵ تورکانی لاو بردە قۆناغێکی ترەوە، ئەمەش لەو کاتەوە دەستی پێکرد کە شێخی بارزان ئامادەی کۆبوونەوەیەکی شێخان‌و خانەدانەکانی کورد بوو لە تەکیەی شێخ نور محەمەد بریفکانی لە دهۆك، ژمارەیەك لە سەرۆك عەشیرەتەکانی ناوچەکە ئامادەی کۆبوونەوەکە بوون[٢]، لەوانە سەرۆکەکانی بەرواری، دۆسکی، مزووری ژێری[٣].

ئامانجی ئەم کۆبوونەوەیە بە گوێرەی "عەبدوڵڵا عەلیاوەی" پێکهێنانی یەکێتییەك بوو کە زمانحاڵی عەشیرەتەکان بێت بەرامبەر حکومەتی عوسمانی، کاتێك شێخ نور محەمەد بەهۆی خراپی باری تەندروستییەوە سەرۆکایەتیکردنی یەکێتییەکەی ڕەتکردەوە، پێشنیازی کرد شێخ عەبدولسەلام ئەم بەرپرسیارێتیە لەئەستۆ بگرێت[٤].

---

[١] بڕوانە: عثمان علي: دراسات في الحركة الكردية المعاصرة، ص ص٢٤١-٢٤٢.

[٢] جەعفەر عەلی ڕەسووڵ: سۆفیزم کاریگەری لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی کورددا، ل١٥٠

[٣] كامران عبدالصمد احمد الدوسكي: المصدر السابق، ص١٧١.

[٤] بڕوانە: کوردستان لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانی دا، ل١٧١.

**لە کۆبوونەوەکەی تەکیەی شێخ نور محەمەددا قسە لە بەرزکردنەوەی یاداشتنامەیەك کراوە، کە لە ڕێگەی تەلەگرافەوە پێشکەش بە ئەنجومەنی نوێنەرانو ئەعیان بکرێت لە ئەستەنبوڵ، بەو جۆرە یاداشتنامەکە کە خواستی پێویستی ئەنجامدانی ریفۆرم لە کوردستان تێدا هاتووە، بە شێوەیەکی بنەڕەتی لەلایەن شێخ عەبدولسەلام بارزانیو خودی شێخ نور محەمەدەوە گەڵاڵە کراوەو لە ماڵی ئەوانیشدا نوسراوەو ڕەوانەی لایەنی پەیوەندیدار کراوە، کۆپییەکی تەلەگرافەکەش نێردراوە بۆ هەر یەك لە ئەمین عالی بەدرخانو شێخ عەبدولقادری نەهریو شەریف پاشای خەندان کە هەر سێکیان ئەندامانی دامەزرێنەری کۆمەڵەی ئیتحادو تەعاون تەرەقی کورد بوون، بە بڕوای "دەمەلوجی" ئەم هەنگاوەی دواییان دژی خواستی ئەوانە نرابوو، کە یاداشتنامەکەیان مۆرکردبوو کە بە تەواوی دەیانویست مۆرکێکی فەرمیی ببەخشنە تەلەگرافەکە، لە کۆتایشدا ناردنی تەنها خواستی خودی شێخ عەبدولسەلام بوو[1].**

---

**[1] صدیق الدملوجي: امارة بهدینان الكردیة، ص ٨٦ ; وەدیع جوەیدە: سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٤.**

**صدیق الدملوجي کە یەکەم کەسە ناوەرۆکی یاداشتەکەی تۆمارکردووە، هێمای بۆ مێژووی پێشکەشکردن و بەرزکردنەوەی بۆ پارلەمانی عوسمانی نەکردووە، هەر یەك لە "مەسعوود بارزانی و پیێ رەش" ساڵ ١٩٠٧یان بۆ پێشکەشکردنی هێما پێکردووە. بڕوانە: مسعود البرزاني: المصدر السابق، ص١٩ ; پیێ رەش، المصدر السابق، ص٩٨. بەڵام توێژەران لەوانە (عثمان علی ،عەبدوڵلاْ عەلیاوەیی و جەعفەر عەلی رەسو ڵ)، بڕوایان وایە یاداشتنامەکە لەدوای کودەتاکەی (١٩٠٨ز)ی ئیتحاد و تەرەقی پێشکەش کراوە، بەهانەشیان بۆ ئەمە ئەوەیە دەمەلوجی لەمیانی هێماکردنیدا بۆ ئەم مەسەلەیە، دەڵێت یاداشتەکە "بۆ بەرپرسانی بالاْو ئەنجومەنی نوێنەران و ئەعیان لە ئەستەنبوڵ" نێردراوەو، "کۆپیەکەشی بۆ هەر یەك لە ئەمین عالی بەدرخان و شێخ عەبدولقادری نەهری و شەریف پاشا ڕەوانەکراوە"، وەك زانراوە هەردوو ئەنجوومەنی نێوبراو پێش کودەتاکە**

**یاداشتامەکە ئەم داواکارییە ریفۆرمکاریانەی خوارەوەی لەخۆ گرتبوو:**

**١-زمانی کوردی لە پێنج قەزای کوردیدا (ئامێدی، ئاکرێ دهۆك، زاخۆ، سنجار) بکرێتە زمانی فەرمیی.**

**٢-زمانی کوردی ببێتە زمانی فێرکردن.**

---

لەلایەن سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمەوە لەکارخراوە، کەسایەتییە کوردەکانیش دوای کودەتای نێوبراو گەڕاونەتەوە ئەستەنبوڵ. شایەنی هێماپێدانە ئەم لێکۆڵەرەی دواییان، بڕوای وایە یاداشتنامەکەو مێژووی ناردنی بۆ عوسمانیەکان، لەژێر گومانی مێژوودا دەمێنێتەوە تا ئەو کاتەی لەڕێگەی بەڵگەنامەیەکی مێژووییەوە راستییەکەی دەسەلمێنرێت. بڕوانە( عثمان علي: دراسات في الحركة الكردية المعاصرة، ص٢٣٧. عەبدوڵلا عەلیاوەی، سەرچاوەی پێشوو، پەراوێزی لاپەڕە١٧١; جەعفەر عەلی رەسوڵ: سۆفیزمو کاریگەری لە بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی کورد، پەراوێزی لاپەڕە ١٥١-١٥٢). لێکۆڵەرانی تر لەوانە: (عبدالفتاح علي بۆتانی، کامران عبدالصمد الدوسکي) پێیان وایە یاداشتنامەکە لە ساڵی ١٩١١ پێشکەش کراوە، گوایە لەو ساڵەدا ئۆپۆزسیون دژ بە ئیتحادییەکان لە پەرەگرتندا بووەو چالاکی پارتی (حورییەتو ئیئتیلاف) سەری هەڵداوە، کامران عبدالصمد الدوسکي لەگەڵ ئەو بۆچوونەدایەو بەهانەی تریش دێنێتەوە، ئەویش ئەوەیە کاتێك ویگرام کە پێدەچێ لە ساڵی ١٩١٠دا سەردانی ناوچەکەی کردبێت، شێخ لەگەڵیدا هەندێ بیروڕای ئاشکرا کردووە کە نزیکە لە ناوەڕۆکی یاداشتەکەوە، لەوانە ئارەزو نیشاندان بۆ رۆیشتن بۆ بریتانیا و داواکردن لە سەرۆکی ئوسقوفەکانی کانتربەری بۆ کردنەوەی قوتابخانە لە گوندەکانیداو سەردانیکرنی پاشا جۆرج بۆ گفتوگۆکردن لە بارەی پرسی کوردستانو سەربەخۆبوونی، لە کاتێکدا شێخ دوورو نزیك ئاماژەی بۆ یاداشتنامەکە نەکردووە.. بڕوانە: کامران عبدالصمد احمد الدوسکی: المصدر السابق، هامش صفحة ١٨٤ ; عبدالفتاح علی بوتانی: حركة الشيخ عبدالسلام البرزاني مقدمة الكفاح الكردى في مجاليه السياسي والعسكري، مجلة گولان العربي، اربيل، ع.٣٢، كانون الثاني١٩٩٨، هامش صفحة ٢٧ .

٣-دامەزراندنی قایمقام‌و بەڕێوبەری ناحیەکان‌و تێکڕای فەرمانبەرەکانی دیکە لەوانە بن کە دەتوانن بە کوردی بدوێن.

٤-لە سونگەی ئەو راستیەوە کە ئیسلام ئاینیی فەرمیی دەوڵەتە، بوارە یاسایی‌و دادپەروەرییەکان لەسەر بنەمای شەریعەتی ئیسلام بێت.

٥-پلەکانی قازی‌و موفتی لەوانە دابنرێن، کە سەر بە ئاینزانی شافیعین.

٦-وەرگرتنی باج لەسەر بناغەی شەریعەت بێت، ئەوەشی لەگەڵ شەریعەتدا نایەتەوە، لابرێت.

٧-بەشێك لە باجەکان بۆ چاککردنی ڕێگاوبانەکانی پێنج قەزا کوردییەکە خەرج بکرێت[١].

ئەم ریفۆرمە پێشنیارکراوانە کە سێبەری تایبەتمەندی ئاینیی ئەو کەسایەتییە سەرەکییانەی بەسەرەوەیە کە یاداشتەکەیان گەڵاڵەکردووەو دوورە لە داوای سەربەخۆیی‌و جیابوونەوە، یا تەنانەت دوورن لە داواکردنی ئۆتۆنۆمی، بەڵام پێداگرتن لەسەر لایەنی زمان لە یاداشتنامەکەداو زمانیش بنەمای بنەڕەتی شوناسی نەتەوەییە، بۆیە داواکردنی، لێدانی زەنگێکی مەترسیدار بوو لە بنگوێی تورکانی لاو[٢]. بەتایبەت کە دیدگای ئەوان وابوو کە بەخشینی ئەو جۆرە مافانە بە گەلانی ژێردەستە، یەکێتی عوسمانی کزو لاواز دەکات، ئەوکات وڵاتە ئەورووپییەکان دەتوانن بە ئاسانی یەك لەدوای یەك قووتیان بدەن، بەهانەشیان بۆ ئەمە سەربەخۆیی بولگاریا یا ئەو چارەنووسە بوو کە رووبەڕووی میسر بۆوە[٣]، بۆیە دەسەڵاتدارانی عوسمانی هەر زوو داواکارییەکانیان بە سەرەتای جیابوونەوە، بگرە وەك

---

[١] صديق الدملوجي، المصدر السابق، ص٨٧.

[٢] جرجيس فتح الله، المصدر السابق، ص٦٧.

[٣] صديق الدملوجي، المصدر السابق، ص٨٧.

هێمای هەڵگەڕانەوەو نیاز خراپی ئەو خەڵکانەی مۆریان کردووە، ڕاڤە کرد[1].

گواستنەوەی (محەمەد فازیل پاشای داغستانی) وەك جێگری والی بۆ موسڵو لە ئەستۆگرتنی سوپای ویلایەتەکە لە ساڵی ١٩٠٩ز دا، هێمایەك بوو بۆ ڕوبەڕووبوونەوەی سوپایی لەگەڵ شێخ عەبدولسەلامدا، بەتایبەت نێوبراو هەمیشە ئەوەی دووپاتدەکردەوە کە ئەو " پیاوێکی سەربازییە، پیاوی جەنگو لێدانە نەك قەڵەمو نووسین"[2].

داغستانی زۆری نەبرد فەرمانی بەشێخ عەبدولسەلام دا، تا لە موسڵ دیدەنی بکاتو لە بەردەمیدا ئامادەبێت بۆ وەڵامدانەوەی ئەو تۆمەتانەی لە بارەی پیلانگێران دژ بە حکومەت خراونەتە پاڵی، بەڵام هاوڕێیانی شێخ، هۆشداریان پێدا، متمانەی پێنەکاتو فەرمانەکەی جێبەجێنەکات، چونکە نیازی وایە دەستگیری بکات، شێخ بۆ خۆدزینەوە لەو داوایە وەڵامێکی ئاڕاستەی داغستانی کرد، لە کۆتایدا ئەو تێگەیشت کە شێخ ناچێت بۆ لای، لەوکاتەوە بە هێزێکی ٦٠٠ سەربازیو شەش تۆپەوە لەشکرکێشی کردە سەر ئاکرێ، لەوێوە هەواڵی نارد ئەگەر شێخ ملکەچ نەکات، ناوچەی بارزان کە شوێنی نیشتەجێبوونی تێك وپێك دەدات، وەڵامی شێخ ناردنی گولەیەکی مارتینی بوو بە نامەیەکدا، کە ئەم ڕستەیەی تێدابوو:"من ژیانی خۆم هێندە لا خۆشەویست نییە، لەم پەیامە بەدواوە پەیوەندییەکانی منو ڕۆمەکان تەنها بە تەقەی دەمانچە دەبێ، هەرچیت دەوێ بیکەو با ئاشتی بەسەر سەرمانەوە بێت"[3].

---

[1] عبدالمنعم الغلامي، المصدر السابق، ص٣٢.

[2] عباس العزاوي، تاريخ العراق بين احتلالين، ج٨، ص٢١٧.

[3] بازیل نیکیتینو کوردناسی، ب١، ل٥١; ابراهيم خليل احمد، المصدر السابق، ص٩٨.

هەرچی داغستانییە بە پەلاماریکی سەربازیی وەلامی شیخی بارزانی دایەوە، بەلام لە پێشدا پلانی وابوو زۆرترین عەشیرەتی ناوچەکەی لە دژی شیخ بورووژێنێت، سەرەتا فەرمانی بە عەشیرەتەکانی "سورچی، خۆشناو، باڵەك، مامەش و شنۆ"[1] دا، بۆ روبەڕووبوونەوە لەگەڵ شیخ و موریدەکانی پەیوەندی پێوەبکەن، ئاشکرایە لەو رۆژگارەدا "مامەش و شنۆ" لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا بوون[2]، بۆ هەمان مەبەست لەگەڵ عەشیرەتەکانی ریکانی، ئۆرەمار، هەرکی، بەرواری، نێروەی، زێباری، گۆران، زراری، دزەیی، گەردی، ڕەڤەندوك، پیرەسنی و برادۆست" ریکەوت[3].

لە ئاکامدا شەڕێکی توندوتیژ پەرپابوو، نزیکەی مانگێکی خایاند تێیدا موریدەکانی شیخ گورزێکی توندیان لە هێزەکانی عوسمانی وەشاندو زیانێکی گیانی زۆریان لێدان، هەرچەندە هێزە تایبەت و بالاکانی حکومەت توانیان لە کۆتایدا دەست بەسەر بارودۆخەکەدا بگرن، گوندی بارزان کاولکرا، بارەگا و تەکییەکەی شیخ ڕوخێنرا، فەقێ عەبدولڕەحمانی سەرکردەی هێزەکانیشی کوژرا[4]، شیخ خۆیشی یەکەم جار پەنای بردە بەر

---

هەر یەك لە وەدیع جوەیدەو کامران عبدالصمد احمد الدوسکی کە هەمان بابەتی (نیکیتین)یان کردۆتە سەرچاوەی زانیارییەکەیان، هێزی عوسمانییان بە (٦٠٠٠) سەرباز هێما پێکردووە، لە کاتێکدا ئەو سەرچاوەی لەسەرەوە هێمام بۆ کردووەو زانیارییەکانم لێ وەرگرتووە، سوپاکەی بە (٦٠٠) سەرباز هێما پێکردووە.

[1] شنۆ ناوە بۆ شارۆچکەیەك کە کەوتۆتە (٦٠) کم باشووری ورمێ، لەگەڵ گوندەکانی دەوروبەریدا عەشیرەتی (زەرزا) دەژیا ، لە ساڵی ١٨٩٤ دا ژمارەیان بە ٤٠٠ بنەماڵە خەمڵێندراوە، بڕوانە: گێلان: سەرچاوەی پێشوو، ل٤٠.

[2] هەمان سەرچاوە، ل ل٥١-٥٢.

[3] پێ رەش: المصدر السابق، ص١٠٣.

[4] وەدیع جوەیدە: جولانەوەی نەتەوەیی کورد، ل٢٤٦.

چیای (هیریٚ) له نزیك بارزان‌و چەندین مانگ لـه شـوێن گۆڕكێكردنـدا ژیـانی بەسەر برد، چونكه له دڵنیاییدا نەبوو، دواتریش ناچاربوو پـەنا بەرێتـه بـەر ناوچـه چـیاییەكانی تیـاری، کـه سـەر بـه "مـار شـەمعۆن"[1]ی پاتریـاركی نەسـتوورییەكان بـوو. هەرچـی شـوێنكەوتەكانی بـوو، بەشـێكیان ملیـان بـۆ حكومەتـــدا، دوای ئـــەوە بەخـــشران‌و گەڕانـــەوە ناوچـــەكانی خۆیـــان، بەشێكیشیان له نێویاندا خێزانەكەی دەستگیركران‌و ڕەوانـەی موسـڵ كران [2].

داغستانی له بروسكەیەكدا بۆ ئۆفیسی ئەركانی جەنگی گشتی/لقی سیٚ، کـه لـه( ١٣ی كـانوونی یەكـەمی سـاڵی ١٩٠٩ )دا، دوای تێكـشكانی شـێخی بارزان‌و لایەنگرانی بەرزی كردۆتـەوە، بـه وردی هێمـای بـۆ بـارودۆخی دوای

[1] بنیامین مار شەمعون: ڕابـەری بـاڵای دونیـایی‌و ئـایینی كەمینـەیی ئاسووری بـوو، لـه چوارچـێوەی تێكۆشـانەكانیدا بـۆ دەسـتەبەركردنی مافـەكانی ئاسـووری لـه هـەرێمی ئازربایجانی ئێرانیدا، له كۆتایی جەنگی یەكەمی جیهانیدا ئینگلیزەكان هانیاندا لەگەڵ (سمكۆی شكاك) هاریكاری بكات، له مانگی ئازاری ١٩١٨ هەردوو كەسایەتی نێوبراو بۆ چـاوپێكەوتنی یـەكتر ڕێككـەوتن، بـۆ ئـەو مەبەسـتە (كۆنەشـار) نزیـك بـه سـەلماس دەستنیشانكرا، تا لـەویٚ لـەبارەی پرسـی هاریكاری‌و هاوپـەیمانێتی ئاسووری-كوردی هاوبەش دژ به ئێرانییەكان بیروڕا بگۆڕنەوە، مار شەمعۆن‌و (١٥٠) چەكداری ئاسووری‌و ئەرمەنی ئامادەبوو، لـه كـاتی گفتوگۆدا كـه پێدەچیٚ جیاوازی بیروڕا پاڵنەرەكـەی بێت، سمكۆ چەك لـه یـەكێك لـه پاسـەوانەكانی دەسێنیٚ‌و دەستبەجیٚ مار شـەمعۆن دەكوژیٚ، بەدوایدا زۆرینەی چەكدارەكانیشی هاوڕێی لەلایـەن پاسـەوانەكانی سمكۆوە دەكوژرێن. بۆ زیاتر لەمبارەوە بڕوانه: یاسین خالد سردشتی:"صفحات من تـاریخ اثـوریی كردسـتان ابان الحرب العالمیة الاولی، تحقیق تاریخی عن اغتیال الزعیم الاثوری بنیامین مارشمعون من خلال النصوص التاریخیة"، مجلة مەتین، ع.٦٦، سنة١٩٩٧، ص١٢٠-١٣٠.

[2] بازیل نیكیتین‌و كوردناسی، ب١، ل٥٢. دبلیو. أي. ویگرام‌و أدگار.تي. أي. ویگـرام: المصدر السابق، ص١٣٢.

دەستبەسەراگرتنی ناوچەکە کردووە، لەو چوارچێوەدا دەڵێت: "ڕاوەدوونانو هەڵاتنی ئەوان (مەبەستی شێخو شوێنکەوتەکانێتی) ماوەی مانگێکە شەو و ڕۆژ درێژەی هەیە، بەرهەمی کۆششەکانمان بەدیل گرتنی سەدان کەسو کوژرانی چەندین کەسی ترە، لەوانە فەقێ عەبدولڕەحمان، هەرچی شێخ خۆیەتی ئەوا توانیویەتی بە هاوکاری "سەعدی ئاغا"ی بالأدەست بەسەر ناوچەی (سال)دا کە سەر بە ویلایەتی (وان )ە هەڵبێو بڕواتە ناوچەکانی تەمووزو تیاری کە فەلەکانی تێدا نیشتەجێن، لە ئێستادا شێخ خۆی لە نزیك زاویتە ونکردووە. هەرچی سەعدی ئاغایە، ئەوە ڕەتدەکاتەوە کە شێخ لای ئەو بێت، لە چوارچێوەی هەوڵەکانماندا دەستەیەکی ئەسپ سواریشمان ڕەوانەی ئامێدی کردووە کە لەوپەڕی سنووری ویلایەتدایە، لە ئاکامی ئەم بەدواداچوونەدا (سێ ) یاخیبوو گیرانو دەستبەجێ ڕەوانەمان کردوون بۆ موسڵ، هەر لەو چوارچێوەدا نوسراومان ئاراستەی ویلایەتی (وان) کردووەو داوامان لێکردوون پێویستە دەسەلأتدارانی ویلایەت ئەوانە بگرن، بڕیاریش دراوە سەرجەم ئەوانەی پشت لە شێخ دەکەنو داوادەکەن بچنەوە سەرماڵو حاڵی خۆیان، ڕێگە بدرێن، بەو هیوایەی لە بارزانو لیواکەشدا بەرگری سەر هەڵنەداتەوە، پێگەیەکی سەربازیمان بە ئەندازەی دوو تابوور لە هێزە یەدەکەکان لەوێ داناوە، هەروەها پێگەیەکی سەربازی نیزامیی لە شێروان. لە کۆتایشدا بۆ سەرخستنی هەوڵو کۆششەکانی پرۆسەی گرتنی شێخ عەبدولسەلام، محەمەد فازیل پاشا پێشنیار دەکات، هێزێکی سەربازیی لە ناوچەی (سال) کە سەعدی ئاغای تێدایە دابنرێت، یاخود نێوبراو دووربخرێتەوەو سزا بدرێت[1].

[1] بۆ خوێندنەوەی دەقی تەواوی برووسکەکە بڕوانە: عثمان علي: دراسات في الحركة الكردية المعاصرة، ص ص٢٤٣-٢٤٤.

پێدەچێت شێخو ئەوانەی لەگەڵیدا مابوونەوە، بۆ ماوەیەك دوای شکستەکەی بارزان بەرهەڵستیان کردبێتو بە گوێرەی هەلو مەرج پەلاماری لەشکری عوسمانییان دابێت، ئەوەتانێ رۆژنامەی (صدی بابل)ی رۆژی ٣١ی کانوونی یەکەمی ١٩٠٩ هێمای بۆ ئەوەکردووە کە"ئەوان لە ئێستادا لە شاخەکاندا خۆیان قایم کردووە، بەتایبەت لەم وەرزی زستانەدا....شێخی بارزانییەکان لە حەشارگەی خۆی هاتۆتە دەرێ، عەشیرەتەکانی کورد، ئەوانەی گوێڕایەڵی ئەون لەخۆی کۆکردۆتەوە بۆ تۆڵەسەندنەوە لە حکومەت، هەروەها بۆ وەدوکەوتنی ئەوانەی پیاوەکانو تاکەکانی عەشیرەتو خێزانەکەیان بەدیل گرتووەو فڕێیان داونەتە زیندان، وەك لافاوی هەڵچوو پەلاماری ئەو سەربازانەیان داوە، کە کەوتوونەتە لای "ئاکرێ". وێڕای ئەو چەكو تفاقەی پێیانەو ئەو سەربازانەی کە لەوێ هەنە، بەڵام شەڕێکی بێئامانی لەگەڵ کردوونو بە سەختی تێکیان شکاندون" [1].

ئاشکرایە بەکارهێنانی هێز بەشێك بوو لە سیاسەتی ئیتحادییەکان بەرامبەر بە بنەماڵەو عەشیرەتەکانی کورد، بۆیە هەڵوێستی ئیتحادییەکان لە پرۆسەکەی داغستانی دژ بە ئەوانەی"دوژمنی ئاشتیو ئارامیو ئاسوودەیی نشتمانن!" هەرزوو جێگەی پشتگیریو دەستخۆشیلێکردن بوو، ئەمەش لە میانی دەرکردنی فەرمانێکی سوڵتانییەوە بوو، کە بۆ ئەم مەبەستە لە ١٣ی کانوونی دووەمی ١٩١٠ دا لە موسڵدا درایە بەر گوێی خەڵکی، کە تێیدا هاتبوو: دامەزراندنی"مەبەست محەمەد فازیل داغستانییە" بە شێوەیەکی فەرمییو یاسایی وەك والی و قومەندانێك بۆ

[1] جريدة (صدى بابل)، ٣١ كانون الاول، ١٩٠٩. وەرگیراوە لە: ابراهيم خليل احمد، المصدر السابق، ص٩٩.

موسـڵو بەرزکردنـەوەی ورەی، بۆرپیشەکێـشکردن و ڕێگـەگرتن لـەو سەرلێشێواوانەی لە دەوڵەت یاخیبوون و ملکەچپێکردنی عەشیرەتەکان بۆ حکومەتی مەشرووتەو دەستووری بنچینەیی[1].

دروست لەم کاتەدا بوو "سەفوەت بەگ" کە یەکێك بوو لە ئەفسەرە میانڕەوەکان، بەبێ ئاگاداری داغستانی ڕاپۆرتێکی بۆ ئەستەنبوڵ بەرزکردەوە، کە بەبڕوای ئەو پێویستە بۆ شکۆی شۆڕشی مەشرووتە لە شێخ عەبدولسەلام و شوێنکەوتەکانی ببەخشرێت و ڕێگەیان پێبدرێ بگەڕێنەوە بارزان، لەو کاتەدا شێخ لە گوندی (بابسیڤا) لە نێو عەشیرەتی (مزووری ژووری) دا دەژیا، لە ئاکامدا سەفوەت بەگ توانی لێخۆشبوون بۆ شێخ و شوێنکەوتەکانی بەدەست بێنێت، لە پایتەختەوە (داغستانی)یان ڕاسپارد لێبگەڕێ شێخی بارزان ئارام دابنیشێ، بەڵام نێوبراو بەم بڕیارە قایل نەبوو، هەڵسا دژە ڕاپۆرتێکی بۆ بەرپرسانی باڵا هەنارد، تێیدا (سەفوەت بەگ)ی بەوە تۆمەتبار کرد کە پارەی لە شێخ وەرگرتووە بۆ ئەوەی داکۆکی لێبکات، سەفوەت بەگیان بانگی پایتەخت کرد، بەڵام پێش ئەوەی بڕوات، شێخ عەبدولسەلامی ڕاسپارد ئەگەر داغستانی هێرشی

---

[1] ابراهیم خلیل احمد: المصدر السابق، ص٩٩.

مەبەست لە (دەستووری بنچینەیی) ئەو یاسا بنەڕەتییەیە کە گۆڕانی حکومەتی عوسمانی لە دەسەڵاتی ڕەهاوە بۆ دەسەڵاتی یاساو مەشروتییەت دیاریدەکات، ئەم دەستوورە لە ئەنجامی هەوڵدانی ئەوروپییەکان و کەسانی وەك مەدحەت پاشا، لە ٢٣ی کانوونی یەکەمی ١٨٧٦ دا لەسەر دەستی سوڵتان عەبدولحەمید ڕاگەیەندرا، بەڵام ماوەیەکی کەم کاری پێکرا، سوڵتان بەرپابوونی شەڕی ١٨٧٨ی لەگەڵ رووسەکان کردە بەهانەیەك بۆ ڕاگرتنی، ئەوەبوو جارێکی تر دوای کودەتاکەی ١٩٠٨ی ئیتحاد و تەرەقی سەرلەنوێ کەوتەوە مەیدانی جێبەجێکردنەوە. بۆ زیاتر بروانە: شەریف پاشای خەندان: سەرچاوەی پێشوو، ل ل٢٥-٢٦.

هێنایە سەرتان، بە توندی بەرگری بکەن، من لەسەرەوە لێپرسراوان تێدەگەیەنم کە بەرپرسیاری ڕاستەقینە (داغستانی)یە [1].

هەرچی (داغستانی)یە سەرلەنوێ ڕێگەی سەربازیی هەڵبژاردەوە، بۆ ئەو مەبەستەش دەستەیەکی سەربازی هەڵبژاردە (٤٠٠ سەرباز)و کۆمەڵێك لە چەکدارە کوردەکانی (سورچی و گۆران، زێباری، هەرکی) کۆکردەوەو بەسەرجەم هێزەکەیەوە بەرەو بارزان بەڕێکەوت، ئامانجەکەشی (چیای شیرین) بوو لەوێشەوە بۆ (سەری بازی)، کە بەتەواوی دەڕوانێتە سەر دۆڵو هەردەکانو سەرجەم گوندەکانی ئەو ناوە، لەوانە گوندی (بابسیڤا) کە خودی شێخی بارزانی (بەهێزێکی ٣٠٠ کەسی)یەوە تێدابوو[2].

لەودیو گوندی (بابسیڤا)، لەناو چیاکاندا گەروویەکی درێژ هەیە، بەرتەسكو قووڵ، پیاوەکانی شێخ چوونە هەردوو دیوی گەرووەکەوەو خۆیان لە پشت تاشە بەردەکان شاردبۆوە، دەنگیان نەکرد تا سەرجەم سەربازەکان گەیشتنە ناو گەرووەکە، بەرەبەری کازیوە بوو، شێخ فەرمانیدا تەقەیان لێبکەن، لەگەڵ دەستپێکردنی تەقەدا سەربازەکان بەتەواوی شڵەژانو سەریان لێتێکچوو، نەیاندەزانی ڕوو لە کوێ بکەن، کوردەکان کە (بە ویژدانێکی ئاسوودەوە نەهاتبوون بۆ شەڕی شێخ)، شارەزای جوگرافیای ناوچەکە بوون هەرزوو خۆیان دەربازکرد، هەرچی سەربازەکانە، ژمارەیەکی زۆریان کوژران، (٢٠٠) کەسیشیان لێ بەدیل گیران، دواتریش پەلاماری تۆپچییەکانیان داو ئەوانیشیان کپکردەوە[3].

---

[1] بازیل نیکیتینو کوردناسی، ب١، ل٥٢-٥٤

[2] پیێ ڕەش: المصدر السابق، ص١١٠.

[3] بازیل نیکیتینو کوردناسی، ب١، ل٥٥-٥٦.

دەبليو.ئەی ويگرامو ئەدگار.تی.ئەی.ويگرام ڕێكەوتی ئەم گەرووەيان كـردووە، كـە شـەڕەكەی تێـدا ڕوويـداوەو بـەم چەشـنە وەسـفيان كردووە:"چاڵێكی گڕكانييە لە خاكێكی وشكو چۆڵو وێرانەدا، بە هەردوو ديوودا چيای بەردينو هەڵدێرە، ئا لێرەدا يەكێك لە تيپەكانی حكومەت لەگەڵ شـێخو جەنگاوەرەكانيـدا دەسـتەويەخەبوونەوە، خـودی شـێخ لـە ڕووداوەكەدا بوو، بەڵام ئەركی بەڕێوەبردنی شەڕەكەی بە كەسێك سپاردبوو نـاوی (عبـدالقادر) بـوو...بـەگوێرەی چـەمكی سـەربازی ئـەم بەريەككەوتنـە دەچـێتە خانـەی شـەڕو پێكدادانـەوە...پيـاوانی عەشـايەر بـە سـامەوە دەيانڕوانييە بيرۆكەی تێكئالاَن لەگەڵ سوپای ميريدا، شێخ بۆ گڕتێبەردانی ورەيانو بۆ ئەوەی ڕاڕاييان نەهێڵێت، خودی خۆی يەكەمين گوللەی تەقاند، لە كۆتاييدا تيپەكە تێكرا، لەگەڵ سیٚ تۆپی چياييدا بەديل گيران" [1].

پـاش پێكدادانەكـە شـێخ بـە هاوكـاری عەبدولعـەزيزی زاوایو كەسـێكی باوەڕپێكراوی ياساناس، ڕاپۆرتێكی دوورودرێژيان لەسەر دۆخەكە نووسیو لەرێگـەی (ئاميٚـدی) يـەوە ناردیـان بـۆ (ئەسـتەنبوڵ)، لـە ڕاپۆرتەكـەدا شـێخ وێـڕای داوای لێبـوردنكردن لـە حكومـەت، تـاوانی ڕووداوەكـەی خـستە ئەسـتۆی محەمـەد فازيـڵ پاشـا، ئەوەشـی دووپـاتكردەوە كـە ئـەو بەهەڵـەدا چووەو وايزانيوە پەلامارەكە تەنها عەشيرەتە كوردە ناحەزەكانێتیو بەرگری لـەخۆی كـردووە، دواتـر تێگەيـشتووە كـە سـەربازی ميريـش لـە هێرشـەكەدا بوون، كە ڕاپۆرتەكە گەيشتە ئەستەنبوڵ، دوای دەستاودەستكردنی لە لايەن ئەنجوومەنـەوە كـە سـەفوەت بـەگ تێيـدا بەتونـدی پـشتگيری لـە كوردەكـان كردبوو، بڕياری لێبوردن بۆ شـێخ دەركـرا، بـەوجۆرە داوا لـە محەمـەد فازيـل

[1] دبليو. أي. ويطرامء أدطار.تي. أي. ويگرام،:المصدر السابق، ص١٣٣.

پاشا کرا بچێتەوە شوێنی خۆی لە موسڵ[1]. هەرچی شێخە، دوای ئەوەی دیلەکانی لە چەك داماڵی و بەڵێن و پەیمانی لێوەرگرتن کە جارێکی تر لەگەڵیدا نەجەنگێن، هەموویانی ئازادکرد [2].

بە دەستبەکاربوونی (نازم پاشا) وەك والییەك بۆ ویلایەتی بەغداد لە ناوەڕاستەکانی ساڵی ١٩١٠ دا، ناساندنی شێخ وەك کەسێکی بێتاوان و قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانانەی لێی کەوتبوو، کەوتە بواری جێبەجێکردنەوە، نێوبراو سەر بە حیزبی حورییەت و ئیئتیلاف بوو، وێڕای ئەوەی والی بەغداد بوو، ئەرکی فەرماندەیی سوپای شەشەمی عوسمانیشی لە ئەستۆ بوو، سەرباری ئەوانە نێوبراو لە هەوادارانی ئارامی و ئاشتەوایی ناوچەکە بوو[3]، لەم سۆنگەوە وەك (عبدالمنعم الغلامي) دەڵێت:" ئەم والییە

---

[1] بڕوانە، الضحایا الثلاث، ص ص٣٨-٣٩.

بەگوێرەی سەرچاوەکان ماوەیەك دوای ئەم ڕووداوە محەمەد فازیل پاشا وەك فەرماندەی تیپێکی سەربازی بۆ بەغداد گواستراوەتەوە، دواتریش لە ماوەی جەنگی یەکەمی جیهانیدا لەبەرەکانی جەنگ لەگەڵ ئینگلیزدا لە بەسرە کوژراوە، بڕوانە: وەدیع جوەیدە: جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد، ل٢٤٨ ; بازیل نیکیتین و کوردناسی، ل٥٨.

[2] دبليو. أي. ويگرام و أدگار.تي. أي. ويگرام، المصدر السابق، ص١٣٣.

بە گوێرەی نیکیتین داغستانی چەند پیاو ماقوڵێکی ناردۆتە لای شێخ بۆ ئەوەی زیندانییەکان ئازاد بکات، شێخیش وتوویە من هیچ شتێکم دژ بە دیلەکان نییە، بەڵام دەبێ داغستانی بیانکڕێتەوە، لە ئاکامدا نێوبراو ناچاربوو ملبدات و (٢٠٠) لیرەی تورکی بۆ شێخ ڕەوانەبکات، بەڵام بە پێچەوانەوە شێخ ڕازی نەبووە چەکەکانیان بداتەوە (چەکی چاك بۆ جەنگاوەری چاکە، هی خراپیش بۆ هی خراپە)، لەگەڵ دیلەکاندا چەند چەکێکی ناشیرینی ناردەوە کە لە مەراغە و سلێمانیدا دروستکرابوون، هەرچی (داغستانی)یە، بەم کارە زۆر پەستبووە. بڕوانە: بازیل نیکیتین و کوردناسی، ل ل ٥٧-٥٨.

[3] عباس العزاوي: تاريخ العراق بين احتلالين، ج٨، ص٢٤٥.

ژیـره پێـی وابـوو بەرژەوەنـدی وادەخوازێـت هـەموو ئـەو تۆمەتانـەی کـە خراونەتـە پـاڵ شـێخ، وەلاوەبنـرێن، بۆیـە لیخۆشـبوونی بـۆ شـێخ و سـەرجەم بارزانییـە ئاوارەکـان دەرکـرد، بگـرە (ئەسـعەد پاشـا)ی دوررزی والی موسـڵ بـە وەکالـەت (٢٤ی تـشرینی١٩١٢-١٩١٣) لەمـە زیـاتر چـوو، کاتێـك داوای لـە حکومەتی عوسمانی کرد میداڵ پێشکەش بە شێخ عەبدولسەلام بکرێت"[1]، بـە گـوێرەی توێـژەرێك دوور نییـە نزیکـی شـێخ لـە سـنووری رووسـیا و (دۆسـتایەتی و نزیکـی لـە کۆمـەڵێك کەسـایەتی پـرۆ ڕووسـی لەوانـە سـەید تـەها، عەبـدولرەزاق بـەدرخان)، هـەروەها وێرانبـوونی ئـابووری بـارزان و ناوچـەکە بـەهۆی پـەلامارە سـەربازییەکانەوە دژ بـە شـێخ و پەرچـەکرداری بـەهێزی خـەڵك، بـەهۆی سـەرکوتکردنی بێرەحمانـەی بزاڤەکـەی شـێخ عەبدولسەلامەوە، ئەمانە تێکڕا هۆکاری بەجێ بوون، دەسەڵات ناچاربکەن هەڵوێستێکی نەرم لە ئاست شێخدا پیشانبدەن[2].

دوای ئـەو رووداوە شـێخ بـەرەو گونـدی بـارزان کەوتـەڕێ، خانووکـەی نـۆژەنکردەوە، قوتابخانەیـەکی بـۆ منـداڵان دامەزرانـد، هەرچـی حکومەتـە بـە خێرایـی سـەبارەت بـە داواکردنـی مامۆسـتا وەڵامـی دایـەوەو کەسـێکی لێهـاتووی لـە (موسـڵ)ەوە بـۆ هـەنارد، هـەروەها بـۆ بـەڕێوەبردنی ناوچـەکەو چاودێریکردنی شێخ و شوێنکەوتەکانی، حکومـەت قایمقامێکی لـە بـارزان دامەزراند[3].

---

[1] الضحایا الثلاث، ص ص٣٨-٣٩.

[2] بروانە: کاوس قفطان: المصدر السابق، ص٢٦.

[3] وەدیع جوەیدە: جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد، ل٢٤٦.

پێدەچێت نزیکەی دوو ساڵێك پەیوەندییەکانی شێخ عەبدولسەلام لەگەڵ حکومەتو دراوسێکانیشیدا ئارامو دۆستانە بوو بێت، بەتایبەت ئۆپۆزسیۆن لە دژی ئیتحادییەکان لە پەرەگرتندا بوو، لە ئاکامیشدا لە سەرەتای ساڵی ١٩١٢ لە دەسەڵات کشانەوەو حیزبی حورییەتو ئیئتیلاف دەسەڵاتی گرتەدەست، کە پەیوەندی شێخی بارزان لەگەڵیاندا دۆستانە بوو(١).

ئەم هێمنیو ئارامییە تەنیا ماوەیەکی کەمی خایاند، چونکە پیاوانی ئیتحادو تەرەقی بە کودەتایەکی سەربازی کە تێیدا (نازم پاشا)ی وەزیری جەنگ کوژرا، سەرلەنوێ (بەسەرۆکایەتی مەحموود شەوکەت) دەسەڵاتی حکومەتیان گرتەوە دەست(٢)، وەکو زانراوە ئەمانە (واتا ئیتحادییەکان) بۆ جێبەجێکردنی ئامانجەکانیانو سەرکوتکردنی ئەوانەی دژی بیروباوەڕو سیاسەتی ڕژێمی نوێ بوون، لە بەکارهێنانی توندوتیژیدا دوودڵیان نەدەکرد، بۆ خۆی دامەزراندنی (سولەیمان نەزیف) وەك والییەك بۆ موسڵ، کە یەکێك بوو لە جەمسەرەکانی حیزبی ئیتحادو تەرەقیو لەکاتێکدا خۆی کورد بوو، کەچی یەکێك بوو لە توندڕەوترین ناسیۆنالیستەکانی تورك، بە ئاڕاستەی جێبەجێکردنی ئامانجانەکانی ئەم حیزبە بوو، لێرەوە پرسی سەرکوتکردنی شێخی بارزان کە لە رۆژگاری وەزارەتی ئیئتیلافیدا لێخۆشبوونی بۆ دەرچوبوو، بووە یەکێك لە ئەرکە بەراییەکانی والی نوێ(٣).

---

(١) پیێ رەش: المصدر السابق، ص١٢٦.

(٢) بۆ زیاتر بڕوانە: شکیب ارسلان: المصدر السابق، ص ص٣٨٦-٣٨٧.

(٣)عبدالمنعم الغلامي: المصدر السابق، ص ص٣٩-٤٠.

بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکەش، دەبوو زەمینەی ڕوبەڕووبوونەوە لەگەڵ شێخی بارزاندا درووست ببێت، یان درووست بکرێت، وەك لێکۆڵەرێك بڕوای وایە دەسەڵاتدارانی ئیتحادو تەرەقی بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان بە گوێرەی نەخشەیەکی بۆداڕێژراو بەهانەیان درووستدەکردو شێخیان دەورووژاند،[1].

بە گوێرەی سەرچاوە مێژووییەکان، پاش ئەوەی (سولەیمان نەزیف) دەبێتە والی موسڵ، چەند هۆکارێکی ناڕاستەوخۆ و ڕاستەوخۆ دوژمنایەتیی نێوان حکومەتو شێخ عەبدولسەلامیان بە ئاڕاستەی ڕوبەڕووبوونەوەی سەربازی پەرەپێدا، لە هۆکارە ناڕاستەوخۆکان:

هەوڵدانی حکومەت بوو بۆ ئەنجامدانی سەرژمێرییەکی گشتی دانیشتوانو مەڕومالاٚت لە ناوچەی بارزان، بەلاٚم شێخو گەلی بارزان بە توندی ئەم پرۆسەیەیان ڕەتکردەوە، چونکە پێیان وابوو سەرەتایەکە بۆ سەپاندنی باجی زیاترو ئەنجامدانی ڕاژەی سەربازی،[2].

هەروەها ئەو پەیوەندییە چاكو هاوڕێیانەیەی شێخ لەگەڵ (سەید تەهای نەهری)دا هەیبوو، ئەوەی چالاکییەکانی جێی سەرنجو نیگەرانی ئەستەنبوڵ بوو، بەتایبەت دوای ئەوەی لە لایەن ڕووسەکانەوە پارێزگاری لێکرا، گوایە لە لایەن دەوڵەتی نێوبراوەوە لە گوندی (ڕاژان)ی ناوچەی مەرگەوەڕ بارەگایان بۆ دەستنیشانکراوە، هەر بۆیە جێگای سەرسوڕمان نییە کە دەسەڵاتدارانی عوسمانی بە گومانەوە تەماشای دۆستایەتی نێوان

---

[1] زبير بلال اسماعيل: ثورات بارزان ١٩٠٧-١٩٣٥، اربيل، ١٩٩٨، ص٥٠.

[2] معروف چياووك: مأساة بارزان المظلومة، ط٢، اربيل، ٢٠٠١، ص ص٤٨-٤٩.

ئـەم دوو ڕابـەرەیان کردبێـت و دواتـریش لـە نزیکـەوە کەوتنـە چـاودێری چـالاکییەکانیان، لـە یـەکێك لـە نامەکانیـدا شـێخ عەبدولـسەلام گوتوویـەتی "تورکـەکان جێگـەی دڵنیـایی نین، ڕۆژێك دادێت، لەوانەیـە بـەم زووانە کوردەکان پێویستیان بە یارمەتی زلهێزێك بێ و پێویستە هانا بۆ لای ڕووسەکان ببەین" [1]. هەر لـەم چوارچێوەدا جێگری کۆنسوڵی بریتـانی لـە وان لـە نامەیەکیـدا بـۆ سـەفیری وڵاتەکـەی لـە ئەسـتەنبوڵ لـە ١٣ی ئـازاری (١٩١٤)دا نوسـیویێتی "دەنگـۆی ئـەوە هەیـە کـە (عەبـدولڕەزاق بـەدرخان) کـە ساڵی پـار دژ بـە تورکـەکان سـەرقاڵی بەرنامەداڕشـتن بـوو، داوێتییـە پـاڵ شـێخی بـارزان، پێدەچێت ئەمـە ئـەو هۆکـارە بێـت کـە حکومـەتی هانـداوە بڕیاربدات (شێخ) سەرکوت بکات ، بەتایبەت کە ئەم پەیوەندیو چالاکییانە تا سەر شاراوە نەبوون، بۆیە حکومەتی گەیاندە ئەو بڕوایەی کە لە ئاینـدەدا ناتوانێ خۆی لە مەترسی ئەم شێخانە بپارێزێت، کە دەسەڵاتێکی سیاسیو ئاینییو کردارەکیان لە ناوچەکەدا هەیە [2].

بەگوێرەی وتەی (کەمال مەزهەر) هۆکارێکی تـری ناڕاستەوخۆی ناکۆکی لەگەڵ شێخی بارزاندا، مەترسی ئیتحادییەکان بوو لـەوەی شێخ لـە توانایـدا هـەبوو ژمارەیـەکی زۆر لـە عەشـیرەتە ناسـراوەکانی کوردسـتانی باشـوورو ڕۆژهەڵاتیش لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە، لەئاکامیشدا پێدەچوو لـە هـەردوو ویلایەتی (موسڵو بەغداد) جڵەوی کاروبارەکان لە دەستدەربچن [3]. هەڵبەتە ئەم ترسە لە جێی خۆیدابوو، چونکە بـە گوتـەی جێگـری کۆنسوڵی بریتانیـا کـە لـە نامەیەکیـدا بـۆ بـاڵوێزی وڵاتەکـەی لـە ئەسـتەنبوڵ نوسـیوێتی لـەو

---

[1] بازیل نیکیتینو کوردناسی، ب١، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٨.

[2] عثمان علي: الكرد في الوثائق البريطانية، ص ص١٠٩-١١١

[3] بڕوانە: كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، ص١١٤.

ڕۆژگارەدا هیچ کەس و لایەنێك نەبوو بتوانێت تێکڕای عەشیرەتە کوردەکان لە ناوچەکە سازو ئامادەبکات و دژ بە حکومەت دەنگیان یەکبخات[1].

بەلاّم هۆکاری ڕاستەوخۆی دەستپێکردنی شەڕو پێکدادان لە نێوان حکومەت و شێخدا، پەنابردنی (سەفوەت بەگ) بۆ بارزان و دالّدەدانی لە لایەن شێخ عەبدولسەلامەوە، پاش ئەوەی بە کوشتنی (مەحموود شەوکەت پاشا)ی سەدری ئەعزەمی عوسمانی تۆمەتبارکرابوو، بەو هۆیەوە والی داوای لە شێخی بارزان کرد سەفوەت بەگ ڕادەستی حکومەت بکاتەوە، بەلاّم شێخ داواکارییەکەی ڕەتکردەوە، چونکە شێخ پێی وابوو دانەوەی کەسێکی دالّدەدراو، دژ بە ئەو بەهاو نەریتانەیە کە لە ناو خەلّکانی عەشایەردا پەیڕەودەکرێت[2]، بەگوێرەی (نیکیتین) سەفوەت بەگ لەدوا ساتەکانی مالّئاوایدا، ئەو کاتەی بارزان جێدێلّێت و دەڕوات بۆ (ورمێ) و لەوێشەوە بۆ ڕووسیا، وێڕای ئەوەی هانی شێخی داوە کە متمانە بە حکومەت نەکات، (دەزانم لە نووژەنەوە داوات لێدەکەن بچیتە موسلّ و ئەمجارە دەتخنکێنن)، ئەم پێشنیارەی بۆ کردووە "بفەرموون هەردووکمان با بچینە لای ڕووسەکان و کۆبوونەوە لەگەلّ (سەید تەها و عەبدولڕەزاق بەگ) بکەین، ئەگەر بگەینە ئەوەی نەوای حکومەتی ڕووسی وەربگرین، ئەوا چاکترە بۆ میللەتەکەمان، خۆ گەر نا، دەبێ بچینە لای ئینگلیزەکان یان ڕووەو هەر ناسیۆنێکی شارستانیخوازی دیکە بچین" [3]. پێشبینییەکانی سەفوەت بەگ ڕاستدەرچوون، (سولەیمان نەزیف) یان بانگهێشتیکرد بۆ موسلّ، بەلاّم

---

[1] عثمان علي: الكرد في الوثائق البريطانية، ص ص١١٢-١١٤.

[2] عبدالمنعم الغلامي: المصدر السابق، ص ص٤٣-٤٤.

[3] بازیل نیکیتین و کوردناسی، ب١، ل٥٨.

ڕەتیکــردەوە کــە بــڕوات، ئــەوەبوو والی شــێخی بــارزانی وەك یــاخیبوو ناساند[1].

دوای ناسـاندنی شـێخ وەك یاخیبوویـەك، ئیتحادییـەکان لـە سـەرەتاکانی ئازاری ١٩١٤ەوە به مەبەستی پەلامارو هێرشکردن بۆ سەر شێخی بارزان، وەك لـە چـەند بەڵگەنامەیەکدا ئاشـکرا دەبێـت، دەسـتیان دایـە خۆسـازدانو کۆکردنەوەی هێزەکانیان، لەو چوارچێوەشدا هـەناردنی دوو تـابوور سـەرباز لـە ویلایـەتی (وان)ەوە بـۆ موسـڵ بـە فـەرمانی (وەزارەتـی نـاوخۆ)، وێـڕای بـەتاڵی گەنجینـەی ویلایەتەکـەو نـەبوونی توانـای دارایـی پێویـست بـۆ گواسـتنەوەی سـەربازەکان[2]، هـەروەها کۆکردنـەوەی هێـزی عەشـیرەتەکانی کـورد، ئەوانـەی سـەر بـە حکومـەت بـوون، وەك (سورچـی، زێبـاری، گـۆران)، دواتــریش عەشــیرەتەکانی (پــشدەرو باڵــەك) لــە دەوروبــەری ڕەوانــدووز، (نــیرەوەو ڕێکــانو دۆســکی) لــە ناوچــەی ئامێــدی، دوای تــەواوبوونی ئامادەکارییەکانیش بڕیاردرا لـە (سـێ) قۆڵـەوە پـەلاماری بارزان بـدرێت، کـە شوێنی نیشتەجێبوونی شێخ بوو. قۆڵەکانیش بریتی بوون لە:

- قۆڵی ئامێدی –بارزان.
- قۆڵی ئاکرێ–چیای پێرس–بارزان.
- قۆڵی ڕەواندووز–مێرگەسوور–بارزان[3].

---

[1] وەدیع جوەیدە: جولانەوەی نەتەوەیی کورد، ل٢٤٩.

[2] لـەم ڕووەوە بـۆ زانیـاری زیـاتر بڕوانـە نـاوەڕۆکی بەڵگەنامـەکان لـە: خلیـل علـي مـراد، المصدر السابق، ص ص ١٢٩–١٣١.

[3] پێ ڕەش: المصدر السابق، ص١٢٨. بۆ زانیاری لەبارەی هێرشو پەلامارەکان لـەم قۆڵانەوە بڕوانە: کامران عبدالصمد الدوسکي: المصدر السابق، ص ص١٦٨–١٧٠.

دوای ماوەیەك شەڕو کوشتار کە ژمارەیەکی زۆر سەربازو لایەنگرانی شێخی تێدا کوژران، ئیدی شێخ و شوێنکەوتەکانی لەبەردەم ئەو هێزە گەورەیەدا خۆیان پێڕانەگیراو بە ناچاری بڕیاریدا بەرەو سنووری ئێران بکشێنەوە، لەم کشانەوەدایە خێزانەکان و هێزەکەی کە لە گەڵ شێخدا بوو[1]، بە گوندی (بیێ)و (زرارا)دا گوزەریان کرد، کۆچکردووان لە دۆخێکی زۆر ئاڵۆزدا بوون، کاروانەکەیان دوای تێپەڕبوون بە لای گوندی (بابکی)دا لە لایەن (١٠٠) لە چەکدارەکانی (ساڵح موورادخان برادۆستی)یەوە ڕووبەڕووی هێرشێکی شکستخواردو بوونەوە، لە کۆتاییشدا بە تێپەڕین بە گوندەکانی (لۆلان، بنزیرتە، سنگان)دا، چوونە شنۆ، لەوێشەوە بۆ مەرگەوەڕ، کە زێدی (سەید تەهای نەهری) بوو و تێیدا نیشتەجی بوون، هەرچی بنەماڵەی شێخ بوو، لە (ڕاژان) جێگیر بوون[2].

لەو ماوەیەدا شێخ عەبدولسەلام چاوی بە ئیسماعیل ئاغای شکاك کەوت، کە بە (سمکۆی شکاك)[3] ناسراوبوو و ئاگاداری کردۆتەوە لەوەی

---

[1] بە گوێرەی سەرچاوەیەك ژمارەی ئەو هێزە(٨٠) کەس بوون. بڕوانە: عثمان علي، الکرد في الوثائق البريطانية، ص١١٤.

[2] پیێ ڕەش، المصدر السابق، ص ص١٣٢-١٣٣.

[3] ئیسماعیل ئاغای شکاك (سمکۆ) (١٨٧٥-١٩٣٠): سەرۆکی عەشیرەتی شکاك بوو، کە دوای عەشیرەتی کەڵهوڕ، دووەم گەورەترین عەشیرەتی کوردن لەسەر سنووری نێوان ئێران- تورکیا، لە ناوچەکانی (سۆمای، برادۆست، جەهریق و قوتوور)، کارو چالاکی سمکۆ لەگەڵ هەڵبەزو دابەزەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی و دواتردا دەستیپێکرد، لەکاتی جیاوازی جەنگ و دوای جەنگیشدا هاوپەیمانێتی یان دوژمنایەتی و شەڕی لەگەڵ ڕووسەکان، عوسمانی، ئەرمەن و ئاسووری و ئێرانییەکاندا هەبووە، ساڵی ١٩٣٠ لە بۆسەیەکی لەناکاودا لە لایەن حکومەتی ئێرانەوە کوژرا. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەم کەسایەتییەو چالاکییە سیاسییەکانی و ڕۆڵی عەشایەر تێیدا بڕوانە: مارتین ڤان

ئارەزوودەکـات ڕووسـەکان ببینێـت، زۆری نـەبرد داوا لـە (شـێخ) کـرا بـۆ چـاوپێکەوتن و کۆبوونـەوە لەگـەڵ رووسـەکان سـەردانی شـاری ( تـەفلیس) بکـات، کـە ئـەوکات بنکـەی جێگـری (قیـصر)ی ڕووسـیا و فەرمانـدەی سوپاکانی باشوور بوو، پێدەچی شێخ لـە مـانگی ئـابی ١٩١٤ دا گەیشتبێتە ئەو شـارە، کـە مـاوەی چـل ڕۆژێـك تێیـدا ماوەتـەوەو چـاوی بـە بەرپرسـان کـەوتووە، بـەڵام بـێ ئـەوەی بزانـرێ ئاڕاسـتەی گفتوگۆکـان چـۆن بـووە[1]. بـــەگوێرەی (نیکیـــتین) ڕووســـەکان داوایـــان لەشـــێخ کـــردووە خـــۆی ئاشـکرانەکات، چـونکە دەسـەڵاتدارانی عوسمـانی داوایـان لـە قاجارەکـان کردووە هەڵاتووەکان ڕەوانە بکەنەوە، بۆیە لەبەر هـۆی سیاسی نایانـەوێ لـە ئێستادا دژایەتی عوسمانییەکان بکەن، ئەوەشیان داوەتە بەرگوێی شێخ کـە "دوو یـا سـێ مانگێك ئـارام بگـرە...ئـەوکات دەبیـنین یـا ئێمـە (ڕووسـەکان) پەیوەنـدیمان زۆر چـاك دەبـێ لەگـەڵ تورکـەکان و بـە ئاسـانی لێبوردنـت بـۆ وەردەگـرێن، یـا ئـەوەتا دەبینـە دوژمنیـان و هێزێکـی چەکدارت دەدەینـێ کـە بتوانی پێی بچیتەوە بارزان بەبێ ئەوەی خەمی تورکەکانت هەبێ"[2].

هەڵبەتـە (شـێخ) بـە قـسەی ڕووسـەکانی نـەکرد و خـۆی نەشـاردەوەو بـە هەموو لایەکدا دەچوو، دوای سەردانێك بۆ گوندی (چاری) لەسـەر سـنووری تورکیـا-ئێـران، کـە سمکـۆی شـکاکی تێـدا دەژیـا، لـە گەڕانـەوەدا، چـەند کوردێـك چـوونە سـەر ڕێگەکـەی و تکایـان لێکـرد سـەردانێکی گوندەکـەیان

برونسين: "ثورة سمكو و دور العشائر الكردية الايرانية"، القسم الاول،ت. سعيد يحى، گۆڤاری کاروان"القسم العربي"، ژ.٦٤ مایسی ١٩٨٨، ل١٤٣-١٤٨ . القسم الثاني، ت. فؤاد حمه خورشيد، ژ.٦٧ی ئابی ١٩٨٨، ل١٤١-١٤٩.

[1] پێ ڕەش: المصدر السابق، ص ص١٣٥-١٣٦ز

[2] بازیل نیکیتین و کوردناسی، ب١، ل٦٠.

بکات، شێخ داوای لێبوردنی کرد، بەڵام ئەوان زیاتر لێی چوونە پێش‌و پێیان ڕاگەیاند گەورەی گوندەکەیان کە (سۆفی عەبدوڵلا)یە سەردانەکەی بە شانازی بۆخۆی‌و عەشیرەتەکەی دەزانێت، لە کۆتایدا شێخ قایل بوو ببێت بە میوانی نێوبراو کە سەرۆکی لقی(بارۆهاڵو) بوو، کە یەکێك بوو لە لقەکانی عەشیرەتی شکاك، لەوێ بە ژمارەیەکی زۆری چەکدارەوە پێشوازی لێکرا، هەرچی (سۆفی)یە لە (شێخ ) هاتە پێش‌و وتی: ئەو قەرزاری دەوڵەتی عوسمانییە، بەو پێیەی تۆ لە یاسا دەرچوویت، پێویستە خۆبەدەستەوە بدەیت، ناڕازی بوونی شێخ سوودی نەبوو، بۆیە دوو لە پیاوەکانی بە ڕێژنەیەك چەند پیاوێکی (سۆفی)یان کوشت، بۆخۆشیان کوژران، لە کۆتاییدا شێخ‌و هاوڕێکانی برانە نزیکترین بنکەی میری، لەوێشەوە بۆ (وان)، دواتریش بۆ (دیاربەکر)، لە کۆتاییدا لە ڕێگەی هێزێکی پاسەوانی توندوتۆڵ ڕەوانەی موسڵ کرا [1].

والی موسڵ (سلێمان نەزیف) وەك بڵێی بەپەلە بێت بۆ دیتنی شێخ عەبدولسەلام بە دەستبەسەرکراوی، بەگالیسکەکەیەوە (عربة) خۆی گەیاندە ڕێگای (باب السنجار)و لە نزیك ئارامگەی شێخ (قضیب ألبان) لە کەناری ڕێگەکە گالیسکەکەی ڕاگرت‌و کەوتە چاوەڕوانی، پاش گەیشتنی شێخ کە

---

[1] عبدالمنعم الغلامي: المصدر السابق، ٤٥-٤٨.

نیکیتین بە کەمێك گۆڕانەوە چیرۆکی گرتنی شێخ دەگێڕێتەوە، بە گوێرەی باسەکەی ئەو، والی وان شکاکەکانی تێگەیاند، کە حکومەتی عوسمانی بەڵێنی ویسام‌و داهاتی تەمەنی داوە بە هەر کەسێك شێخ بکوژێ یا دەستگیری بکات، کاتێك بە ئارەزووی خۆی هاوەڵی پیاوەکانی کرد، ئەو کات سۆفی عەبدوڵلا بەخۆی‌و پێنج پیاوەوە بۆسەیان بۆ دانا، لەگەڵ گەیشتندا،بەڕێژنەیەك سێ لە پیاوەکانی کوشت، یەکێکیش بریندارو کەسی پێنجەم هەڵهات، ئیدی شێخ زیندانی کراو و گەیاندیانە وان‌و دواتر بۆ موسڵ. بڕوانە: بازیل نیکیتین‌و کوردناسی، ل ل٦٠-٦١.

سـواری هێـسترێکی ئابلۆقـەدراوبوو بـە سـەرباز، والی هەڵـساو لێـی چـووە پـێش‌و پێیگـوت. تـۆ عەبدولـسەلام بارزانیـت؟ وەڵامـی دایـەوە، بـەڵێ. والی پێیگوت، بۆ فەرمانەکانت شکاندو نەهاتی بۆ موسڵ، تا بەم شێوەیە هاتیت؟ شێخ وەڵامی دایەوە: هەڵەم کرد. لێرەدا سلێمان چووە سـەر گالیسکەکەی‌و گەڕایەوە بۆ سەرای میریی، سەربازەکان بەدوایدا شێخیان برد تا گەیشتنە ئۆردووی سەربازییەکە، لەوێ شێخ‌و هاوەڵانی زیندانی کران[1].

دوای ئەوەی ماوەیەك لەزیندانـدا ڕاگیران، شێخ عەبدولسەلام لەگەڵ سـێ کـەس لەدەسـت‌و پێوەنـدەکانی هەڵواسـران، گێڕانـەوەی وردی ڕووداوی هەڵواسینی شێخ‌و هاوڕێیانی لە لایەن (صديق الدملوجي)یـەوە کـە ئـەوکات بـە ڕێکـەوت لـەو زیندانـەدا بـووە، کـە شـێخ عەبدولسەلامیان تێـدا زینـدانی کردبوو، خراوەتەڕوو.

دەمـەلوجی دەڵێت: "ئـەم ئێوارەیـە شـێخ عەبدولسەلام بارزانیـان هێنـا بـۆ زیندانەکـە بـۆ لامـان...دوای تـەواوبوونی دادگایکردنەکـەی لـە ئەنجوومـەنی دیـوانی بـاری نائاسـایی سـەربازی هێنابوویـان، لـێم پرسـی: دۆسیەکەی تـۆ بەچی گەیشت؟ لە وەڵامدا گوتی: هەموو شتێك تەواوبوو، خوێنم دەڕێژن، لە ڕووخـساریدا ئـازار بەدیـدەکرا، پێمگـوت: گـوێی مـەدەرێ شـێخ، لـە بەرژەوەندی حکومەتدا نییە پیاوێکی مەزنی وەك تـۆ لـە سێدارەبدات، دوای هـەموو تەنگانەیـەك ئاسوودەییە. لەوەڵامـدا گـوتی: نـەخێر، هـیچ هیوایـەکم نییە بە ژیان، ئەم والییە سوورە لەسەر کوشتنم، پێمگوت: پرسـەکە بەتـەنها بەدەسـت والی نییـە، ئەگـەر ئەسـتەنبوڵ ڕەزامەنـد نـەبێت، لەوەڵامـدا گـوتی: هەموویان یەك بابەتن، بەڵام هەڵەن، کەمێك بیری کردەوەو گوتی: خوێنی من

[1] عبدالمنعم الغلامي: المصدر السابق، ص٤٩.

گـران دەکـەوێت لەسـەریان، بـەڵام مـن دوای خـۆم لـە منداڵـەکانو برایـەکانم دەترسـم، ئیـدی ئـەم وشـانەی دووبـارە دەکـردەوە، لـە شـەوی دووەمـدا لەکاتێکـدا تـازە لـە نوێـژی عیـشا ببووینـەوە، دەرگاکـانی زینـدان کرانـەوە، سەرودڵمان داگیرا، کردنەوەی دەرگاکانی زیندانی لە وەها کاتێکدا نیشانەی بێنەوایی و خراپەیە، ئەوانەی لەم ژوورەدا زیندانی بوون: عەبدولعەزیز بەگ قایمقامی ئاکریێ، حاجی پیر داوود ئاغا لە ئاغاکانی عەشیرەتی دزەیی بوو، حیکمەت ئەفەندی مەئمووری پۆستو برووسکە لە کەرکوك، عەبدولغەنی ئەفەندی مەئمووری تاپۆی سلێمانی بوو، سەرۆکی زیندانییەکان (قاسم حەسەن)و ئەفسەری ژەندرمە (تەحسین ئەفەندی) بانگی شێخیان کردو بردیان، جارێکی تر گەڕانەوە هەردو هاوەڵە خزمەتکارەکەی (مەحموود و موسا)و (محەمەد ئاغای هیشتی) کە یەکێك بوو لە سەرۆکەکانی ڕێکانیان برد، ئێمە تووشی شۆك بووین، وەك بڵێی مەلی مردن بەسەر سەرمانەوە دەفڕێت....هەر چوار کەسەکەیان بەرەو مەیدانی لە سێدارەدانەکە برد، کە کەوتبووە بەرامبەر سەرای حکومەت، لەوێ چوار سێدارەیان دامەزراندبوو، زانایەکی ئایینی کوردی خوالێخۆشبوو (ئەمین ئەفەندی قەرەداغیان) هێنابوو، بۆ ئەوەی ئەرکی خۆی لە خوێندنەوەی (تەلقینی شەهادەت) بۆ ئەو چوار کەسەی بۆ مردن هێنرابوون جێبەجێبکات، کەشێخیان بردە بەر سێدارە گوتی: دەمەوێت قسەیەك لەگەڵ والی بکەم، وتیان دەتەوێت چی بڵێیت؟ لە وەڵامدا گوتی: مردنو ژیان بۆ من وەك یەکە، بەڵام مردنم بەم شێوەیە لە بەرژەوەندی حکومەتدا نییە، ئەگەر ژیانم بپارێزرێت ئەوا هاوکارییەکی سوپا لە ئەستۆدەگرم، باری هەزار هێستر (لەو کاتەدا دەوڵەت خەریك بوو تێکەڵ بە جەنگ دەبوو)، لە بری والی شێخیان ئاگادارکردەوە: کە مردن چارەنووسێتی"[1].

---

[1] صديق الدملوجي، امارة بهدينان الكردية، ص ص٩٢-٩٣.

بەوجۆرە شێخ عەبدولسەلامو هاوەڵانی لە (١ی كانوونی یەكەمی ساڵی ١٩١٤) لە لایەن سلێمان نەزیفو ئەنجوومەنە سەربازییەكەیەوە لە سێدارەدران، بێ ئەوەی چاوەڕوانی فەرمانی پشتڕاستكردنەوەی بڕیارەكە بكات لە لایەن سوڵتانەوە. بۆ پاساودان بە كارەكەشی ئەوەی پیشانی بەرپرسانی سەرەوە دا، كە لە نێو شاردا ڕاپەڕینێك لە لایەن موریدانی شێخەوە بۆ ڕزگاركردنو دەرهێنانی لە زیندانی بەرپاكرا، بە جۆرێك شاری تووشی مەترسیی كرد[1]، هەڵبەتە ئەم كارەی والی بۆ پوچەڵكردنەوەی هەر هەوڵ كۆششێك بوو، كە پێدەچوو لە لایەن كارمەندانی بالاّی ئەستەنبووڵەوە بۆ ڕزگاركردنی شێخ عەبدولسەلام بدرێت .

---

[1] نفس المصدر، ص ص٩٣-٩٤.

## ئەنجـــام

پەیدابوونی هەردوو ئیمراتۆریای عوسمانیو سەفەوی لە ناوچەکەداو دواتر بەریەککەوتنی بەرژەوەندییەکانیانو بەرپابوونی شەڕی چاڵدێران لە نێوانیانداو کۆتایی هاتنی شەڕەکە لە بەرژەوندی عوسمانییەکانو بوونی زۆرینەی هەرە زۆری میرو سەرۆك عەشیرەتەکانی کورد لە میانی ڕێککەوتنێکەوە بە تەرەفگیریی عوسمانی، لە ئاکامدا دۆخێکی نوێی لە مێژووی کوردستاندا هێنایە ئارا، کە خۆی لە هەژموونی درێژخایەنی عوسمانیدا بۆ ناوچەکە بینییەوە، لە سەرەتادا بەهۆی ئاڵۆزی کوردستان لە ڕووی جوگرافییەوەو بۆ سوود وەرگرتن لە هێزی کوردان لە هەموو ڕوویەکەوە عوسمانییەکان لە سیستمی بەڕێوەبەرێتی خۆیاندا لە ناوچەکەدا شێوازی فەرمانڕەوایی ڕەهایان جێبەجێ نەکرد، بەڵکوو بە گوێرەی سەنگو قورسایی خۆیان دەسەڵاتیان دایە میرایەتیو سەرۆك عەشیرەتەکان. بەرامبەر بەوە عوسمانییەکان سوودیان لە توانا سەربازیو ئابوورییەکانی کورد وەردەگرت، ئەم دۆخە تا نزیك ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەم درێژەی کێشا، نزیك ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەهەم دەوڵەتی عوسمانی لە بەرامبەر باڵادەستی هێزی مۆدێرنیتی ئەوروپیدا، پێویستی بە ڕیفۆرمی زۆرو نوێکردنەوەی دەسەڵاتو دامو دەزگاکانی دەوڵەت هەبوو، ئەمەش ناوەندیکردنی ویلایەتەکانی عوسمانی دەخواست، کە لە ئاکامدا ئەم دۆخە نوێیە کوردستانی باشووری توند گرێدا بە دەسەڵاتی ناوەندەوە، لەئەنجامدا عوسمانییەکان تێکـڕای یاساو سیستمی بەڕێوبەرێتیو داراییو داوەرییەکانی خۆیان لە فۆرمێکی ناشیرینو پڕ گەندەڵیدا جێبەجێکرد، لە دوایشدا پشێویو نائارامیەی عەشیرەتەکان زۆر بە ئاشکرا لە ناوچەکەدا بەرچاو دەکەوتن، ئەمەش نیشانەی ڕەتکردنەوەی دەسەڵاتی ناوەندیو ئەو بۆشاییە سیاسییە بووە، کە کەوتبووە ناو هەناوی کۆمەڵگەی کوردییەوە.

کوردســـتان لـــە ڕۆژگـــاری دەوڵـــەتی عوسمانیـــدا بەگـــشتی فـــۆرم‌و چوارچێوەیەکی عەشیرەتیی هەبووە، هەندێك لەو عەشیرەتانە نیشتەجێ‌و هەندێکی تریان کۆچەری‌و ئەوانیدیکە نیمچە کۆچەری بوون، بەهۆی ئەو تایبەتمەندییەی کە لە بونیادی عەشیرەتیی کوردیدا هەبوو، ئەو زاراوانەی دابەشـبوونی عەشـیرەتیان نیـشاندەدا چـونیەك لـە ناوچـە جیاجیاکـانی کوردستاندا بەکار نەهاتوون‌و واتاکانیان بە گوێرەی شوێن کێشهاتووانە گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

لەگەڵ هاتنی مەدحەت پاشادا لە ساڵی ١٨٦٩ ئاڕاستەی سیاسەتێکی نوێ لەبەرامبەر عەشیرەتەکان لە ناوچەکەدا دەرکەوت، کە سەرەتاکانی بارگاویی بوون بەهێزو توندو تیژی‌و لە دوایشدا لە میانی (سیستمی تاپۆ)وە کار بۆ بەستنەوەی عەشیرەتەکان بە خاك‌و زەوی‌و زارەوە کرا، سیستمێك کە یەکێك لە ئاکامەکانی لە کوردستانی باشووردا دەرکەوتنی چینێکی فیودال‌و موڵکداری کشتوکاڵیی پان‌و بەرین بوو، بە دیوێکی دیکـــەدا سیاســـەتی پـــان ئیـــسلامیزمی ســـوڵتان عەبدولحەمیـــدی دووەم هەنگاوێکی نوێ بوو بە ئاڕاستەی ڕاکێشانی عەشیرەتەکانی ناوچەکە بەلای دەوڵەتداو بۆ ڕاژەکردنی حکومەت، ئەم ڕاکێشانە ئیدی هەندێ جار بە خوایـــشت‌و جـــاری واش هـــەبووە بـــەزۆر بـــووە، لـــەو چوارچێوەشـــدا خۆنزیکردنـــەوەی ســـوڵتان لـــە شـــێخانی تەریقـــەت‌و پێکهێنـــانی ســـوارەی نانیزامی لە عەشیرەتەکان‌و هەوڵدان بۆ بەزۆر سەپاندنی ئاینیی ئیسلام بەسەر ئێزیدییەکاندا، کارکردن بوو بەم ئاراستەیەدا.

خەمساردی دەوڵەت بەرامبەر ناکۆکی‌و نائارامیەی نێو عەشیرەتەکان‌و پشتگوێخستنیان بۆ ماوەیەکی درێژخایەن، هەندێ جار قووڵکردنەوەی ئەو

ناکۆکییانــه بــه تــەرەفگیرکردنی لایــەنێك لــه لایەنــه ناکۆکــەکان، هەڵبەتــه مەبەسـت لـەم باسـه دوورخستنەوەی عەشیرەتەکان بوو لـه هـەر هـەوڵێك کـه یەکێتی و یـەکڕیزی لـه نێـو عەشیرەتەکاندا درووسـتبکات و لەوێـشەوە ببێتـه سەرچاوەی هەڕەشەو مەترسی بۆ سەر دەوڵەت.

تورکــانی لاو لــه دوای کودەتــای ســاڵی ۱۹۰۸ ەوە بــه ئاشــکرا بــەرەو ناسیۆنالیزمی تـورکی، یـا هـەتا بـەرەو تـۆرانیزم هەڵخلیـسکان، زۆری نـەبرد کاری سـەربازیو توندوتیـژیان بـه تایبـەت دژ بـەو عەشیرەتانه دەسـتپێکرد، که به شێوەیەك له شێوەکان پەیوەندییان له گەڵ سوڵتان عەبدولحەمیدی لـه کارخراودا باشـبوو، لەوانـه سـەرانی بەرزنجـەو بارزانییـەکان، لـه ئاکامیـشدا سیاسەتی پڕ توندو تیـژییان زۆرێـك لـه عەشیرەتەکانی کوردی لـه ناوچەکە ناچارکرد بیر لەوە بکەنەوە کە بچنە ژێر سایەی فەرمانڕەوایی (ڕووسیا)وە.

## لیستی سەرچاوەکان:

### یەکەم: بەڵگەنامە بڵاوبووەکان

#### -بەزمانی کوردی

-محەمەد حەمەباقی: شۆڕشی شێخ عوبێدوڵلای نەهری ١٨٨٠ لە بەڵگەنامەکانی قاجاری دا، موکریانی، چ١، هەولیر، ٢٠٠٠.

-محەمەد حەمە باقی: ڕاپەڕینی هەمزئاغای مەنگوڕ لەبەڵگەنامەکانی قاجاریدا ١٨٥٤-١٨٨١، چ١، هەولیر، ٢٠٠٢.

-محەمەد حەمە باقی: ئەردەڵان- بابان - سۆران لەبەڵگەنامەی قاجاری دا ١٧٩٩-١٨٤٧، چ١، هەولێر، ٢٠٠٢.

-مستەفا نەریمان (وەرگێڕان): چەند بەڵگەیەکی مێژوویی، گۆڤاری رامان، ژ.(٦٧)ی (٥)ی کانونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٢.

-نەجاتی عەبدوڵلا: شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری لەبەڵگەنامەکانی فەرەنسیدا ١٨٧٩-١٨٨٢، مەکتەبی بیرو هوشیاری، سلیمانی، ٢٠٠٤.

#### -بەزمانی عەرەبی

- خليل علي مراد: مختارات من كتاب الموصل كركوك في الوثائق العثمانية، بنكەی ژین، السليمانية، ٢٠٠٥.

- عثمان علي (ترجمة): الكرد في الوثائق البريطانية، مؤسسة موكرياني للبحوث و النشر، ط١، اربيل، ١٠٠٨.

–به زمانی توركی لاتینی

-T.C, Arşivler Genel Mudurluğu, Osmanli Arşive Dairesi, Musol-Kerkukile ilgili Arşiv Belgelri 1525-1919(Ankara-1993).

–دووەم :ڕاپۆرت وچاپكراوە فەرمییەكان

–بەزمانی كوردی

–كۆمەڵێك لە پسپۆڕان و ئەفسەرانی سیاسی ئینگلیز (فەلەستین ١٩٢٣): كوردو كوردستان، و. عوسمان نێرگسەجاڕی و حسین ئەحمەد جاف، چ١، هەولێر، ٢٠٠٢.

–نوسینگەی مەندوبی مەدەنی بریتانی-MEX.EX.FORCE (١٩١٩): پوختەی كاروباری كاتی جەنگی جیهانی لە كوردستانی جنووبی، و. مەهاباد سالح ئەحمەد، گۆڤاری ژین بۆ بوژاندنەوەی كەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانی كوردی، ژ١، پوشپەڕی ٢٠٠٩.

–بەزمانی توركی

–ساڵنامەو ولایت موصل (١٣١٠ ﻫ)، مكتوبی ولایت سعادتلو حسن توفیق افندی معرفتیله ترتیب اولنمشدر.

– ساڵنامەو ولایت موصل (١٣١٢ ﻫ)، موصل ولایتی مطبعة سندە باصلمشدر.

–موصل ولایتی سالنامەو رسمیسیدر(١٣٣٠ﻫ)، عزتلو صفوت بك معرفتیله ترتیب و دردنجی دفعه اوله رق موصل مطبعة سندە اولنمشدر.

-بەزمانی عەرەبی

-درويش باشا: تقرير درويش باشا لتحديد الحدود الايرانية-العثمانية سنة ١٨٥٣، مطبعة الحكومة، بغداد ١٩٥٣.

-عبدالرزاق محمود القيسي (مراجعة وتحقيق): ولاية الموصل تقرير لجنة عصبة الامم الخاصة بحل النزاع التركي البريطاني حول ولاية الموصل (١٩٢٤-١٩٢٥)، مركز كوردۆلۆجی، السليمانية، ٢٠٠٩.

-تقرير دائرة الحاكم المدني البريطاني في العراق (سنة ١٩١٩) : ملاحظات عن عشائر كردستان الجنوبية "بين الزاب الكبير وديالى" ، ت. فؤاد حمة خورشيد، ط١، بغداد، ١٩٧٩.

سێیەم: یاداشت

-بەزمانی کوردی

-بیرەوەریەکانی ئەحمەدی حەمائاغای پشدەری: ئا. عبدالرقيب يوسف و سدیق سالح، چاپخانەی ئازاد، سلێمانی، ٢٠٠١.

-رەفیق حیلمی: یاداشت، چاپی سێیەم، دەزگای چاپ‌و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٣.

-شەریف پاشای خەندان: بیرەوەرییەکانی بەرهەڵستێك-بەربەرەکانی کۆمەڵەی ئیتحادو تەرەقی، و. زریان رۆژهەلاتی، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٦.

-عەبدولعەزیز یامولکی: سەرجەمی بەرهەمی، ب١، ئامادەکردنی: صدیق ساڵح، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥.

-به زمانی عەرەبی

-السلطان عبدالحميد: مذكرات السلطان عبدالحميد، ت. محمد حرب، ط٣، دار القلم، دمشق، ١٩٩١.

- السلطان عبدالحميد الثاني: مذكراتي السياسية (١٨٩١-١٩٠٩)، ت. مؤسسة الرسالة، ط٢، بيروت، ١٩٧٩.

-مذكرات دبليو.ار.هي حاكم اربيل السياسي في كردستان ايام الاحتلال البريطاني ١٩١٨-١٩٢٠، ت. فؤاد جميل، ط١، بيروت، ٢٠٠٨.

-مذكرات مامون بك بن بيكة بك: ت. محمد جميل الروژبياني و شكور مصطفى، مطبعة المجمع العلمي العراقي، بغداد، ١٩٨٠.

-به زمانی فارسی

-خاطرات على اكبر خان سنجابى: ایل سنجابى و مجاهدت ملى ايران، تحرير و تحشيه: كريم سنجابى.چ اول، تهران ١٣٨٠، ص١٩.

چوارەم: کتێبی چاپکراو

-به زمانی کوردی

- ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی: شاری سلێمانی ١٩١٨-١٩٣٢ لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی-سیاسی، سلێمانی، ٢٠٠٢.

- ئەحمەد تاقانە (وەرگێڕان): کوردو کوردستان لەیەکەم ئەنسکلۆپیدیای تورکی لەمێژوودا، قاموسولئەعلامی شەمسەدین سامی، چ١، هەولێر، ٢٠٠٨.

- ئەنستانس ماری کەرمەلی: کتێبی ئێزیدییەکان (جیلوە و مەسحەفا ڕەش)و بیبلیۆگرافیای ئێزیدیاتی، و.نەجاتی عەبدوللا، چاپخانەی شڤان، سلێمانی ٢٠٠٦.
- ئێریک جەی. زورجەر: مێژووی هاوچەرخی تورکیا، و. یاسین سەردەشتی، چاپخانەی سیڤار، سلیمانی، ٢٠٠٩.
- . م. مینتیشاشڤیلی: کورد کورتەی پەیوەندی کۆمەڵایەتی ئابوری ڕۆشنبیری و گوزەران، و.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، چ٢، هەولیر، ٢٠٠٨.
- مالمیسانژ: جڤاتا هێڤی تەلەبەی کوردان١٩١٢-١٩٢٢، یەکەم ڕێکخراوی یاسایی تەلەبەی کورد، و. زریان ڕۆژهەلاتی، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٨.
- باڕۆن ئیدوارد نۆڵدە: گەشتێك بە عەرەبستان و کوردستان و ئەرمەنستاندا، بەشی دووەم، کوردستان و ئەرمەنستان، و.حەمید عەزیز، چ١، هەولێر، ٢٠٠٤.
- بازیل نیکیتین و کوردناسی،ب١، و. نەجاتی عەبدوڵلا، بنکەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٤.
- پ. ی. ئەڤیر یانوف: کورد لە جەنگی روسیا لەگەڵ ئیران و تورکیادا، و. ئەفراسیاو هەورامی، مەکتەبی بیرو هۆشیاری، سلیمانی، ٢٠٠٤.
- پۆژۆلا: گەشتنامەی پۆژۆلا بۆ کوردستان ساڵی ١٨٣٧، و. نەجاتی عەبدوڵلا، هەولێر، ٢٠٠٩.
- پشکۆ حەمە تاهیر ئاغجەلەری، شاری کەرکوك، ١٩١٧-١٩٢٦، مەکتەبی بیرو هۆشیاری، چ١،سلێمانی، ٢٠٠٧.
- جەلیلی جەلیل: ڕاپەڕینی کوردەکان لە ساڵی ١٨٨٠، و. کاوس قەفتان، بەغداد، ١٩٨٧.

